# روخانی بەهاکان

هەرەسهێنانی خوێناویترین رژێمی ئەم ناوچەیەو ئەمڕۆی دنیا لە *9ی* نیسانی *2003* لە عێراقدا، بە تەنیا هەرەسهێنانی سستمێکی سیاسی و دەسەڵاتێکی تۆتالیتاری ئاسایی نەبوو، وەك ئەوانەی گەلێك جار لە هێز و دەسەلاتی تردا دیومانە یان خوێندومانەتەوە، بەڵکو رمانی کۆمەڵێك بەهای کەلتوری، فیکری، عەقڵی، ئەخلاقی و ئەدەبی بوو. کە پێکهاتەیەکی ئاڵۆز و بەرفراوانی وەك رژێمی بەعس بە قووڵی کاری لەسەر کردوون و کاریگەری لەسەر داناون و بوونەتە بەشێکی گرنگی پێناسە و ئامانج و روانینەکانی. ئەم کارلێکردنە لە پرۆسەی بە بەعسی کردنەوە سەرچاوەی گرتووە کە پرۆژەیەکی ستراتیژی بووە لە بەرنامەڕێژی ئەو دەسەڵاتەدا، ئەمەیش تەنیا لە ڕێگای تەنگ پێهەڵچنین و تۆقاندن و ئازار و کوشتنەوە نەهاتۆتە دی – وەك هەندێك تەنیا ئەم هۆکارە دەکەنە چەقی لێکدانەوەکانیان – بەڵکو لە ڕێگای ئەو بەرنامە کۆك داڕێژراوەوە یە کە بەهەر ڕێگایەك بێت وەك ڤایرۆس دزەی کردۆتە ناو جەستەی کۆمەڵگاوەو، ئەو درزانەی دۆزیوەتەوە کە توانای خۆمتکردن و تەشەنەی تیاهەبوە. واتا بەعس لە خوێندنەوەی خۆیدا بەرجەستەی ئەو ئامانج و مەبەستە تایبەتی و گشتیانەی کردوە کە لەسەر ئاستی تاك و کۆمەڵ خۆیان نمایش کردووە، ئەمەیش بە دابینکردنی مەبەست و ئامانجەکانی هەموو دەزگا و گروپ و چین و توێژە جیاوازەکانی کۆمەڵگای عێراقی و تا ڕادەیەکی زۆر بۆ نەتەوەی عەرەبیش کە لە دروشم و دەستپێشخەریە نەتەوەییەکاندا بەرچاوی خستوون. بەدەستهێنانی ئەو ئاواتانەو پەیڕەوی کردن لە تایبەتمەندیەکان بەرانبەر بە پەردەپۆشیەکی سامناك بوە کە لە سایەیدا گشت کارە دزێو و نائینسانیەکانی دەسەڵاتی تیا پیادەکراوە. تا چ دەنگ و بەرگریەکی ناوخۆ لێی نەپێچێتەوەو کڕبێت و بەمەیش ئاوی تەمەنی درێژی خۆی بدات. گوتاری بەعس هەر ئەوەنەبوە لەسەر ئاستی ڕواڵەت کردەبێت، بەڵکو گوتارێکی ئایدۆلۆژی و سایکۆلۆژی بزێو بوو کە دەیتوانی مەکینەی ئەو دەسەڵاتە پێشڕەوی بکات و، ختووکەی هەستی ماناکانی مانەوەو ئایندەی خۆی و نەتەوەکەی بدات، بوارەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی و کەلتووری کۆمەڵگا کۆنترۆڵ بکات، بۆ گەیشتن بەو مەبەستە ئەوپەڕی توانای مادی و مەعنەوی خۆی بەکاربهێنێت. بەتایبەتی لە ژێر دروشمێکی هەرە بریسکەدار و کاریگەردا کە دروشمی ناسیونالستیەکی پڕ لە شکۆمەندی و مێژووی ئیمپراتۆریەتی عەرەبی و ئیسلامە. ئەمە

خستنەڕووی ئایدیۆلۆژیایەکی هەمەگیرە کە دەتوانێت لە هەر سوچ و قوژبنێکی نیشتمانی عەرەبدا ڕەگ دابکوتێت و بەرگری لێ بکرێت، بە تایبەت لە لایەنی ئەوانەوە کە چاوی بە پراکتیزەکردنی راستەقینەی ئەو دروشمەیان کەم بینە یان هەر نابینایە.

ئەوەی جێی پرسیار و سەرسووڕمانە ئەوەیە کە ئەم تۆڕی بەبەعسیکردنە، یان ڕاهێنان و ماڵی کردنە، چۆن توانی لە ناو هوشیارترین و یاخیترین توێژی ئەم کۆمەڵگایەدا، کە لە هەموو سەردەمەکانی پڕ لە کێشەی مێژووی مرۆڤایەتیدا بە بەرگریکەر و ڕەخنەگر و چاوی کراوەی میللەت ناوزەدکراوە، هێلانەی زاوزێ کردنی خۆی بخات و تەشەنە بکات؟ چۆن بەشێکی زۆری ئەو توێژەی سەرشۆڕی بەلێ بۆکردن کرد و پاساوی ڕشتنی خوێنی قوربانیەکانی لە ئەستۆ نان؟ چۆن چامەی شیعری و چیرۆك و ڕۆمان و شانۆی ئەو نووسەرانە کرانە گۆرانی و ئافەرینی دەستی بە خوێن رەنگینی جەلاد و ئافەرۆزکردنی قوربانیەکان؟ ئەمە بە تایبەتی لەناوخۆی ولاتدا کە بەبەرچاوی خودی ئەو نووسەرانەوە تاوانە گەورەکان سازدەکران و، بەردەوامیش لە میدیاکانی دنیاوە دەخرانە ڕوو، ڕێکخراوە ئینسانیەکان، بە تایبەتی ڕێکخراوی مافی مرۆڤی جیهانی هەمیشە لە ئاشکراکردنی پێ شێلی یاساکانی مافی مرۆڤ و زۆری و نا تەندروستی بەندیخانەو گۆڕە کۆمەڵ کوژیەکانی عێراقدا بوە. ئیتر چۆن لەشکرێك لە زانا و روناکبیر و شاعیر و نووسەر و هونەرمەند و ئەکادیمی خۆیان لە ناو کەشتیەك نا کە دەبوو پێش هەرکەسێك ئەوان مزگێنی شکست و نوغرۆ بوونەکەی بە گوێی خەڵکیدا بدەن؟ راستە بەعس وادەی چاوخەڵەتێن و ڕاکێشەری هەبوو، بەلام خۆ شاعیر و ئەدیب خوێنەری چاکی بن دێڕی سیاسەت و ئایدۆلۆژیاکانن. ئەم لەشکرە ڕێ لێ هەڵەبووە، لە باتی ئەوەی –شایەتی سەردەم– بێت بەداخەوە بوو بە –شایەری سەردەم– تاوانبارترین کەسیش ئەوەیە کە هەقیقەتی تاوانەکە دەزانێت و دەیکات، یان تاوانەکە بە بەرچاویەوە دەکرێت و ئەو دایدەپۆشێت و پاساوی بۆ ساز دەکات. ئەمە لە کاتێکدا کە ڕاستگۆترین مێژووی ئینسانی ئەوەیە کە شاعیر و ئەدیب لە ڕێی بەرهەمی داهێنراوی خۆیانەوە دەینووسن، چونکە ئەوە مێژووی مرۆڤە ستەم دیدەو پەراوێزکراوەکانە کە توانایان لە رۆحی پڕ لە ئیرادەیانەوە وەرگرتوەو فەرمانی تری دوور لەوەیان بەجی نەهێناوە. ئەو مێگەلەی کە ناوی نووسەر و هونەرمەندیان لە خۆ نابوو نەیانتوانی لە کاتی خۆیدا ئەمانەتی ئەخلاقی و بەهای هونەرەکەیان بگەیەننە بەندەری ئاسودەیی کە بەرگریکردنە لە خەون و خۆشگوزەرانیەکانی خەڵکی و پاراستنی ئازادیان، بەڵکو بەداخەوە پەڵەیەکی ڕەشیان لەسەر کەلتوری سەردەمانێکی ولاتەکەیان دانا و، ئاقاری ڕێڕەوەکەیان لەکەدار کرد. بۆیە دوای کەوتنی بتەکەی گۆڕەپانی فیردەوس ئەوانیش لە ناوەوەی خۆیاندا رووخان، چونکە هەموو بەها جوانەکانی خۆیان لەو بتەدا کۆکردبوەوە نەك لە خۆیاندا یان دەشێت خۆیان هەر لەناو ئەو پەیکەرەدا حەشاردابێت. ئەگەرچی ئەوانە لەو ڕۆژەوەی شوناسی بەعسیانەیان لە گیرفان نا، یان داکۆکیان لێ

کردن و قەڵەم و دەنگیان پێ فرۆشتن بەهای ئەدەب و هونەرەکەیان و جوانیەکانیان دۆڕاندوە. بەڵام کەوتنی ڕژێمەکە و دەرکەوتنی تاوانە گەورەکانی وەك گۆڕی بەکۆمەڵ و تونـاوتوونی زینـدانەکان و حیکایەتی شایەتحاڵەکان ئەوەندەی دی ئەوانی لای خۆیان و لەبەرچاوی جەماوەر ڕسواکرد. بەتایبەتی ئەو شاعیر و نووسەرە عەرەبە عێراقیانەی پلە و پایەیەکی ئەدەبیان لەسەر ئاستی داهێنان هەبوو، کە دەبوو ئێستا لەباتی ئەوەی رووی هاتنە دەرەوەیان نەبێت بەسەر شانی خەڵکەوەبن و شەرمی وشە رووزەردەکانیان سەریان نەوی نەکات. لەگەڵ ئەمانەدا گەلێك لە روناکبیر و شاعیر و نووسەر و ڕۆژنامە نووسی تری عەرەب تا سنووری هەندێك لە بیرمەندەکانیان کە چاوی بەرژەوەندی تایبەتی و گیانی دەمارگیرانەی نەتەوەییان هێندکوێر ببوو هەواڵێکی دڵتەزێنی ئەم گەلەیان گوێ لێنەدەگرت و رەفتاری فاشیانەی کەسێك و دەوڵەتێکیان لێ بزر بوو، دیارە بواری رووناکبیری کوردی تاڕادەیەکی باش لەو لەشکرە خاوێنە، چونکە هیچ قەڵەمێکی دیار و ڕەسەنی داهێنەر خۆی لەناو ئەو کەشتیە وێڵە نەناوەو تا توانیبێتی بەرگریکەر و ئازارکێش بوە، ئەوەی بۆیکردوون بێجگە لە قەڵەمی لەرزۆك و نوزەی مردوو چیتر نەبوون.

ئێمە هەر لەسەرەتای دەرکردنی گۆڤاری سەردەمەوە هەوڵی ئەوەمان بوە پەردە لەسەر دەموچاوی ڕەشی رژێمە توتالیتارەکان لابدەین و ئەو بیرە ناجۆرە پووچ بکەینەوە کە لەو ئاو وهەوایەدا پێ دەگەن و هەڵدەچن، هەروەها جەختمان لەسەر بونیادنانی کۆمەڵگای مەدەنی کردوە کە ململانێیەکی یەکلاکەرەوەی فیکریە لەگەڵ ئەو سستم و ئایدۆلۆژیە داخراوانەدا. زۆربەی فایلەکانی گۆڤاری سەردەم لەو ئاقارەدابوون و لەم ژمارەیەشدا فایلی ڕاپەڕینی خوێندکارانی پاریسیساڵی *1968* یەکێکە لەو کارانە، چونکە جەوهەری ڕاپەڕینەکە دەنگێکی ناوازەی ئەو سەردەمە بوو لە دژی داخران و بۆ پەرەپێدانی گیانی دیموکراتی و ئازادی ڕادەربڕین و بە مەدەنیتر کردنی کۆمەڵگا.

سەرنووسەر

حوزەیرانی *2003*

# سەرەتایەك دەربارەی ژیان و فیکری "تۆماس پین"

سەربەست نەبی
لە عەرەبییەوە: شوان ئەحمەد

**بەرایی:**

دەکرێت هەریەك لە "جۆن لوك" لە ئنگلستان و "جان جاك ڕۆسۆ" لە فەرەنسا و "تۆماس پین" لە ئەمریکا لە ڕوی گرنگی و بایەخیانەوە بۆ مێژووی نوێی میللەتەکانیان، بەیەك چاو سەیر بکەین و لەیەك ڕیزدا دایان بنێین.. بەلاّم لە کاتێکدا کە هەریەك لە "لۆك" و "ڕۆسۆ" بە زیادەوە مافی خۆیان لە شکۆمەندی و پیاهەڵدان و نەمری پێدرا، کەچی "تۆماس پین" تا ئەم دوایانەش کەس باسی نەدەکرد و پەراوێز خرابوو.. ئەو قسانەشی "تیوردۆر ڕۆزفلت"ی سەرۆکی ولاّتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا کردنی، وایکرد زۆرێك لە نەوەکانی داهاتووی ئەمەریکا بێئاگابن لەو ڕۆڵەی "تۆماس پین" لە شۆڕش و سەربەخۆیی ولاّتەکەیاندا گێڕاویەتی. "ڕۆزفلت" لەو قسانەیدا "تۆماس پین"ی بە کەسێکی (هیچ و پووچ و گلاّو و بێباوەڕ) وەسفکرد. لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا ئەقڵێکی مەزنی وەکی "تۆماس ئەدیسۆن" کۆی لەوە نەکرد کە دان بە ڕۆڵی گەورە و گرنگی "تۆماس پین" دابنێت لە مێژووی ئەمریکادا و باس لەوە بکات کە ئەمریکا بە درێژایی مێژووی خۆی کەسێکی زیرەك و بیر فراوانی وەك "پین"ی بەخۆیەوە نەبینیووە.

گرنگی ئەم پیاوە هەر بە تەنها لە بیر و بۆچوونەکانیدا نییە، بەڵکو لە ڕەوتی ژیانی عەمەلیشیدایە، بەو پێیەی یەکێك بووە لەوانەی زۆر سەرسەختانە داکۆکی توندی لە بیرۆکەی ئازادی کردووە و لەو پێناوەشدا هەوڵێکی زۆری بەخەرجداوە. تەنانەت هەندێك جار لەو پێناوەدا کار گەشتۆتە ئەوەی سەرکێشی بە ژیانی خۆیەوە بکات. ئەم پیاوە بڕوایەکی قوڵی بە بەهای ئازادی و

پێویستی بەرجەستەکردنی ئەم بەهایە لە ژیانی ڕۆژانەدا هەبووە.

دەکرێت بڵێین ئەو تەمەنی خۆی لە پێناو دەستەبەرکردنی ئازادی و دادپەروەری لەسەرتاسەری دنیادا سەرفکرد. هەر بۆیە تەواوی جیهانی بە نیشتمانی خۆی دەزانی و ئامانجی سەرەکیشی بریتی بوو لە بەدیهێنانی ئازادی. "تۆماس پین" وەکی "ج. هامبدین جاکسۆن" لە ڕاپۆرتێکیدا باسی لێدەکات (نە بەریتانییە و نە فەرەنسییە و نە ئەمریکی، بەڵکو لە یەك کاتدا ئەو سەر بە هەرسێ ئەو دەوڵەتە و هەموو وڵاتێکی ترە کە دیموکراسیەتی تێدا بەرقەرار بێت)(1).

به کورتیەکەی ئەو پیاوی ڕۆژگاری خۆی بوو، هەروەها ڕۆژگاری ئەمڕۆشمان قەرزارباری زۆری بیر و بۆچونەکانی ئەوە.

## ژیانی:

"تۆماس پین" ساڵی *1737* لە گوندی تیفۆرد لەدایکبووە.. ساڵی *1756* ماڵی باوکی جێدێڵێت و ڕوو دەکاتە شاری لەندەن و لەوێدا چەندین کار دەکات. پاش ماوەیەك لەگەڵ ژمارەیەك لە کەسانی لیبراڵدا پەیوەندی دەگرێت و ڕێکخراوێك دروستدەکەن. ئەندامانی ئەم ڕێکخراوە بە مشتومڕکردن لەسەر ئەو مەسەلانەی پەیوەندییان بە هەلومەرجی ئابووری و سیاسی ئنگلستانەوە هەبوو خەریك بوون. لە لایەکی ترەوە ئەندامانی ئەم ڕێکخراوە لایەنگری یەکێك لە سیاسەتمەدارە ئازا و بوێرەکانی ئەوسای ئنگلستان بوون، بە ناوی "جۆن ویلکس"ەوە. ئەم پیاوە وتارگەلێکی ڕەخنەیی توند و تەنزئامێزی لە ڕۆژنامەی (*The North Briton*) لە دژی دەسەڵاتی پاشایەتی "جۆرجی سێیەم" و حکومەتە یەك لە دوایەکەکانی نوسی. "پین" لە نزیکەوە و بە گرنگیەوە ئاگای لەو وتارانە بوو، کاریگەری زۆریشیان لەسەری بەجێهێشت.

"تۆماس پین" سەرەتای کارو چالاکی سیاسی و فیکری خۆی لە لەندەن بە داکۆکیکردن لە مافی هاوپیشەکانی خۆی دەست پێکرد و هەر لەم شارەشدا دەرفەتی ئەوەی بۆ ڕەخسا تا بە دیداری زانا و سیاسەتمەدارێکی بەناوبانگ شاد بێت کە کاریگەری گەورەو چارەنوسسازی لەسەر ژیانی داهاتووی دەبێت، ئەو کەسەش "بنیامین فرانکلین" بوو.. "پین" شوێن نێوبانگی زۆری "فرانکلین" کەوتبوو، پێش ئەو یەکتربینینەش هەندێك لە بەرهەم و نوسراوەکانی خوێندبووەوە.. لەو دانیشتنە دوو قۆڵیەیاندا هەریەکەیان سەرسامی خۆیان لە یەکتر نەشاردەوەو "فرانکلین" مەزەندەی ئەوەی کرد کە "پین" یەکێك دەبێت لە پیاوە دیارەکانی داهاتوو، هەر لەو دیدارەیاندا "فرانکلین" پێشنیاری ئەوەی کرد بۆ "پین" ڕو بکاتە پنسلڤانیا و بە ئاشکراش پێی ڕاگەیاند ئەو نائومێدە لەوەی بتوانێت ئامانجی سەرەکی بەدیبهێنێت کە هێشتنەوەی پەیوەندی نێوان ئنگلستان و وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکایە، ئەمەش بۆ "تۆماس پین" مایەی خۆشحاڵیەکی لە ڕادەبەدەربوو، چونکە پێی وابوو ئەمە مانای دەسپێکی (ژیانێکی نوێیە لە جیهانێکی تازەدا).

## هەستی هاوبەش *Common Sense*:

بە گەیشتنی بۆ ئەمریکا ماوەی ساڵ و نیوێك "تۆماس پین" سەرقاڵی دەرکردنی گۆڤاری (پنسلڤانیا) بوو، لەگەڵ ئەوەی بابەتی بۆ ژمارەیەك گۆڤار و ڕۆژنامەی دیکە دەنوسی. مەیلی ئەو بەلای

مەسەلەگەلێکی وەك سوسیالیزم و ئازادیخوازیدا بە ئاشکرا بە نوسینەکانی ئەم قۆناغەیەوە دیارە. لەم سەروبەندەدا وتارێك لەژێر سەردێری (کۆیلایەتی ئەفریقایی لە ئەمریکادا) دەنوسێت و لە مارسی *1775*دا بلاوی دەکاتەوە. ئەو وتارە ڕاست و ڕەوان داوای لابردنی سستەمی کۆیلایەتی دەکات و دەرەنجامی ڕاستەوخۆ و دەستبەجێشی هەبوو، ئەوە بوو لە *14*ی نیسانی ئەو ساڵە دا (*1775*) یەکەمین کۆمەڵە بۆ بەگژاچونەوەی کۆیلایەتی لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا دامەزرا. پێنج ساڵ دوای ئەوەش واتە لە مارتی *1780*دا، یەکەمین یاسای ئازادکردنی کۆیلە دەرچوو کە کۆمەڵەی یاسادانان لە پنسلڤانیا بڕیاری لەسەر دابوو. شایەنی باسە "تۆماس پین" خۆی سکرتێری ئەم کۆمەڵەیە بوو، هەر خۆشی ڕەشنوسی ئەو یاسایەی داڕشتبوو.

لە بواری سیاسەتناسیدا "تۆماس پین" کتێبێکی گرنگی بە ناوی (هەستی هاوبەش *Common Sense*) بلاو کردەوە، ئەمە یەکەمین کتێبی و گرنگترین کتێبیشی بوو کە تیایدا داکۆکی لە شۆڕشی ئەمریکی دەکات. کاری ئەو لە ئەمریکادا ڕەواجدان بوو بەو تێزەیەی کە کاری پێویست هەوڵدانە بۆ جیابوونەوە لە بەریتانیا و لەم پێناوەشدا کەوتە هاندان و مۆبێلیزەکردنی جەماوەر بۆ بەدیهێنانی خواستێکی لەوجۆرە.

هەر بۆ ئەم مەبەستە ساڵی *1775* کتێبی *Common Sens* ئامادەکرد و چەند مانگێك بەر لە ڕاگەیاندنی سەربەخۆیی ئەمریکا بە چاپی گەیاند. ئەم کتێبە بەو شێوازە لۆژیکیە سادە و ڕەوان و توند و بوێریەیەوە، لە سەرتاسەری ئەمریکادا گۆڕانکاریەکی قوڵ و یەکلایکەرەوەی لە ڕای گشتیدا دروستکرد و وایکرد لە هەواداری پاشکۆیایەتیەوە ببنە لایەنگری سەربەخۆیی و هوشیاریان لە هوشیاریەکی کۆنسێرڤاتیڤەوە بگۆڕێت بۆ هوشیاریەکی لیبڕال و لە هەواداری سستەمی پادشایەتیەوە ببنە لایەنگری سستەمی کۆماری.

بیرو بۆچونەکانی "تۆماس پین" جەماوەری ئەمریکای وروژاند و خواستی ئازادکردنی وڵاتەکەیانی لا زیندوکردنەوە و قەناعەتی بە زۆرێك لەوانەش کرد کە دوودڵ بوون لە سەربەخۆیی و هێنانە ئارای سستمێکی کۆماری..

"پین" گاڵتەی بە سستەمی حوکمڕانی پادشایەتی ڕەها دەهات و پلاری لە مافی یەزدانی پیرۆزیش دەگرت کە پادشاکانی بەریتانیا ئیدعایان دەکرد، چونکە ئەو پێی وابوو پادشا دوژمنی سەرسەختی ئازادیە و بەو پێیەشی کە فەرمانڕەوایەکی تاك و تەنها و ستەمکارە، ناتوانێت لە ئاست خواست و داواکاری ئەو ناوچانەدا بێت کە وەك کۆلۆنییەك حوکمڕانیان دەکات.

کتێبی *Common Sense* مژدەدان بوو بە شۆڕش و سەرەتایەکیش بوو بۆ ڕاگەیاندنی سەربەخۆیی، ئەو سەربەخۆییەی لەو بەڵگەنامەیەدا بەرجەستەبوو کە "تۆماس جیفرسۆن" ڕەشنوسەکەی نوسی و پاشان "فرانکلین" پیایداچووەو دایڕشتەوە.. ئەم کتێبە لە دەرەوەی ئەمریکاشدا هەمان کاریگەری هەبوو، بە تایبەت لە فەرەنسا و چەند وڵاتێکی دیکەی ئەوروپا کە زۆر بە توندی پەرۆشی سستەمی کۆماری نوێ بوون.

لە پێشەکی کتێبەکەیدا "پین" نوسیبووی: (بەڕادەیەکی زۆر کێشەی ئەمریکا بە کێشەی تەواوی مرۆڤایەتی دادەنرێت، سەرەڕای بارودۆخ و هەلومەرجیش دەتوانین بلێین مەسەلەی ئەمریکا مەسەلەیەکی جیهانییە نەك مەسەلەیەکی لۆکاڵی بێت. هەر بۆیە کاریگەری لەسەر تەواوی ئەو کەسانە جێدێڵێت کە پەرۆشی مرۆڤایەتین و بە گرنگیەوە لە

گۆڕانكاری و ڕووداوەكانی دەڕوانن.. كاولكردنی وڵاتێك بە زەبری ئاگر و ئاسن و ڕاگەیاندنی جەنگ لە دژی مافە سروشتیەكانی مرۆڤایەتی، جێگا بایەخی هەموو مرۆڤێكە كە سروشت هێزی هەستكردنی پێبەخشی بێت)[2].

لێرەدا "پین" لایەنگری خۆی بۆ گەردونگەرایی ئەو بەهایانە ناشارێتەوە كە شۆڕشی ئەمریكی هەڵگریەتی، نەك بەو پێیەی كە ئەمە تەنها مەسەلەیەك بێت تایبەت بە ئەمریكا، بەڵكو لەبەرئەوەی شتێكە تەواوی مرۆڤایەتی دەگرێتەوە.

"پین"جیاكاری لە نێوان حكومەت و كۆمەڵگەدا دەكات و نایەوێت تێكەڵ بە یەكتریان بكات، ئەمەش نەك تەنها لەو ڕووەوەی كە ئامانج و مەبەستی جیاوازیان هەیە، بەڵكو هاوكات لەبەرئەوەی كە هەریەكەیان بنەچەو سەرچاوەی جیاوازیان هەیە (چونكە كۆمەڵگە، دروستبونی بەرەنجامی پێداویستیەكانمانە. لە كاتێكدا حكومەت بەرهەمی كەموكوڕی و شەڕانگێزیەكانمانە.. كۆمەڵگە لە ڕێی یەكخستنی هەست و سۆزمانەوە بەختەوەری و كامەرانیمان زیاتر دەكات، لە كاتێكدا كاری حكومەت بەرگرتن و كۆنترۆڵكردنی خراپەكاریەكانمانە.. كۆمەڵگە هانی پەیوەندی بەستنمان دەدات و حكومەت جیاوازی دەخوڵقێنێ. كۆمەڵگە چاودێریمان دەكات و حكومەت سزامان دەدات.. بە گشتی كۆمەڵگە نیعمەتەو حكومەتیش لە باشترین حاڵەتدا جگە لە بەڵایەكی پێویست یان لە خراپترین حاڵەتیدا جگە لە بەڵایەكی نەخوازرا و شتێكی تر نییە)[3].

بەڵام مادامەكی مرۆڤ پێویستی بە ڕێكخستنی ژیانی هاوبەشی خۆی هەیە تا ڕێگە لە خراپەكاری و زەرەر و زیان بگرێت، ئەوا كاری ئاقڵانە ئەوەیە مرۆڤ بوونی حكومەتێك قبوڵ بكات و بۆ ئەمەش هەر كەسە و دەستبەرداری بەشێك لە ئازادی خۆی بێت، تا هەموان پارێزراو بن و لە هەڕەشە و مەترسی بە دوور بن..

لێرەوە تێدەگەین كە "تۆماس پین" وەكی زوربەی بیریارانی سەدەی هەژدەهەم بونی دەسەڵاتی حكومەتی بە بیرۆكەی (پەیمانی كۆمەڵایەتی) پاساوداوەتەوە، بەڵام (پەیمانی كۆمەڵایەتی) بەلای ئەوەوە ڕێكەوتنێك بووە لە نێوان خەڵك خۆیاندا نەك لە نێوان دەسەڵاتی حوكمڕان و هاوڵاتیاندا بێت. لەم بارەیەوە دەڵێت: (باس لەوە دەكرێت پەیمانی كۆمەڵایەتی هەنگاوێكی گەورەیە ڕووەو دامەزراندن و هێنانە ئارای پرانسیپەكانی ئازادی، ئەمە ڕاستە، بەڵام ئەوانەی پێیان وایە حوكمڕانی ڕێكەوتنێكە لە نێوان ئەوانەی حوكمڕانی دەكەن و ئەوانەی حوكمڕانی دەكرێن بە هەڵەداچون. لەبەرئەوەی مرۆڤ بەر لە بوونی دەسەڵاتی حوكم هەبووە، سەروەختێكیش هەبووە كە دەسەڵاتی حوكمڕانی لە ئارادا نەبووە. بەمجۆرەش حوكمڕانی وەها نەبووە تا پەیمان و ڕێكەوتنێكی لەو جۆرە لەگەڵ هاوڵاتیاندا مۆر بكات. كەواتە ڕاستی مەسەلەكە ئەوەیە كە مرۆڤەكان خۆیان (هەریەكە و خاوەنی كەسایەتی و بڕیاری تایبەتی خۆیەتی) پێكەوە لەگەڵ یەكتریدا ڕێكەوتون بۆ دروستكردنی حكومەت، تەنها بەم ڕێكەوتنەش دەسەڵاتی حوكمڕانی دێتە ئاراوە، تەنها پرانسیپێكیشە لە ڕێیەوە دەكرێت ئەندامانی حكومەتی پێ دەستنیشان بكرێت)[4].

"تۆماس پین" پێی وایە ئەوە پێداویستیە كە مرۆڤە ئازادەكانی لە دۆخی سروشتیدا والێكردووە تا لەناوخۆیاندا هاریكاری یەكتری بكەن، لەبەرئەوەی تاكەكەس بە تەنها لە باریدا نییە كۆمەڵگە دروست بكات و ناتوانێت بە تەنهاش بژی. لەو هەلومەرجەدا دەسەڵاتی حوكمڕانیكردن بۆ ئەوان مەترەح نەبوو،

چونکـە لـە نێـو خۆیـاندا دادپەروەریـەکی تـەواویان پـــەیڕەو دەکـــرد و پـــەیڕەوی ڕێســـا خۆڕســـك و سروشتیەکانی ژیانیان دەکرد، بەڵام دواتر هەلومەرج ناچـاری کـردن جۆرێـك لـە سسـتمی کۆمەڵایـەتی سەرەتایی پێکبهێنن بۆ ئەوەی گرنگی بـە مەسـەلە گشـتیەکان بـدات و تاکەکەسـەکانیش ناچـار بکـات پابـەندی هـەندێك یاسـا بـن و بـەپێی ئـەوە ڕەفتـار بکەن، هەرکەسێکیش سەرپێچی بکات سزا بدرێت. بـە کورتیەکـەی "پـین" پێـی وایـە ئینسـانەکان لـە دواجـاردا کۆنـترۆڵی خۆیـان بـۆ نـەکرا لـە بەرامبـەر خراپەکاری و فەزیڵەتی ئەخلاقیش ئەو کەلێنـەی بۆ پڕ نەدەکرایەوە (هەر ئەمەش بووە مایـەی ئـەوەی تا دەسـەڵاتی حوکمڕانـی بێتـە ئـارا، واتـە حوکمڕانـی یەکـەمین نمونـەی پێویسـت بـوو لـە دوای ئـەوەی فەزیلـەتی ئـەخلاقی نـەیتوانی جڵـەوگیری دنیـا بکات)[5].

خوێندنـەوەی ئـەم بۆچونانـەی "تۆمـاس پـین" دەمانگەیەنێتە ئەو ڕایەی کە مرۆڤی سروشتی پاکی و بێگـەردی خـۆی لـە دەسـت داو، بـە هـاتنی دامودەزگـای دەسـەڵاتی بۆمـاوەش خراپـەکاری و شـەڕانگێزی زیـاتر و زۆرتـر بـوو. ئـەو پێـی وایـە سستمی بۆمـاوەی پادشـایەتی سسـتمێکی بـێزرا و نەویسـتراوە، لەبەرئـەوەی لەگـەڵ ئـەقڵ و سروشـتدا ناگونجێت... لێرەوە دەتوانین بڵێین "پین" سـەرلەبەر وەکی "جان جاك ڕۆسـۆ" مرۆڤێکـی کۆمـاریخواز و دیموکراسـخوازە و هـەموو جیاوازیـەکی کۆمەڵایـەتی نێـوان ئینسـانەکان و گـەندەڵی کۆمەڵایـەتی، بـە بەرهـەمی دەسـتی خراپـەکاری سسـتمی پاشـایەتی دەزانێـت. تەنـها سسـتمێکیش کـە لـە بـاریدا بێـت کۆتـایی بـەو حاڵـەتە بێنێت و چونیەکیـەکی سیاسـی لـە نێـوان هاوڵاتیـاندا دروسـت بکـات، سسـتمی کۆمارییە. "پین" پێی وایە نەتەوە مافی ئەوەی هەیە بـەردەوام فۆرمـی حوکمڕانـی بگۆڕێـت و ئـەوەیان بەرقەرارکات کە لەگەڵ خواست و بەرژەوەندیەکانیدا دەگونجێت. بە بڕوای ئەویش تاکە فۆرمی حوکمڕانی کـە لەگـەڵ ئـەو بەرژەوەندیانـەدا یـەك بێتـەوە، دەسـەڵاتێکی حوکمڕانـی دەنـگ پێـدراوە کـە نوێنەرایەتی گەل و نەتەوە بکات.

بۆچونـی "پـین" دەربـارەی ئـازادی هـەروەکی "نۆیـل ئـەنان" باسـی دەکـات، لـە ژێـر کاریگـەری بیروڕاکانی "جان جاك ڕۆسۆ"دا بوو، (وەکی تەواوی شۆڕشگێڕەکان دڵنیابوو لەوەی کە دۆخی کۆمەڵگە گەندەڵە و ئینسانەکان دەخوازن ئازادبن.. هـەروەها هۆکاری مانەوەشیان بە دیلێتی دەباتـەوە بۆئـەوەی کە ژێردەسـتەی حوکمڕانی دەسـەڵاتە ستەمکارەکان بـوون.. "پـین" لـە ڕێـی تەفسـیرکردنی مێـژووی ئنگلستانەوە پاساو بۆ ئەم بۆچونەی خۆی دێنێتەوە و بـاس لـەوە دەکـات کـە نۆرمانديـە پـەلاماردەر و شەڕانگێزەکان بەرپرسیارن لە پێشێلکردنی ئازادی خـەڵکی و لـەو کاتەشـەوە پادشـا و خانەدانـەکان بەردەوامن لەسەر پێشێلکردنی ئەو ئازادیانـە. بـەم پێیە ئەو پێی وایە کە سەرلەنوێ بەدەستهێنانەوەی ئـەو ئازادیـە پەیوەسـتە بـەوەی مـافی هـەڵبژاردنی سەرتاسـەری بدرێتـە میللـەت و بڕیـار لەسـەر دەستورێکی نوسراو بدرێت و بونیـادی کۆمەڵگـەش سەرلەبەر گۆڕانکاری تێدا بکرێت)[6].

## مافەکانی مرۆڤ:

ساڵی *1782* لـە نامـە بەناوبانگەکـەیدا بـۆ قەشـە "ڕینـال"، "تۆمـاس پین" پێشبینی ئەوەی کـرد کـە شۆڕشـی ئـەمریکی وەك چۆن جیـهانی نوێـی گرتـەوە ئاوەهـاش بـە جیـهانی کۆنیشـدا دەتەنێتـەوە، ئـەم پێشبینیەشی لە ڕۆژی *14ی* تەموزی ساڵی *1789*دا و

بە ڕوخانی (باستێل) هاتە دی. لەو سەروەختەدا "پین"لە بەریتانیا بوو، لەگەڵ بەرپابوونی شۆڕشدا دەستبەجێ ڕوی كردە پاریس، لەوێ چاوی بە هەریەك لە "كۆندرسیە و دانتۆن و بریسوا" كەوت و فەرەنسییەكان ڕایانسپارد تا كلیلەكانی (باستیل) كە سمبولی ئازادی فەرەنسای نوێ بوو بگەیەنێتە دەست ژەنەراڵ "واشنتۆن". دوای ئەوە و سەبارەت بەو مەسەلەیە لە نامەیەكدا بۆ هاوڕێیەكی دەنوسێت و دەڵێت: (ئەوە پرانسیپەكانی ئەمریكا بوو كە قەڵای باستیلی كردەوە، هەر لەبەرئەوەشە ئەو كلیلانە دەچنەوە جێگای شایستەی خۆیان)[7].. جێی باسە "پین" خۆی نەیتوانی كلیلەكان بەرێت و دواتر بە هاوڕێیەكیدا كە ناوی (*J. Rutledg*)دا ڕەوانەی ئەمریكای كرد.

یەكەمین دەنگی ناڕەزایی و پەرچەكردار لە دژی شۆڕشی فەرەنسی، ساڵی *1790* لە ئنگلستانەوە بەرز بووەوە و دەنگی ئەم ناڕەزاییەش "ئەدمۆند بێرك" ڕایگەیاند لە كتێبەكەیدا بە ناونیشانی (تێڕامان دەربارەی شۆڕشی فەرەنسی)، ئەمە لە كاتێكدا "بێرك" زۆر بە توندی داكۆكی لە شۆڕشی ئەمریكی كردبوو.

ئەو بۆچوونانەی "بێرك" چەندێ لە ناو ئنگلستاندا مایەی سەرسامی بوو، ئەوەندەش بۆ فەرەنساییەكان جێگای ڕك و بێزاری بوو، چونكە پێیان وابوو "بێرك" لە بیروڕا سیاسیەكانی و ئەو پرانسیپانەی پێشتر بەرگری لێكردون پاشگەزبۆتەوە. شایەنی باسە ئەو كتێبەی "ئەدمۆند بێرك" لە ئەسڵدا بە مەبەستی بەرپەرچدانەوەی پەیامێكی قەشە *Price* نوسرابوو، چونكە *Price* بە گەرمی پێشوازی لە شۆڕش كرد و پێی وا بوو (ڕوداوەكانی فەرەنسا ئاسۆی گەورە لە بەردەم ئازادی مرۆڤایەتیدا دەكاتەوە)[8].

"بێرك" لەو كتێبەیدا ڕەفتاری شۆڕشگێڕان و جەماوەریی دایە بەر ڕەخنەو كەوتە سەرزەنشت كردنیان، هاوكات لایەنگریی خۆی بۆ ڕۆحی ئۆرستۆكراتی و سستمی پادشایەتی لە دژی میللەت نەشاردەوە و پێی وابوو جەماوەر كۆمەڵێك خەڵكی بازاڕی و ڕەشۆكین و لەسەر دەستی ئەوان سەردەمی خانەدانی و سوارچاكی كۆتایی هاتووە و بە هاتنی ئەوانیش بۆ هەتا هەتایە شكۆمەندی ئەوروپا ئاوا بوو. ئەو پیاوەی بەرگری لە ئازادی و سەربەخۆیی ئەمریكا دەكرد، هەنوكە لە دژی ئازادی فەرەنسای نوێ دەوەستێتەوە. بێزاری و ڕەشبینی خۆشی لەو ڕوداوە نوێیە ناشارێتەوە كە خەریكە سەرتاسەری ئەوروپا دەگرێتەوە. پێشی وابوو پرانسیپەكانی ئەو شۆڕشە پوچ و بێ مانایە و لە ڕوی ئەخلاقی و سیاسیشەوە بۆش و بەتاڵە.. ئەو قەناعەتی وەها بوو بانگەشەكردن بۆ یەكسانی و عەدالەت كارێكی سروشتی نییە و دژ بە ڕەوتی مێژووە..

دوای گەڕانەوەی بۆ ئنگلستان، "تۆماس پین" دەستی كرد بە ئامادەكردنی وەڵامێك بۆ بەرپەرچدانەوەی كتێبەكەی "ئەدمۆند بێرك". لەو وەڵامەدا "پین" كەوتە داكۆكی كردنێكی سەختگیرانە لە شۆڕشی فەرەنسی و پرانسیپەكانی. ئەم كارەی كاریگەریەكی زۆری لەسەر ڕای گشتی هاوڵاتیانی ئنگلستان بەجێهێشت و كۆی دانیشتوانی وڵات لە نێوان لایەنگیری بۆ بیر و بۆچونەكانی "پین" و "بێرك"دا دابەشبوون. كاریگەری ئەم كتێبەی "پین" لەسەر ڕای گشتی ئەمریكی هاوشێوەی كتێبی پێشووی بوو. بەلای حكومەتی ئنگلستانەوە كتێبەكەی "تۆماس پین" كە بە ناوی (مافەكانی مرۆڤ)ەوە بوو، لە ڕیزی ئەو كتێبانەدا تۆماركرا كە مایەی ئاژاوەنانەوەن و ئەمەش "پین"ی ناچار كرد بەرەو فەرەنسا هەڵبێت، بە گەشتنی بەوێش بڕیاری

دا ئەو وڵاتە بکاتە نیشتمانی خۆی و فەرەنساش لای خۆیەوەو لە ساڵی 1792دا نازناوی (هاوڵاتی فەخری فەرەنسا)ی پێبەخشی.

جەماوەری فەرەنسا پێشوازیەکی گەرمیان لێکرد و لە کۆنگرەی نیشتمانی فەرەنسیشدا بەو پێیەی کە ئەندامی پارتی (جیرۆندی) بوو، دەنگی خۆیان دایە و هەڵیانبژارد بۆ ئەو جێگایە. کۆنگرەی نیشتمانی لیژنەیەکی پێکهێنا تا دەستورێك بۆ سستمی کۆماری نوێ دابڕێژن و تەواوی ئەندامانی ئەو لیژنەیەش کە ژمارەیان نۆ کەس دەبوو سەر بە پارتی (جیرۆندی) بوون. لەگەڵ هەریەك لە "بیرسواو دانتۆن و کۆندرسیە"دا "تۆماس پین"یش بەشداربوو. هەر لەم ماوەیەدا بەشێوەی غیابی دادگایکردنی "پین" لە لەندەن دەستی پێکرد. لە تشرینی دووەمی 1792دا بڕیارێك دەرچوو کە "پین" لە ریزی یاساناسان دەکاتە دەرێ و هەروەها فەرمانی لە سێدارەدانیشی دەدات، دەستبەجێ دوای دەسگیرکردنی. هاوکات هەموو دەزگاکانی بڵاوکردنەوەش ئاگادارکرانەوە لەوەی توشی گرتن و لێپێچینەوەی یاسایی دەبن، گەر بێتوو بانگەشە بۆ نوسراوو بەرهەمەکانی ئەو بکەن.

لە کتێبی (مافەکانی مرۆڤ)دا "تۆماس پین" جیاوازی لە نێوان مافە مەدەنیەکانی مرۆڤ و مافە سروشتیەکانیدا دەکات و رونی دەکاتەوە کە چۆن مافی یەکەم لە دووەمیانەوە سەرچاوە دەگرێت، هەر کاتێك تاکە کەس داخڵ بە کۆمەڵگە ببێت. "پین" لەم کتێبەیدا دەڵێت: (مرۆڤ بۆ ئەوە نەچووە ناو کۆمەڵەوە تا حاڵی بەدتر و خراپتر بێت و مافەکانی کەمتر بێت لەوەی پێشتر هەیبووە، بەڵکو کاری ئەو بۆ ئەوە بوو تا زیاتر بێت و مسۆگەرتر بێت. لێرەوە دەکرێت بڵێین مافە سروشتیەکان بنەمای سەرجەم مافە مەدەنییەکانە)[9]. سەبارەت بەوەش کە کێ یاسا بۆ کۆمەڵگە دادەنێت و دەستوری بۆ دادەڕێژێت، "تۆماس پین" دەڵێت: (ئەوەی دەتوانێت بەم کارە هەڵبستێت تەنها میللەتە لەبەرئەوەی ئەو سەرچاوەی سەرەکی هەموو دەسەڵات و یاسایەکە و بۆ هیچ کەس و دەزگایەکیش نییە ئەو کارە بکات)[10].

"پین" لە نوسینەکانیدا شێواز و سەرچاوەکانی حوکمڕانی لە مێژوودا دەخاتە ڕوو باسیان لێدەکات. یەکەمین حکومەت لای ئەو حکومەتی (خورافە)یە و ئەمەش لەلایەن کاهین و پیاوانی ئایینەوە بەڕێوە دەبرێت. دووەمینیشیان حکومەتی (هێز و توندوتیژی) یە، سێیەم حکومەتی بەرژەوەندی گشتی کۆمەڵگە و مافە گشتیەکانی خەڵکە، ئەمەش بە حکومەتی ئەقڵ ناوزەد دەکرێت و بەرەنجامی پەیمانی کۆمەڵایەتیە. بە بۆچونی ئەو ئەمە باشترین جۆرەکانی حکومەتە (لەبەرئەوەی بەپێی ئەو پرانسیپانە کاردەکات کە گەل دایڕشتون و پشت بە دەستور دەبەستێت و لە ئەنجامی هەڵبژاردن و بەدەستهێنانی دەنگی هاوڵاتیانەوە نوێنەرەکانی دەستبەکار دەبن)[11].

دواجار "پین" جەخت لەسەر ئەوە دەکات کە دیسپلینکردنی مافە سیاسی و ئابوورییەکان بۆ بەرژەوەندی گشتی هاوڵاتیان، مەرجێکی گرنگی هەموو کۆمەڵگەیەکی دیموکراسی ئازاد و دادپەروەرە. لەم چوارچێوەیەشدا بە بۆچونی "ج. کۆل"، "تۆماس پین" بە یەکێك لە پێشەنگەکانی سوسیالیزم ناونوس دەکات و دەڵێت: (پین هەرگیز پێشنیاری ئەوەی نەکردووە کە موڵکایەتی تایبەت نەهێڵرێت یاخود سنوردار بکرێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەدا بووە عەدالەتی کۆمەڵایەتی هەبێت و جیاوازی نێوان هاوڵاتیان کەم بکرێتەوە)[12].

### زیندانی لوكسمبۆرگ:

مانـەوەی ئـەمجارەی "پـین" لـە فەرەنسـا بـێ مەترسی نـەبوو، چونكـە لـەو ماوەیـەدا بـە تۆمـەتی خیانــەتی گــەورە دەســەلآتدارانی فەرەنســا بــە دادگایكردنی پادشای فەرەنساوە خەریك بوون و ئەم كــارەش "پــین"ی تــەواو ســەرقاڵ كردبــوو.. یەعقوبیەكان داوای لەسێدارەدانی پادشایان دەكرد، لـە بەرامبـەردا (جێرۆندیـەكان) دەیانویسـت یـان زیندانی بكرێت یاخود نەفی بكرێت. "تۆماس پین" لە بەیاننامەیەكدا كە لە هۆڵی كۆنگرەی نیشتمانیدا خوێندیــەوە، داواكــاری یەعقوبیــەكانی بــۆ لەسـێدارەدانی پادشـا (بـە مەقسـەڵە) بـە كـارێكی نەخوازرو دایە قەڵەم و لەو بەیاننامەیەدا بـە نـاوی گـەلی ئـەمریكاوە داوای لـە فەرەنسـیەكان كـرد تـا بەزەییان بە "لویس" دابێتەوە، چونكە ئەو پیاوە لە كـاتی خۆیـدا یارمـەتی ئەمریكیـەكانی داوە، كـاتێك بـەگژ بەریتانیـەكاندا چونـەوە بـۆ بەدەسـتهێنانی ئازادی و سەربەخۆیی وڵاتەكەیان. بەڵام ئەم داوایەی "تۆمـاس پـین" هیـچ كاریگـەری نـەبوو، ئـەوە بـوو سـەری "لویسـی شـانزە" لـە لاشـەی جیاكرایـەوەو پـاش ئـەوەش یەعقوبیـەكان كەوتنـە گیـانی هاوڵـە (جیرۆندیــەكان)ی، وەك "بریكــۆ و كۆندرســیە و بریسوا".

دواجار "تۆمـاس پـین"یـش لـە *28*ی تشـرینی دووەمــی *1793*دا دەســتگیركرا (لەوكاتــەدا بــە نوسینەوەی كتێبی سەردەمی ئەقڵەوە خەریك بوو. دوای دەستگیركردنی، لە زیندانی لوكسمبورگ توند كرا و هێنـدەی نـەمابوو لـەتاو برسـیەتی گیـانی لـە دەست بـدات. بـەر لـە دەستگیركردنیشـی بـە چـەند هەفتەیەك لە ئەندامێتی كۆنگرەی نیشتمانی دەركراو بــاڵیۆزی ئــەمریكاش لــە فەرەنســا لــە دەســتگیركردنەكەی بێدەنگــی كــرد و داوای ئــازادكردنی نــەكرد، بــەو پێیــەی هاوڵاتیــەكی ئەمریكاییە. دوای كوژرانی "رۆپسپێر"، هاورێیـانی "پین" لـە ئـەمریكا تواناكـانی خۆیـان یەكخسـت بـە مەبەسـتی ئـازادكردنی. سـەرەنجام لـە *4*ی تشـرینی دووەمی *1794*دا توانیـان ئازادی بكـەن. بەمجۆرە لـە مردن ڕزگاری بوو.

سـاڵی *1802* "تۆمـاس جیفرسـۆن"ی سـەرۆكی وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا پەیامێكی ئاراستەی "تۆمــاس پــین" كــرد و تیــایدا هیــوای خواسـت بگەرێتـەوە نیشـتمان، ئەم هەڵوێستەی "جیفرسـۆن" بـووە مایـەی ئـەوەی رووبـەرووی نارەزاییـەكی زۆر بێتەوە، لەبەرئەوەی رێگای بە گەرانەوەی "پین"داوە. نارەزاییەكی وا بووە مایەی ئەوەی "پین" گەرانەوەی بۆ نیشتمان دوا بخات و لە ئۆكتۆبەری *1802* گەیشتە واشـنتۆن.. پـاش ئـەوەی خـۆی تـەرخانكرد بـۆ نوسینەوەی زنجیرە وتارێك بە ناوی (چەند وتارێك بۆ هاوڵاتیانی وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا)، لـەم نوسـینانەیدا كەوتـە رەتدانـەوەی ئـەو بۆچونانـەی "جۆن ئادامز" كە گومـانی لـە توانـای گـەل هـەبوو لەوەی بتوانێت پارێزگـاری لـە ئازادییـەكانی خـۆی بكـات و بەشـێوەیەكی ئیرادەگـەری و هوشـیارانە هەڵسوكەوت و حوكمرانی بكات. "تۆماس پین" لە *8* حوزەیرانــی *1809* دا كۆچــی دوایــی كــرد و (بــە بێدەنگی بە خاك سپێردرا، بـێ ئـەوەی دەزگاكـانی راگەیاندن و جەماوەری ئەمریكا كەمترین شـتی بـۆ بكەن)[(13)].

## پەراوێز و سەرچاوەكان

*1-David Thomson (Ed.), Political Ideas, pelican Book 1966. P.116.*

*2-Thomas paine, Common Sense, The millnnium Library, London. 1994. P. 249.*

*3-Ibid, p. 251.*

*4-See: David Thomson…, p. 111.*

*5-Pain, Common Sense…, p. 253.*

*6*-بڕوانـە: مۆریـس كرانسـتۆن - نـاودارانی فیكـری سیاسی - دەزگای (النهار)، بەیروت *1981*، ل *113*.

*7*-هلدجارد هوشورن: تۆماس پین، دنیا نیشتمانیەتی و ئازادیش بەیداخی - وەرگێڕانی: ئەحمەد قاسم جۆدە - دەزگای (فرانكلین) بۆ چاپ و بڵاوكردنەوە، كتێبخانـەی (النـهضة)ی میسـری، قاهـیرە. ل *164*. زۆربـەی ئـەو زانیاریانەی لەم وتارەدا دەربارەی ژیانی "تۆماس پین" هاتووە لەم سەرچاوەیەوە وەرگیراوە.

*8*-جان جاك شـۆڤاڵی: دانـراوە سیاسـیە مەزنـەكان (لـە ماكیاڤیللیەوە تا ئەمڕۆ) - وەرگێڕانی: ئەلیاس مرقس - دەزگای (الحقیقە)، بەیروت *1980*، ل *193*.

*9-Thomas paine: Rights of man, The millnnium Library, London, 1994, p. 38.*

*10-Ibide, P. 38.*

*11-D. Thomson,… p. 111.*

*12*-ج. د. هـ. كـول: ڕابـەرانی فیكـری سوسیالیسـتی *1809-1850* - وەرگـێڕانی: مونـیر بەعلەبـەكی - دەزگـای (العلـم للملایـین)، بـەیروت *1978*. ل *57*.

*13-D. Thomson…, p. 116.*

## سەرچاوە

ئـەم باسـە پێشـتر لـە هیـچ شـوێنێك بڵاونەبۆتـەوە، بەڵكو نوسەر بە تایبەتی بۆ گۆڤاری (سەردەم)ی نوسیوەو لە زمانی عەرەبیەوە كراوە بە كوردی.

# تیۆری كێڵگه‌.. تیۆری ئه‌بیتیوس
# ڕامانێكی تر له‌ به‌رده‌م پانتاییه‌ كۆمه‌ڵایه‌تیه‌كاندا

-به‌شی یه‌كه‌م-

عادل باخه‌وان

**سه‌ره‌تا**

گومان كردن له‌ گه‌وره‌ی و جیهانگیری بوردیۆ، گومـان كردنـی هیچـه‌ لـه‌ واقیعێـك كـه‌ بـه‌ هـێزه‌ تێوریه‌كه‌ی له‌ هه‌موو جێگایه‌ك ئاماده‌بوونی خـۆی ده‌سه‌لمێنێت. ئه‌م سۆسیۆلۆگه‌ خـاوه‌نی تیۆریـه‌كی تازه‌و جیاوازه‌و بـه‌ جۆرێكـی دی كۆمه‌ڵگـه‌ ته‌فسـیر ده‌كات.

به‌قه‌ده‌ر ئه‌وه‌نده‌ی ماركس و دویركایم و فێبه‌ر وه‌ك سێ دیارده‌ی له‌ یه‌ك جودای كارای نێو مێژوو ده‌خوێنرێنه‌وه‌، بوردیۆ ده‌خوێنرێته‌وه‌و كاری له‌سه‌ر ده‌كرێت. ڕه‌نگـه‌ زیـاده‌ڕه‌وی نـه‌بێت گـه‌ر بڵێین لـه‌ بوردیـۆدا مێژویـه‌ك كۆتایی پێدێت و مێژویـه‌كی تـر سه‌رهه‌ڵده‌دات.

له‌ چركه‌ی بوردیۆیدا ئێمه‌ جارێكی تر ده‌توانین به‌ سه‌رله‌نوێی بوونیاده‌كاندا بڕۆینه‌وه‌، بڕۆینه‌وه‌ بۆ هه‌ڵوه‌شـانه‌وه‌و بونیادنانـه‌وه‌، بـۆ خوێندنـه‌وه‌و ڕه‌خنـه‌گرتن، بـۆ دواندنیـان و ته‌فسـیر كردنیـان. ته‌واوی بونیاده‌كان به‌بێ جیاوازی، بونیادی سیاسی و بونیـادی ئـه‌ده‌بی و بونیادی ئابووری و بونیـادی دینی و... هتد.

لـه‌ كـاتێكدا دونیـا بۆگـه‌ن ده‌كـات و میكرۆبـی سـه‌ر زه‌وی سـه‌ری تێده‌كـه‌ن، لـه‌ كـاتێكدا تـه‌واوی بـه‌هاكان ده‌كه‌ونـه‌ ژێـر پێـی ئه‌سـپه‌كانی دونیـای كه‌پیتالیسـم و دونیـای ئیسلامیسـم و دونیای سۆسیالیزم و دونیای كۆمۆنیزم و دونیـا و دونیـا و ده‌یـان دونیـای تـره‌وه‌. لـه‌ كـاتێكدا ژیـانی به‌شـه‌ر هـه‌ر ڕۆژێـك بـه‌ ده‌سـتی شـارۆن و سـه‌دام حوسـه‌ین و جـۆرج بۆشـێكه‌وه‌ ده‌كرێـت بـه‌ دۆزه‌خێكـی هه‌میشـه‌یی، زیـاتر پێویسـتمان بـه‌وه‌ ده‌بێت لـه‌ سـه‌رده‌می بوردیۆیی نزیـك بینـه‌وه‌. دروسـت لێره‌دایـه‌ و ڕووبـه‌ڕووی ئـه‌م جـۆره‌

کەسانە و ئەم جۆرە دونیایانە و ئەم جۆرە لەبیرکردنەوانە بوو کە بوردیۆ لە نووسینێکیدا بە ناوی: دەسەڵاتدارانی دونیا ئێوە دەزانن خەریکی چین؟ وەك بریندارێك دەڵێت:

(دەمەوێت چەند پرسیارێك ئاراستەی ئەم بەڕێزانە بکەم، کە هەرگیز لە خۆیانی ناکەن، بە بیانووی ئەوەی کاتیان نییە: دەسەڵاتدارانی دونیا ئایا ئێوە کۆنترۆڵی کۆنترۆڵەکانی خۆتانتان پێدەکرێت؟ ئایا ئێوە دەزانن چی دەکەن؟ ئایا ئێوە دەزانن خەریکی بونیادنانی چین؟ ئایا ئێوە دەتوانن وێنای هەموو ئەو دەرەنجامانە بکەن کە لە کارەکانتان دەکەوێتەوە؟)[1]

بەڵام تێبینی ئەوەیە بوردیۆ خۆی چۆن وەڵامی ئەم پرسیارانە دەداتەوە؟ ئەو چی پێیە بۆ ئەوەی ئێمە ناچار بە خوێندنەوە بکات؟ وە ئایا ئێمەی کورد دەکرێت لەم قۆناغە ناسکە کۆمەڵایەتییەماندا بتوانین تیۆریەکەی بوردیۆ بخەینە خزمەتی خوێندنەوەی بوونیادەکانمان؟

بە بڕوای من ئەمڕۆ لە هەموو کاتێك زیاتر بونیادەکانی ئێمە پێویستیان بە خوێندنەوە هەیە، چونکە ئەمڕۆ لە هەموو کاتێك زیاتر یاریەکان تێکەڵ بە یەکتربوون و یاریزانەکان تەواوی یاساکانی یاریکردنیان خستوەتە ژێر پێ تا ئەو ڕادەیەی تۆ ناتوانیت سیاسیەك و ئەدیبێك، یاخود، میلیتێرێك و مامۆستایەك، یان ڕۆژنامەنووسێك و هونەرمەندێك لە یەکتری جودا بکەیتەوە. بە کورتی دەتوانم بڵێم پانتایی کۆمەڵایەتی کوردی لە قەیراندا دەژی. زیاتر لە دەزگایەك دەچێت کە پڕ بێت لە سیاسی فەوزەوی و نوسەری فەوزەوی و بازرگانی فەوزەوی و مامۆستای فەوزەوی و دینداری فەوزەوی و بێدینی فەوزەوی و... هتد.

لە نێو ئەم فەوزایەدا بێگومان ئاسان نییە ئەم ماڵە تەرتیب بکرێتەوە، ئاسان نییە بەم هەموو یاریزانە ناحاڵیە بگوترێت یاساکانی یاریکردن لێرەوە دەست پێدەکەن بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا توانای گۆڕان (بوون)ێکە تێکەڵ بە ڕۆحی مرۆڤ و بە تایبەتی لەو کاتانەدا سەرهەڵدەدات کە مرۆڤ دەخەیتە بەردەم هەڕەشە و مەترسی ڕاستەقینەوە. بە ڕاستی ئەم لێکۆڵینەوەیەی منیش تەنیا ئەو پەیامەی هەیە: پانتایی کۆمەڵایەتی کوردی بە هەموو بونیادەکانیەوە بخرێتە بەردەم ئەو مەترسیە وجودیانەی کە چاوەڕوانیان دەکات.

دواتر دەبێت بڵێم من پێغەمبەرێك نیم بە پرۆژەیەك لە حەقیقەتەوە رووبکەمە کۆمەڵگەی کوردی و بڵێم ڕزگاریتان لێرەدایە، من لەبری کەس بیر ناکەمەوە، هەموو ئەوەی لێرەدا هەیە تەنیا لێکۆڵینەوەو گفتوگۆ و ڕەخنەگرتنە لە سیستەمی بوونیاد و لە سیستەمی کۆنسێپت. دوور لە خەونی چارەسەری سیحری و مژدەی وەهمی، نزیك لە تێگەیشتن و خۆبینین، کە دواتر ڕێگای هەموو لێکۆڵینەوەیەکی بێلایەن و مەنهەجیە. بۆردیۆ لە دواهەمین کاسێتی ڤیدۆدا دەڵێت : "لێکۆڵەرەوە ئەو فەرمانبەرەیە کە لە بواری مەعریفەدا کاردەکات، بێلایەنانە تەماشای ڕووداوەکان دەکات، لێکۆڵەرەوە کەسێکە کە ورد دەبێتەوە بۆ تێبینی کردن، تێبینی دەکات بۆ خاڵ تۆمارکردن، خاڵیش تۆمار دەکات بۆ تەحلیلکردن. بە کورتی لێکۆڵەرەوە کەسێکە کە دەیەوێت لەوە تێبگات بۆچی شەخسێك بەم شێوەیە کردە بەرهەم دەهێنێت نەك بە شێوەیەکی تر. لێکۆڵەرەوە ئەحکام بە چەپ و ڕاستدا دابەش ناکات، لێکۆڵەرەوە پۆلیس نییە، هەروەکو قازیش نییە، لێکۆڵەرەوە کەسێکە کە هەوڵی دۆزینەوەی دەلالەتەکان دەدات و هیچی تر.."

## تیۆری کێڵگە کۆمەڵایەتیەکان

### - پرۆبلاماتیکی[2] ئەم لێکۆڵینەوەیە:

بەگفتوگۆهێنانی بۆردیۆ، ڕوبەڕووبوونەوەیەکی ڕاستەوخۆیە لەگەڵ تیۆری کێڵگە و تیۆری ئەبیتیوس و کۆنسێپتەکانی ململانێ و ڕێکەوتن، ستراتیژیەت و دژایەتی کردن، مەعریفە و ئیعتراف و چەندین کۆنسێپتی تر.

دیارە هەریەکێك لەم تیۆری و هەریەکێك لەم کۆنسێپتانە، لە چرکەی لەدایکبوونیانەوە تا ئێستا و پێشبینیش دەکەم تا دواتریش چەندین "هەرایان" ناوەتەوەو چەندین گۆمیان شڵەقاندووەو هەزاران دیاردەیان خستووەتە ژێر پرسیار و ڕەخنەگرتن و لێکدانەوەو خوێندنەوەوە.

پرۆبلاماتیك و ئیشکالیەتی ئەم بابەتە بەم شێوەیە دەست پێدەکات:

تیۆری کێڵگە چییە؟ لە کوێوە دەستی پێکرد؟ لە چی پێکهاتووە؟ چۆن دەتوانین بڕۆینە نێو کێڵگەیەکەوە؟ کامانەن یاریە گشتیەکان و یاسا گشتیەکانی کێڵگەیەك؟

پەیوەندی نێوان تیۆری کێڵگە و تیۆری ئەبیتیوس چییە و چۆنە؟ لە کوێدا بەیەکدەگەن و لە کوێدا لە یەکتری جودادەبنەوە؟

پەیوەندی ئەبیتیوس و کێڵگە بە تاك و چین و کۆمەڵگەوە لە کوێوە دەست پێدەکات و تا کوێ بڕ دەکات؟

ئایا ئێمە لە دەرەوەی کێڵگە و ئەبیتیوس بونمان هەیە؟ ئایا ئێمە کۆمەڵێك کائینی ئازادین یان دیل و دەست بەسەر و کۆیلە؟

بۆ ئەبیتیوسی کەسێك ژیان دەکات بە بەهەشت و ئەبیتیوسی کەسێکی تر ژیان دەکات بە دۆزەخ؟

ئایا ماتۆرێك و داینەمۆیەك لە نێو کۆمەڵگەدا هەیە؟ گەر هەیە ئایا ڕاستە ئەم ماتۆرە مۆرکێکی نیزاعگەرای هەڵگرتووە؟

لە نێو کێڵگەدا چۆن دەتوانین دەسەڵات و ئۆپۆزیسیۆن دیاری بکەین؟ ئەنتاگۆنیسم واتە موعاکەسەکردن دەکەوێتە کوێی کێڵگەوە؟

ئایا لە نێو هەر کێڵگەیەکدا دەسەڵاتێك هەیە بۆ ئەوەی شەرعیەت بەو شتانە ببەخشێت کە دەکرێت بخرێنە بەر باسەوە وە ئەو شتانەش کە ناکرێت دەستیان بۆ بەرین؟

ستراتیژی چییە و چ ڕۆڵێکی هەیە لە نێو کێڵگەدا؟

ئایا بابەتی ناوەندی ململانێ/ ڕێکەوتن بریتیە لەو سەرمایە جیاوازانەی کە گرەوە نەوعیەکانی هەر کێڵگەیەکی کۆمەڵایەتی پێکدەهێنن؟

لە لایەکی ترەوە دەوترێت تازەترین داهێنانی بۆردیۆ لەو چرکانەدا دەردەکەوێت کە هەموو دیوارەکانی نێوان سۆسیۆلۆژی و ئیکۆنۆمی روخاند و پێیگوتین دەکرێت، ئەو هەموو خوێندنەوەو لێکۆڵینەوەو تەحلیلانەی لە نێو هەر کێڵگەیەکدا دەیکەین ڕایبکێشینە نێو کێڵگەی ئیکۆنۆمیشەوە، چونکە ستراتیژیەکانی ئەم کێڵگەیە دۆخێکی بەدەر نین لەو ستراتیژیانەی کە فاعیلە کۆمەڵایەتیەکان بۆ پارێزگاری کردن لە سەرمایە جیاکان دەیانەوێت بەدەستی بێنن، ئایا ئێمە لە کوێی ئەم داهێنانەداین و ئەو دەیەوێت چیمان پێبڵێت؟

لە دوای تەقینەوەی بوردیۆوە، ئیدی گفتوگۆکردن لەسەر کۆنسێپتی سەرمایە ئاڕاستەیەکی تەواو جیاوازی وەرگرت و لە فۆرمە تەقلیدیەکانی هێنرایە دەرەوە و دەیان پرسیار کرا لە سەرمایەی کولتوری و سەرمایەی کۆمەڵایەتی و

سەرمایەی ئیكۆنۆمی و سەرمایەی ڕەمزی، دەیان پرسیار كرا لە سروشت و گرەوەكانی ئەم سەرمایانە، بەڵام بەڕاستی ئێمە چ وەك تاك و چ وەك چین و چ وەك كۆمەڵگە لە كوێی ئەم هەموو گۆڕانكاریانەداین؟

تەحلیلكردنی كێڵگە كۆمەڵایەتییەكان وەك بازاڕێك بۆ سەرمایە نەوعیەكان، پێمان دەڵێن دەبێت سەرلەنوێ پێناسەیەكی تازەی ئەو كۆنسێپتە بكەین كە پێی دەگوترێت "بەرژەوەندی"، بەڵام بۆچی تا ئێستاش كە باس لەم كۆنسێپتە دەكەین، دروست وێنەی ئیكۆنۆمی دێتە بەرچاومان؟ بۆچی ئەم تێگەیشتنە تەقلیدیە تەواوی ڕووبەری خەیاڵدانمانی داگیركردووە؟ ئایا بوردیۆ چۆن و لە كوێوە دەتوانێت ئەم وێنانە بسڕێتەوە؟

لە لایەكی ترەوە ئەم سۆسیۆلۆگە چۆن توانی پەیوەندیە تەقلیدی و ئیدیۆلۆژیەكانی نێوان (تاك / كۆمەڵگە) هەڵوەشێنێتەوە؟

ئایا تا چەندێك ڕوئیا تازەكەی ئەو وەك ئەلتەرناتیڤێك خۆی سەپاند؟ مەبەستم گفتوگۆكردنەكانی ئەوە لەسەر ئەبیتیوسێك كە لە ڕوی كۆمەڵایەتیەوە بونیادنراوە و كێڵگەیەك لە ڕوی مێژوییەوە پێكهێنراوە؟ ئەم پرسیارە دەخەمە نێو نموونەیەكەوە:

ئایا ئەوەی وا لە سیاسەتمەدارێك دەكات مومارەسەی ڕاكردن بكات، هەمان ئەو ئۆبجێكتیفەیە كە وا لە زینەدین زیدان دەكات مومارەسەی ڕاكردن بكات؟ ئێمە بۆ ئەوەی تێبگەین لەبەرچی و بۆچی و بەپێی چی و لە كوێدا ئەم دووفاعیلە كۆمەڵایەتیە مومارەسەی ڕاكردن دەكەن، پێویستیمان بەوە هەیە بگەڕێینەوە بۆ تەحلیلكردنی تەواوی ئەو پەیوەندیانەی كە لە نێوان بونیادە ناوەكیەكانی فاعیلەكان و بونیادە دەرەكیە كۆمەڵایەتیەكاندا هەن. ئایا بۆ ئەم لێكدانەوەیە تا چەندێك ئێمە پێویستمان بە نزیكبوونەوە هەیە لە ئەبیتیوسی وەرزشكارێك و ئەبیتیوسی سیاسیەك؟ یاخود تا چەندێك دەبێت هەردوو كێڵگەی وەرزش و سیاسەت بخەینە ژێر پرسیارەوە؟

بەڕاستی گەورەی و بەهێزی و جدیەتی ئەم پرسیارانە بوو، ئەم لێكۆڵینەوەیەیان بەم ئاقارەدا برد، واتە بەقەدەر ئەوەندەی ئەم لێكۆڵینەوەیە كار لەسەر ئەم پرسیارانە دەكات، بە هەمان قەدەریش ئەم پرسیارانە كاریان لەسەر جەستەی فیكری من كردووە و ناچاریان كردووم بە گەڕان و خوێندنەوەو موغامەرەكردن لە نێو ئەفكارە جیاوازەكاندا. دڵنیام لەوەی تۆ چەند كار لەسەر پرسیارێك دەكەیت، بەو قەدەرەش ئەو پرسیارە خوتووكەی تۆی داوەو هەراسانی كردویت و كاری لەسەر كردویت.

من لێرەدا هەوڵدەدەم ئەوەندەی بۆم بكرێت، سۆسیۆلۆژیانە لە ڕاڤەكردنی بوردیۆ و تیۆرەكەی برۆمە پێشەوە، بە ئومێدی ئەوەی بتوانین لە خوێندنەوەی بوردیۆوە كۆمەڵگەی كوردیش بخوێنینەوە. واتە بەو سنورەی بوردیۆ وەك دیاردەیەكی گەورەی فیكری دەخەینە ژێر پرسیارەوە، هەوڵدەدەم كۆمەڵگەی كوردیش بخەمە ژێر پرسیارەوە. ڕەنگە من بە جۆرێكی تر و لەسەر كۆمەڵێك جێگای تر كلیك بكەم كە بە نووسینی كوردی نامۆ بێت و بە بێبایەخ تەماشا بكرێن، یاخود پەردەپۆش و پەراوێز بكرێن، ئەو جێگایانەی كە نووسینی كوردی نایەوێت لێیان بدوێت و دەیانخاتە بێدەنگیەوە، لە كاتێكدا هاوڕیان دەگاتە دونیا و ڕۆڵی زۆر كارایان هەیە لە داڕشتنی ژیانی تاك و چین و كۆمەڵگەدا. ئومێد دەكەم ئەمەش وەك جیاوازی قبوڵبكرێت.

## كێڵگە:
## بوونیاد و یاسا.. بەرژەوەندی و گرەو:

كێڵگـەكان بـەم شـێوەیە خۆیـان دەناسـێنن: كۆمـەڵێك پانتـایی دۆخـی بوونیـادنراو لـە نێـو ئـەم پانتایـەدا موڵكایـەتی پەیوەندیـەكی ڕاستەوخۆی بـە "دۆخـە بوونیادنراوەكانـەوە[3]" هەیـە. لـەم چركەیـەدا دەكرێـت بپرسـین: ئایـا دەتوانـین كێڵگـەكان و فاعیلـەكان لـە یـەكتری جـودا بكەینـەوە؟ واتـە ئایـا دەتوانـین لـە دەرەوەی فاعیلـەكان بـە تـەعبیری بوردیۆ و ئەكتەرەكان بە تەعبیری ئالان تورێن، كێڵگە بخەینـە ژێـر پرسـیار و لێكدانـەوەو تـەحلیل و تەركیبەوە؟

وەڵامـی ئـەم پرسـیارە لای بوردیـۆ پۆزەتیفـە، چونكە پێی وایە هەروەك كۆمـەڵێك یاسـای گشـتی هەیە و تـەواوی كێڵگـەكان دەبـەن بەڕێوە، بە هـەمان شێوەش هەر كێڵگەیەك یاسای تایبـەتی خـۆی دەژی و خـۆی پـێ جودادەكاتـەوە لـەوانی تـر. لێرەوەیـە بوردیـۆ دەڵێـت ئـەو یاسـایانەی كێڵگـەی سیاسـی دەبەن بەڕێوە، هەمان ئەو یاسایانە نین كە كێڵگەی ئەدەب دەبەن بەڕێوە. ئەو یاسایانەی كێڵگەی ئاین دەبەن بەڕێوە، هەمان ئەو یاسایانە نین كە كێڵگەی وەرزش دەبەن بەڕێوە[4]...

هەر كێڵگەیەك بە جۆرێك خۆی پێناسە دەكات، یـاخود دەكرێـت بڵێـین هـەر كێڵگەیـەك بـەپێی بەرژەوەندی و گرەوەكانی، خـۆی دێنێتـە پێشـەوەو خۆی پێناسـە دەكات و دیوارەكـانی نێـوان خـۆی و كێڵگەیـەكی تـر هـەڵدەچنێت. هـەر كێڵگەیـەك پێمـان دەڵێت بەرژەوەندی و گرەوەكانم لەگەڵ بەرژەوەندی و گرەوەكانی كێڵگەیەكی تـردا یـەكتری ناگرێتـەوە. دروسـت لێرەدایـە بوردیـۆ بـاس لـە گەمـەی فەیلەسـوفێك و جیۆگرافیێـك دەكـات و دەڵێـت ئـەو ساتەی كە فەیلەسوفێك دەیەوێت لەگەڵ بەرژەوەندی و گرەوەكانی كێڵگەی جوگرافیادا بڕواتـە یاریـەوە، دەرئەنجامەكـەی بـە دۆڕانێكـی حـەتمی كۆتـایی پێدێت، هـەروەها جیۆگرافیێكیش جگـە لـە دۆڕان و بچووكبوونـەوە لـە یاری فەلسـەفیدا هیچـی تـری بـۆ نامێنێتەوە.

بەڵام بۆئەوەی كێڵگەیەك بە گەڕ بكـەوێت، بـۆ ئـەوەی یاریـەكان دەسـت پێبكـەن، بـۆ ئـەوەی ئـەم مێـژووە لـە هـەڵچونێكی بـەردەوام و لـە جـەنگێكی بەردەوامدا بێت، هـەر یـەكێك لـەم ڕەگەزانـە دەبێـت بەوپەڕی هێزەوە ئامادە بن:

- بەرژەوەندی و گرەوەكان.
- یاریزانەكان.
- بنـەمای "ڕۆكۆنێسـانس" واتـە داننـان و ئیعـترافكردن بـە بـەرژەوەندی و گـرەو و یاسـاكانی كێڵگە.
- بنـەمای "كۆنێسـانس" واتـە كۆكردنـەوەی مەعریفەیـەكی گـەورە بـە مێـژووی كێڵگـە، بـە یاساكانی، بە گرەوەكانی، بە بەرژەوەندیەكانی، بە یاریزانەكانی، بە ستراتیژیەتەكانی ململانێ..
- ڕێزگرتـن لـە یاسـا گشـتی و تایبەتیـەكانی كێڵگە.

بونیـادی كێڵگـە بریتیـە لـە دۆخێـك كـە بـە پەیوەندیـەكانی هـێز چـنراوە، واتـە ئـەم بوونیـادە بـەردەوام لـە ژێـر گـورزی پەیوەندیـەكانی ئـەو هێزانەدایـە كـە فاعیلـەكان بەرهـەمی دەهێنـن. بەشـێوەیەكی تـر، لـە نێـو هـەر كێڵگەیـەكدا ئـەوەی دواتـر ئاڕاسـتەی بوونیـاد دەكـات و پێشـڕەوی ستراتیژیەتەكان دەكات بریتیە لە ململانێكانی نێـو كێڵگە.

ئەم بوونیـادە (كـە لـە بنـەڕەتدا بریتیـە لـەو ستراتیژیەتەی لـە لایـەن تەحەولاتەكانـەوە دیـاری دەكرێت) هەمیشە لە یاریكردندایە، ئەم یاریكردنەش تـەواوی ململانێكـانی نێـو كێڵگەیـە، ململانێـی

فاعیلەکان بۆ مۆنۆپۆلکردنی دەسەلآت و زەبر و زەنگ.

تەواوی ئەو فاعیلانەی کە لەلایەن پەیوەندیەکانی هێزەوە دەستنیشان کراون، هەوڵدەدەن بە هەر جۆرێك لە جۆرەکان مۆنۆپۆلی سەرمایە نەوعیەکان بکەن، دیارە مۆنۆپۆلی سەرمایەش ناکرێت بەبێ کۆنترۆڵکردنی دەسەلآت. لێرەوەیە ئەم فاعیلانە کۆنترۆڵکردنی دەسەلآت دەبێت بە ستراتیژیەتیان و هەموو تێکۆشانەکانیان بەو ئاراستەیەدا دەبەن. لەو چرکەیەشەوە کە کۆنترۆڵی دەسەلآت دەکەن، ئیدی مەحکوم دەبن بە بەرگری لە ئۆرتۆدۆکسی، بەرگری لە مەکانەتەکانیان، بەرگری لە مۆنۆپۆلەکانیان، مەحکوم دەبن بە سیاسەتی پەردە پۆشکردن، بە سەرکوتکردنی هەموو ئەو فاعیلە تازانەی کە دەیانەوێت لە کێڵگە نزیکببنەوە.

ئەم ستراتیژیەتی بەرگریکردنە لەلایەن فاعیلە کۆنەکانەوە و لە دژی فاعیلە تازەکان، لە بنەڕەتدا ڕێگرتنە لەو سیستمی ڕوخاندنەی کە فاعیلە تازەکان لەگەڵ خۆیاندا دەیهێنن. سیستمێك کە دەیەوێت هەموو شتێك سەرو ژێر بکاتەوە، دەیەوێت کۆدێتا بکات، ڕەنگەکان بگۆڕێت، یاساکان دابڕێژێتەوە، چاو بە گرەوو بەرژەوەندیەکاندا بخشێنێتەوە..

ئەم دابڕانە ڕەخنەییە، کاتێك ئاراستەی قەیرانەکانی دەسەلآتی کێڵگە و "دۆکسا[5]" دەکرێت، ئیدی دنیایەك زەبر و زەنگ بە دوای خۆیدا ڕادەکێشێت. دۆکسا بەرگری لە ئۆرتۆدۆکسی دەکات و فاعیلە تازەکانیش تەپڵی کۆدێتای بۆ لێدەدەن. دۆکسا بە ناوی ڕێگا ڕاستەکانەوە هەموو ئەوانی تر بە لادەرو شێوێنەر و نەفام لە قەڵەم دەدات و فاعیلە تازەکانیش دۆکسا بە لەمپەر لە بەرانبەر هەر داهێنانێکدا دادەنێن.

لێرەدا دەبێت سەرلەنوێ کلیك لەسەر جێگایەکی نەبینراوو هەست پێنەکراو بکەم: هەر یەك لەو فاعیلانەی کە لە نێو کێڵگەیەکدان خاوەنی چەندین گرەو و بەرژەوەندی تایبەتن، ئەمە ڕاستیەکی بێگومانە و هەموومان بڕوامان پێیەتی. بەڵام لە هەمان کاتدا چەندین بەرژەوەندی هاوبەشیش هەیە کە تەواوی ئەو فاعیلانە لەسەر سفرەکانیان کۆدەبنەوە. ئەم جۆرە لە بەرژەوەندی پەیوەندیەکی ڕاستەوخۆی هەیە بە وجودی خودی کێڵگەوە و لە ژێر ناوی هەر "ئەنتاگۆنیسم" موعاکەسەکردنێکدا بێت فاعیلەکان بۆیان نییە هێڵە سورەکانی تێبپەڕێنن و پارێزگاری لێنەکەن، دیارە نابێت ئەوەمان لە بیر بچێت کە ململانێ گریمانەی ڕێکەوتنێك دەخاتە بەردەست تەواوی ئەنتاگۆنیستەکانەوە "موعاکیسەکان"، ڕێکەوتن لەسەر ئەو شتانەی کە شیاوی ئەوەن ململانێیان لەسەر بکرێت.

لە لایەکی ترەوە، هەموو ئەوەی بە کێڵگەوە بەندە، یاری، گرەو، بەرژەوەندی، گریمانە، یەکەی گەمەکە پێکدەهێنن. هەموو ئەوانەی بەشداری ململانێکان دەکەن، بەشداری ڕاستەوخۆی بەرهەمهێنانی یاریەك دەکەن کە بەردەوام لە دروستبوون و پێکهێنان و بەرهەمهاتندایە. لێرەوە هەموو یاریزانەکان بە جۆرێك لە جۆرەکان دەڕۆنە نێو ئەو سیستمە قیەمیەی کە گرەوەکانی هەر یاریەك پێشنیاری دەکەن، لەم چرکەیەشدا پرۆسەی باجدان دەست پێدەکات.

ساتێك کە فاعیلە تازەکان دەیانەوێت بڕۆنە نێو کێڵگەوە، پێویستە پێش هەموو شتێك کار لەسەر هەردوو کۆنسێپتی ڕۆ کۆنێسانس / کۆنێسانس بکەن.

ڕۆکۆنێسانس: لە قۆناغی یەکەمدا فاعیلە کۆنەکان قەناعەت پێبکەن کە ئەمان باوەڕیان بە

قیەمەکانی کێڵگە و تەواوی یاریەکان هەیە و لەو پێناوەدا کاردەکەن و ئامادەنین بە هیچ شێوەیەك لێی لابدەن.

کۆنێسانس: دواتر بۆ ئەوەی بە بچوکی و بێهێز و بێکارایی نەمێننەوە، دەبێت لە قۆناغی دووەمدا بەشێوەیەکی جددی هەوڵی ئەوە بدەن کە مەعریفەیەکی گەورە کۆبکەنەوە بەرانبەر:

-مێژووی کێڵگە
-پاشقوول گرتنەکان
-هەستانەوە / کەوتن
-ستراتیژیەتی ململانێ
-دۆڕان / بردنەوە
-یاسا گشتیەکان
-دژایەتیکردن / ڕێکەوتن

بەڵام هەر لە سەرەتاوە دەبێت ئەوە ڕون بێت کە هەردوو کۆنسێپتی ڕۆکۆنێسانس ڕێگایەك نین بتبەنەوە سەر شۆڕش، بە تۆ نالێن تەواوی بنەماکانی یاریەك بخەرە ژێر پرسیارەوە، یاساکان هەڵبووەشێنەرەوە، دەرفەتی ئەوەت پێنادەن ئیهانە بە پرانسیپەکان بکەیت، بە پێچەوانەوە دەتبەنەوە سەر ڕۆحی کێڵگە، دەتبەنەوە سەر حەقیقەتەکانی کێڵگە، دەتبەنەوە سەر ڕیشەکانی کێڵگە و دەتخەنە بەرەی دژ بە ئەوانەی یاری بە هیچ دەکەن و لە هیچەوە دەستپێدەکەن و بە هیچ کۆتاییان پێدێت.

## -کێڵگە و ململانێ:

بەڵام هەموو ئەوەی کە گووترا، بە هیچ شێوەیەك ئەو مانایە نادات بە دەستەوە کە کێڵگە لە دەرەوەی گۆڕانەکاندایە، بە پێچەوانەوە تا ئەو کاتەی لەسەر ململانێ و ئەنتاگۆنیسم دەدوێین، واتە ڕاستەوخۆ لەسەر تەحەولات و گۆڕانکاری دەدوێین.

کاتێك بوردیۆ دەڵێت کێڵگە کێڵگەی شۆڕشەکان نییە، ئەمە تا ئەو کاتەیە کە فاعیلەکان لەو قۆناغەدان کە هەیمەنەیان لە سەرەو لە ژێر گورزی هەیمەنەدان[6]، بەڵام لەو ساتەوەی کە فاعیلە نوێیەکان دەبن بە خاوەنی هەیمەنە، کۆنترۆڵی مەوقیعە گرنگەکانی ناو کێڵگە دەکەن. لێرەدا شۆڕش بە مانای گۆڕین و تەحەولات و هەڵگێڕانەوە مومکین دەبێت. لێرەدا فاعیلەکان دەتوانن سەرلەنوێ دەستکاری گرەوەکان و بەرژەوەندیەکان بکەنەوەو زۆر جاریش سروشتی ئەم فاعیلە تازانە بە شێوەیەکە کە دەیەوێت تەنانەت دەستکاری یاسا گشتیەکانی نێو کێڵگەش بکات و سەرلەنوێ دایان بڕێژێتەوە. بوردیۆ لە کتێبی "وانە لەسەر وانە[7]"دا بەم جۆرە لەم مەسەلەیە دەدوێت: "سۆسیۆلۆژی ناونیشانی دۆخێکی میکانیکی نییە، بەڵێ کێڵگە کۆمەڵایەتیەکان کێڵگەی هێزن، بەڵام لە هەمان کاتدا کێڵگەی ململانێشن، ململانێ بۆ گۆڕان یان دژایەتیکردنی گۆڕان و پارێزگاری کردن لەو هێزەی کە کێڵگە هەیەتی، پەیوەندیەکانی پراکتیك و فیکری فاعیلەکان بە یاریەوە بەشێکە لە خودی یاری و ڕەنگە یەکێکیش بێت لە پرانسیپەکانی گۆڕانەکانی یاری.

کێڵگە هەرە جیاوازە کۆمەڵایەتیەکانی وەك کێڵگەی پارتە سیاسیەکان، کێڵگەی کارگەکان، کێڵگەی زانکۆ، تەنیا ئەو کاتانە بەگەڕ دەکەون کە فاعیلەکان هەبن و بە زانیاریەکی تەواوەوە گەمارۆی یاریەکە بدەن، گەمارۆ بە هەموو مانا جیاوازەکانیەوە. دواجار بڕۆنە نێو گرەوەکانەوەو لە ڕێگای ئەنتاگۆنیسمەوە یاریەکان بەم دوو ئاڕاستەیەدا بەرن: پارێزگاری لە بوونیادەکانی نێو کێڵگە یان هەوڵدان بۆ گۆڕینیان."

دیارە ئەوانەی کە دەیانەوێت پارێزگاری لە بوونیادەکانی نێو کێڵگە بکەن، هەموو ئەو فاعیلە

کۆنانەن کە خاوەنی مەوقیعە گەورەکانی نێو کێڵگەن و پشتئەستورن بە دۆميناسیۆن – هەیمەنە و بە ئاسانی نایانەوێت سەنگەرەکان چۆڵ بکەن. ئەو فاعیلانەن کە ڕەنگە بە دەیان بەحری خوێنەوە، بە هەزاران قوربانیەوە، بە شۆڕش و خەباتەوە، بە لەدەستدانی زۆر شتی جوانیانەوە، توانیبێتیان هەر یەکێك لەو مەوقیعانە بەدەست بێنن. بۆیە لە چرکەی ململانێدا تا دوا نەفەس وەك ئەنتاگۆنیستێك جەنگ دەکەن و خۆیان نادەن بەدەستەوە. ئەم جەنگە بۆ ئەوان جەنگە لە پێناوی مێژوویاندا، لە پێناوی شەرەف و کەرامەتیاندا، لە پێناوی سەرمایە ماددی و کولتوری و کۆمەڵایەتیەکانیاندا، بە کورتی جەنگە لە پێناوی ژیاندا.

لە لایەکی ترەوە، ئەوانەی دەیانەوێت کێڵگە بگۆڕن، هەموو ئەو فاعیلە نوێیانەن کە دەیانەوێت مەواقیعی تازە بۆ خۆیان دروست بکەن. ئەمانە بە هەناسەی تازەو بە ئەزموونی تازەو دونیا بینی تازەوە دێنە پێشەوە. بەقەدەر ئەوەندەی فاعیلە کۆنەکان خواستی پارێزگاری لە بوونیادیان هەیە، ئەمان کەڵکەڵەی شۆڕشیان هەیە. بەڵام سەرکەوتنی هەریەکێك لەم دوو گروپە پابەندە بە ئاستی لانەدانیان لەو مەنهەجیەتەی کە کێڵگە پێشنیاری دەکات بۆ یاری کردن.

بوردیۆ کۆنسێپتی ململانێ لە بەرانبەر بەماشینکردنی دونیادا ڕاستدەکاتەوە، بەماشێنکردنی دونیا واتە سەندنەوەی ئیرادە لە مرۆڤ، سەندنەوەی خەون لە مرۆڤ، سەندنەوەی هەست و سیفەتی گۆڕانکاریکردن و شۆڕش و یاخیبوون لە مرۆڤ. واتە دونیا بەرنامەڕێژکراوەو تۆش تەنیا ئیختیارێکت ئەوەیە وەك ماشێنێك لەو نێوەندەدا بجوڵێیت. واتە دونیا مەعمەلێکەو تیایدا ماشێنەکان و مرۆڤەکان تێکەڵ بەیەکتری دەبن و پێکەوە وەزیفەیەکی دیاریکراو ئەنجام دەدەن.

ئەمەش ئەو فۆنۆکسیۆنالیسمە (وەزیفیەت)ەیە کە بوردیۆ دژی دەوەستێتەوە. ئەم دژ وەستانەوەیەش لە ڕێگای کۆنسێپتی ململانێوە پێشنیار دەکات. ئەو بەم شێوەیە دەدوێت: "[8] بەڵێ من زۆر دژی بیرۆکەی بەماشینکردنی دونیام، چونکە بۆ من ئەم بیرۆکەیە دیوێکی تری فۆنۆکسیۆنالیسمە: ماشین دۆزەخێکە و بەرنامەڕێژکراوە بۆ ئەوەی پەیامێکی دیاریکراو ئەنجام بدات (فانتاسمی ئەم پیلانە، لەوێوە دەستپێدەکات کە پێمان وا بێت ئیرادەیەکی شەیتانی بەرپرسە لە هەموو ڕوداوەکانی جیهان و هەر ئەویش لانەی هەموو خراپەکاریەکانە). بەڵام من دەمەوێت بڵێم، سیستەمی کۆمەڵایەتی، دەوڵەت، کەنیسە، پارتە سیاسیەکان، سەندیکاکان هیچ یەکێك لەمانە ماشێن نین، بەڵکو کێڵگەن. لە کێڵگەیەکدا تەواوی ئەکتەرەکان و تەواوی دەزگاکان لە ململانێدان، بەبێ ئەوەی هیچ یەکێك لەو ئەکتەر و دەزگایانە لەو ڕێکخستن و یاسایانە لابدەن کە پانتایی ئەو یاریە پێکدەهێنن. هەر یەکێك لەو ئەکتەر و دەزگایانەش بە پلەی جیاوازی هێزەوە لە ململانێدان، لێرەشدایە زەمینە جیاوازەکانی بردنەوەو سەرکەوتن دروست دەبن. هەر لە نێو ئەم یاریەدایە کە هێزەکان بەشەکانی خۆیان دەپچڕن. دواتر ئەوانەی هەیمەنە دەکەن بەسەر کێڵگەیەکدا ئەوانەن کە بەپێی بەرژەوەندیەکانی خۆیان کێڵگە دەخەنە کار و تاوی دەدەن، بەڵام ئەم موهەیمینانە گەر بیانەوێت مەوقیعەکانی خۆیان بپارێزن، دەبێت لە نێو کێڵگەدا بەردەوام لە سەنگەرەکانی بەرگریکردن و موعارەزەکردن و تەماحکردن و هەیمەنەکردنی زۆرتر و زیاتردا بن."

لە جێگایەکی تردا بوردیۆ قوڵتر باس لە کۆنسێپتی ململانێ دەکات[9] و پێی وایە سیستمێکی پەیوەندی بابەتیەو ئەم سیستەمە سیفەتی پەیوەنداری بە مەوقیع و پرۆسەی دروستکردنی

مەوقیع دەبەخشێت. واتە مەوقیع وەك بوونیادێك و دروستکردنی مەوقیعیش وەك پرۆسەیەك بەردەوام لە دامەزراندنی پەیوەندیدان و پەیوەندی دامەزراندنیش مۆرکی سەرەکیانە. دیسانەوە سیستمی پەیوەندی بابەتی، هەیمەنەیەکی ڕاستەوخۆی هەیە لەسەر تەواوی ئەو ململانێیانەی کە بە ئامانجی گۆڕانەکان خۆیان بەگەڕ خستووە.

لەلایەکی ترەوە سیستمی پەیوەندی بابەتی، پانتاییەك بۆ یاریکردن دروست دەکات و لەم پانتاییەوە سەرلەنوێ پێناسە دەبەخشێتەوە بە ستراتیژیەکانی تاك و گروپ، ئەو ستراتیژیانەی کە هەندێك جار عەفەوین و هەندێك جاری تر ڕێکخراو، ئەو ستراتیژیانەی کە بەردەوامی خۆیان لە پانتایی یاریەکانەوە وەردەگرن و بەردەوام کاردەکەن لەسەر بنەمای پارێزگاری لێکردن یاخود گۆڕانکاری بۆ پارێزگاری لێکردن.

لێکۆڵینەوە لە چرکەی ململانێ، کۆمەڵێك فەزیحەتی گەورەی فیکری تەواوی فاعیلەکان کەشف دەکات، بۆ نموونە: بەقەدەر ئەوەندەی گوتاری دەسەڵاتی نێو کێڵگە کار لەسەر کۆنەپارێزی و پارێزگاری لێکردن دەکات، گوتاری ئۆپۆزیسۆنیش کار لەسەر ئەم ستراتیژیەتە دەکات. ئۆپۆزییسیۆن گوتارێکە بۆ گۆڕانکاری، ئەمە ڕاستە، بەڵام ئەوەش ڕاستە کە هەموو گۆڕانکاریەك پێویستی بە پارێزگاری لێکردن هەیە، پێویستی بە پاسەوان هەیە. لێرەوە بە جۆرێك لە جۆرەکان هەموو فاعیلەکان دەبنەوە بە پارێزەر و دەکەونەوە پارێزگاری لێکردن. واتە بەقەدەر ئەوەندەی دەسەڵات شتی هەیە بۆ پارێزگاری لێکردن، ئۆپۆزیسۆنیش شتی هەیە بۆ پارێزگاری لێکردن. لێرەدا کۆنسێپتی کۆنەپارێزی و کۆنەپارێز دەکەوێتە بەر کۆمەڵێك مەترسی و پرسیاری مەنهەجیەوە. مەبەستمە بڵێم دروستی ئەو تێرمەی کە کەسێك کەسێکی تر یاخود گرووپێك گروپێکی تر بە کۆنەپارێز تاوانبار بکات و خۆشی بە نوێخواز بناسێنێت، ئیتر لەمەودوا لە ڕووی مەنهەجیەوە هەروا بە ئاسانی گوزەر ناکات. (دواتر دەگەڕێمەوە سەر ئەو بێ مەنهەجیەتەی کە ئەمڕۆ لە نێوان چەپی کوردی و ڕاستی کوردیدا هەیە سەبارەت بەم مەسەلەیە. بەشی دووەم)

ستراتیژیەتی گۆڕان هیچ نییە جگە لە جۆرێك (کردەو پەرچەکردە)ی بەردەوام لە لایەن تاك و گروپەکانەوە، ئەو تاك و گروپانەی کە دەیانەوێت هەموو هەوڵەکانیان بخەنە کار لە پێناوی پارێزگاریکردن یاخود گۆڕانی دۆخەکانیان لە نێو بونیادی کۆمەڵایەتیدا. بەشێوەیەکی وردتر دەتوانم بڵێم، ستادێك لە بەرەوپێشەوەچوونی کۆمەڵگەکان، کۆمەڵگە بەو سیفەتەی کە دابەشبووە بەسەر چینەکاندا، بە تەنیا خۆی لە بەرانبەر بنەمایەکدا دەبینێتەوە کە بریتیە لە "گۆڕین بۆ پارێزگاری لێکردن".

لەم حاڵەتە تایبەتەدا کە بە بەردەوامی دووبارە دەبێتەوە، هەر چینێك یاخود گروپەکانی نێو هەر چینێك هەوڵدەدەن لە ڕێگای جووڵەکانەوە غەنیمەتی نوێ و قازانجی تازە بە دەست بێنن. واتە بە پاشقول گرتن لە چینەکانی تر و لەسەر حیسابی چینەکانی تر خۆیان بەرنە پێشەوەو داهاتی زیاتر و زۆرتر بەدەست بێنن. لێرەوە جوڵەکان دەکەونە هەڵوەشانەوەی فۆرمی بونیادی پەیوەندیە بابەتیەکانی سەرجەم چینەکان. ئەو جوڵانە لە لایەن پەرچەکردارەکانەوە موازەنە کراون و لە هەمان کاتیشدا بەرەو هەمان ئامانج ئاڕاستەکراون. دەرەنجامی ئەم جوڵانە، خۆبەتاڵکردنەوەیە لە نێو ڕەوتێکدا کە وروژێنەری لەبەریەکهەڵوەشانەوەی بونیادی گشتی کێڵگەیە.

سەرلەنوێ دەمەوێت کۆنسێپتی "ڕەوتی پێشکەوتن[10]" بخەمەوە ژێر پرسیار و تێبینیەوە، چونکە ئەم کۆنسێپتە لە هەموو دونیادا بە گشتی و لە کوردستاندا بەتایبەتی کۆمەڵێك پرۆبلاماتیکی (ئیشکالیەت) بەدوای خۆیدا ڕاکێشاوە، تا ئەو ڕادەیەی ڕوانینمان بۆ ئەم کۆنسێپتە تەواو ڕوانینێکی تەقلیدیە.

لە ڕەوتی پێشکەوتندا گروپەکان سەرجەم هێز و تواناکانیان دەخەنە مونافەسەیەکی توندەوە، بۆ بەدەستهێنانی بەرژەوەندی و ناونیشانی گەورە. لێرەدا ئەم گروپانە لە دۆخی غاردانداندا، دروست وەك غاردانی ئەسپەکان لە مەیدانی بردنەوەو دۆڕاندا، لەو مەیدانەدا کە پێمان دەڵێت کام ئەسپ لە دواوەیەو کامیان لە پێشەوەیە. لێرەدا مەودای تێبینیکراوی نێوانەکان وەکو خۆیان دەمێننەوەو پارێزگاریان لێدەکرێت. واتە: گروپەکان لە دوو ڕێگاوە دەبن بە خاوەنی بەرژەوەندی گەورەو ناونیشانی گەورە، ڕێگای یەکەم بریتیە لەو پەیژە کۆمەڵایەتیەی کە ئامادەییەکی پێشینەی هەیە و گروپەکان لە ڕێگای (بۆمانەوەوە) دەبن بە خاوەنی بەرژەوەندی گەورە و ناونیشانی گەورە، وەك ئەوەی لە بواری حوکمڕانیدا و لە نێو کۆمەڵگەی کوردی و کۆمەڵگەکانی دەوروبەرماندا هەیە.

ڕێگای دووەم بریتیە لەو هێزو توانایانەی کە گروپەکان بەکاردەهێنن بۆ بەدەستهێنانی بەرژەوەندی گەورەو ناونیشانی گەورە. لێرەوە پانتایی کۆمەڵایەتی دەبێت بە مەیدانی غاردانی ئەسپەکان و پێشکەوتنیش پەیوەند دەبێتەوە بە ئاستی تیژڕەوی ئەسپەکان کە دواتر ناوبانگە گەورەکان و بەرژەوەندیە گەورەکان دیاریدەکەن.

هەموو ئەو گروپانەی کە بە جۆرێك لە جۆرەکان کەوتوونەتە نێو مەیدانی غاردانەوە، هەرگیز توانای ئەوەیان نابێت پارێزگاری لە مەوقیعەکانیان، لە ناوازەییەکانیان، لە پلەکانیان بکەن گەر بێت و غاردان و مونافەسەکەیان توندوتیژتر نەکەنەوە بۆ:

–یەکەم پاراستنی مەودای نێوان خۆیان و ئەوانەی کە لە دواوەیانەوەن و دەیانەوێت بە هەر نرخێك بووە بگەنەوە پێیان یاخود بدەن بە لایاندا.

–دووەم هەڕەشەکردن لەوانەی کە لە چەپ و ڕاستەوە هاوشانیان غاردەدەن. واتە گەر تۆ تەواوی هەوڵ و تواناکانی خۆت نەخەیتە موونافەسەکردنەوە بۆ هەڕەشەکردن لەوانەی لە چەپ و ڕاستەوەن نەك لە دواتەوە، بێگومان تێتدەپەڕێنن و دەتخەنە سەر سفر. (لە بەشی دووەمی ئەم باسەدا هەوڵدەدەم بەم مەنهەجەوە بگەڕێمەوە سەر واقیعی سیاسی کوردی و ئەو دۆخە بخەمە ژێر تێبینیەوە.)

## -ململانێی سامبۆلیك:

گەر بمانەوێت لە وەهمەکانی سیوبژێکتیڤیم[11] –زاتیەت– خودگەرایی هەڵبێین و خۆمان ڕزگار بکەین لە تەونە جاڵجاڵۆکەییەکانی، یان گەر بمانەوێت وشیارانە خۆمان بەدوور بگرین لە سوبژێکتیڤیسم کاتێك کە تەواوی پانتاییە کۆمەڵایەتیەکان کورت دەکاتەوە بۆ پانتاییەکی کاتیی کارلێکردن[12] (تەفاعەلات – ئەنتەراکسیۆن)، پێویست دەکات هەموو تواناکانمان بخەینە کار بۆ بونیادنانی پانتایی کۆمەڵایەتی وەك پانتایی ئۆبژێکتیف[13] نەك سیوبژێکتیف. هاوکات دەبێت تەواوی پەیوەندیەکان ئۆبژێکتیڤانە دابمەزرێنین، مەبەستم ئەو پەیوەندیانەیە کە ڕۆڵی سەرەکیان هەیە لە دەستنیشانکردنی فۆرمێکدا کە دواتر کۆنترۆڵی سەرجەم کارلێککردنەکان و نوێنەرایەتی کردنەکان دەکەن. هەر یەکێك لەو دوو تێرمەش (کارلێکردنەکان، نوێنەرایەتیکردنەکان) دەتوانن ئۆبژێکتیڤیسمی کاتیی تێبپەڕێنن (ئۆبژێکتیفیسمی کاتیی، مەسەلە کۆمەڵایەتیەکان لە

پــــــرۆژەی ڕێیفیکاســــــیۆن – بەشـــــــتکردندا دەبینێتــەوە) و بــە جۆرێکــی چالاکانــەتر بڕۆنــە نێــو ململانێکانەوە.

دابەشکردن بە مانای سەرژمێری و بـە مانـای ئابووری سیاسەت، گوزارشت لە دۆخێك دەكات کە پەیوەندیەکانی هێز لە نێو چینە کۆمەڵایەتیەکاندا لە ژێر بەرەوە دەخاتەوە سەر بەرە، واتە هـەموو ئـەوەی گروپەکان یاخود چینەکان دەیانـەوێت بیشارنەوە و بـــە دەرەوەی نـــەڵێن، دواتـــر لـــە ژێـــر کـــارایی دابەشکردنەکاندا بـە مانـای سـەرژمێری و ئـابووری سیاسی دەردەکەونەوەو خۆیان ڕووندەکەنـەوە. هـەر لێرەدا جۆرێکـی دی لـە ململانـێ دەسـت پێدەکـات، ململانێیەکی سەمبۆلیك کە دەیـەوێت دەست بگرێت بەسـەر هـەموو ئـەوەی کـە ناوازەیـە لـە نێو کێڵگـەدا، ململانێیەك کە دەیەوێت هەموو شتە بە بەهاو جوان و بـەنرخ و کاراکـان بـۆ خـۆی پاوانکـات، هــەر لــە سیاسەتەوە تا دەگاتە سیاسەتی ئابووری و تەنانەت ناوبانگـــەکان و نووســـەرەکان و هونەرمـــەندەکان و تەنانەت پاکی شۆڕشگێڕێك و مێـژووی زیندانیەك و هتــد. (لـــە بەشـــی دووەمـــی ئـــەم لێکۆڵینەوەیـــەدا کەسایەتی یاقووبی سوبحەدم وەك مەوقیعی سەرۆك لـە ڕۆمـانی دواهـەمین هـەناری دنیـاوە وەردەگـرم و دەیخەمە ژێر تێبینیەوە.)

بونیادی سەرجەم پەیوەندیەکانی چین، بریتیـە لــە هـــەموو ئـــەو شـــتانەی کـــە هاوزەمـــەنن لـــە نێـــو دۆخێکـــدا و چینـــەکان لـــە ڕێگـــای ململانێـــوە دایدەمـەزرێنن. واتـە ئـەو هـێزە ڕێژەییـەی کـە هـەر تاکێك لە چرکەی ململانێدا بەکاری دەهێنێت، دواتر پەیوەندیـــەکانی چـــین دیـــاری دەکەنـــەوە. هــــەروەها لـــێرەدا دروســـتە بڵێـــم، دابەشـــکردن بـــە مانـــا پۆلەتیکۆئیکۆنۆمیەکەی، کاتێك خۆی لەبەردەم جۆرە جیاوازەکانی سەرمایەدا دەبینێتەوەو ئەرزش بۆ هەر یەکێك لـەم سـەرمایانە دادەنێـت، ئیـدی ڕاسـتەوخۆ بەشداری دەکات لە پێناساندنی بونیـادی کێڵگـەی ململانێدا.

تەواوی گرەوەکانی ئەو هێزەی کە هەر تاکێك بە کاری دەهێنێت پابەندیەکی نەپچڕاویان هەیە بە دۆخی ململانێوە، ئەوان هەر لە سەرەتاوە بۆ ئـەوە هــاتوون کــە گرەوەکــانی ململانــێ پێناســە بکــەن. هـەروەها ناسـاندنی کەرەسـەو گـرەوە شـەرعیەکانی ململانــێ خــۆی بــۆ خــۆی بەشــێکە لـــە بونیـــادی ململانـێ و ئـەوە کـارایی ڕێژەیـی کەرەسـەکانە کـە دواتـر ڕێگـا خۆشدەکات بـۆ هەیمەنـە کـردن بەسـەر یاریەکدا.

## -ستراتیژی وەك مانای یاری:

لێرەدا کە باس لە فیکرەی ستراتیژی[14] دەکەین، مەبەستمان لـە ئالیـەتی کەرتبوونـە لەگـەڵ مەزهـەبی ئۆبژێکتیڤیسمدا، هەروەها لەگەڵ ئەو بزوتنەوەیەی کە بەبێ فاعیل بوونیاد گریمانە دەکات.

لـە سـتراتیژیدا دەتوانـین بەرهـەمی پرۆگرامێـك ڕەتبکەینـەوە کە کار لەسـەر ناوشیاری دەکات، لـەم پرۆسەی ڕەتکردنەوەیەشدا دەکرێت پێویستمان بە وردەکاریـــەکانی وشـــیاری و ڕاسیۆنالیســـم – عەقلانیـەت نـەبێت. واتـە ڕەتکردنـەوەی ناوشـیاری و ناعەقلانیـــەت بـــە زەرورەت وشـــیاری و عەقلانیـــەت فـەرز ناکـەن بـە سـەرماندا. ڕاسـتە ئـەم فیکرەیـە کـەمێك ئـاڵۆزە، بـەڵام هـەوڵدەدەم زیـاتر تیشـکی بخەمـە سـەر بـە ئومێـدی ئـەوەی سـەرەداوەکان لـە یەکتری گرێدەم.

سـتراتیژی بەرهـەمی ئـەو مانایانەیـە کـە لـە پراکتیکـــەوە وەریدەگریـــن و دەســـتمان لێیـــان گـیردەبێت، هـەر ئـەم پرانسـیپەیە کـە سـتراتیژی دەکاتەوە بە مانای سەر لە بەری یاریەکان. مەبەستم ئەو یاریانەیە کە لە هەر کێڵگەیەکدا ئەنجام دەدرێت، یـاری نێوان فاعیلـەکان، یـاری مێژوویـی کـە هـەر لـە

منالّیەوەو لەو چركانەوە كە تۆ دەكەویتە نێو یاریەكان مەحكوم دەبیت بە كۆمەڵێك ستراتیژی. كە یەكەم شەق لە تۆپ هەڵدەدەیت لە نێو ساحەیەكدا و لە نێو گروپێكدا، كە یەكەم ڕۆژ دەڕۆیتە قوتابخانەو خۆت دەبینیتەوە لە نێو گروپێكدا، كە لە كۆڵان گروپێك لە دەوری خۆت دەبینیت، كە لە ماڵەوە گروپێك بەردەوام چوار دەورت دەتەنن، ئەو هەستەت لا دروست دەبێت كە بەبێ دیاریكردنی ستراتیژی ناكرێت لە نێو ئەم هەموو گرووپەدا جێگایەك بۆ خۆت بدۆزیتەوە. ناكرێت بەبێ ستراتیژی كەس گوێت بۆ بگرێت، ناكرێت بەبێ ستراتیژی بتوانیت سەرنجی ئەوانی تر بەلای خۆتدا ڕابكێشیت، ناتوانیت بەوانی تر بڵێیت ببینن منیش لێرەم، ببینن من چ وجودێكی بەهێز و گەورەم هەیە.

بەڵام لێرەدا دەكرێت بپرسین:

–ئایا تەنیا بوونی ستراتیژی بەسە بۆ ئەوەی تۆ بتوانیت بوونی خۆت بسەلمێنیت؟

–ئایا تەنیا هەبوونی ستراتیژی بەسە بۆ ئەوەی بتوانیت بڕۆیتە نێو یاریەكانەوە؟

–ئایا تەنیا بە دەستنیشانكردنی ستراتیژی، گرنتی بردنەوەی یاریەكانت دەست دەكەوێت؟

دیارە سەرجەم چارەنووسی یاریەكان پەیوەندیەكی ڕیشەییان لەگەڵ هەریەك لەم پرسیارانەدا هەیە و وەڵامی ئەم پرسیارانەیە بردنەوە و دۆڕان، یاخود سروشتی یاریەكان دیاری دەكات و تیشك دەخاتە سەر ئەو ناوچانەی بە تاریكی ماونەتەوە. وەڵامی ئەم پرسیارانە بۆ هەر تاك و گروپ و چین و كۆمەڵگەیەك پێویستیەكە كە هەرگیز ناكرێت بێدەربەست بن بەرانبەری، بە تایبەتی بۆ ئەو تاك و گروپ و چین و كۆمەڵگایانەی كە بەردەوام لە دۆڕاندنی یاریەكاندان!! دەكرێت بەم شێوەیە وەڵامەكان دەستنیشان بكەین: باشترین یاریزان، زیرەكترین یاریزان، براوەترین یاریزان ئەو كەسەیە كە دروست لە یاریەكان تێدەگات، دروست لە نەخشەی یاریەكان تێدەگات و دواتر هەر لەو تێگەیشتنانەوە تەواوی ستراتیژیەكانی خۆی دەستنیشان دەكات.

هەر یاریەك كاتێكی دیاریكراوی هەیە، كۆمەڵێك یاسای دیاریكراوی هەیە، دەستورو ڕێسای دیاریكراوی هەیە، مەیدانێكی دیاریكراوی هەیە. ئەوەی كە دەیەوێت ببێتە یاریزان ئەوەش كە دەیەوێت یاریەكە بەرێتەوە، كەسێكە كە دەتوانێت بڕواتە نێو یاساكانەوەو لە نێو پرانسیپەكاندا بجوڵێت، كەسێكە كە هەموو ئەو ئالیاتانە بەكاردەهێنێت كە یاریەكی پێدەبرێتەوە. ئیشكالیەت لێرەوە دەستپێدەكات!!

هەر یاریزانێك لێرەدا لە بەرانبەر دنیایەك كۆسپ و گرفتدا خۆی دەبینێتەوە، چونكە زۆر جار یاساكانی یاری، داواكاریەكانی یاری، ڕێوڕەسمی یاری، دەستوری یاری، لەگەڵ ئایدیۆلۆژی و خووڕەوشت و سروشتی یاریزانەكاندا یەكتری ناگرێتەوە، بەڵكو بە پێچەوانەوە یەكتر دەبڕن و وەك دوو قووتب دژی یەكتر دەوەستنەوە تا ڕادەی یەكتری سڕینەوە. ئەم دۆخە دوو مەترسی قەیراناویە و تەواوی یاریزانەكان دەخاتە بەردەم دوو ئەگەر، دوو ئیختیار، دوو ڕێگا:

یەكەم: ڕۆشتنە دەرەوە لە یاری:

ئەوەش بەوەی فاعیل (یاریزان)، ئامادە نەبێت بە هیچ جۆرێك لە جۆرەكان دەستبەرداری ستراتیژیەكانی ببێت، واتە دەستبەرداری ئەو بیركردنەوەو ئەخلاق و ئایدیۆلۆژی و هەڵسوكەوتانە بێت كە دژ بە كۆی یاریەكە دەوەستنەوە، یاخود لەگەڵ دەستور و یاساكانی یاریەكەدا یەكتر ناگرنەوە. ئەم یاریزانە تێناگات یاخود نایەوێت بڕواتە نێو گرەوو بەرژەوەندیەكانی یاریەكەوە. بە كورتی ناتوانێت یان نایەوێت خۆی لەگەڵ یاریەكەدا

ڕابێنێـــت، ئـــەوەی بوردیـــۆ نـــاوی دەنێـــت (ئەدەپتاسیۆن).

ئەم یاریزانە گەر بێت و بە خواستی خۆی لە یاریەکە نەڕواتە دەرەوە، گەربێت و بە هێواشی و بەبێ دەنگەدەنگ لە یاریەکە نەکشێتەوە، تووشی چارەنووسێکی دژوار و سەخت دەبێتەوە، دیارە لە لایەن یاریزانەکانی تر و ئەوانەشەوە کە یاریەکان بەڕێوە دەبەن. واتە دەسەلاتی نێو یاری هەموو ئەو شەرعیەتانە بە خۆی دەدات کە ئەم یاریزانە ناحالیە بکاتە دەرەوە، جا ئیتر لە ڕێگای گفتوگۆ و دانوستانەوە، یان لە ڕێگای شەق و پۆلیس و لولەی دەبابەو هەڵمەتی فڕۆکە بێت. گرنگ ئەوەیە فڕێبدرێتە دەرەوە. (لە بەشی دووەمی ئەم بابەتەدا کردنە دەرەوەی ئەوپەڕی چەپ و ئەوپەڕی ئیسلامی، واتە حیزبی کۆمۆنیستی کرێکاری و پشتیوانانی ئیسلام، دەخەمە ژێر تێبینیەوە.)

دووەم: ئەدەپتاسیۆن – خۆڕاهێنان:

خۆڕاهێنان و ئامادەیی خۆڕاهێنان لەگەڵ یاریدا، بەوەی کە سیفەتەکانت، ئایدیۆلۆژیت، ڕەفتارەکانت، ڕونتر بڵێم ستراتیژیەکانت بگۆڕیت یاخود (دوایانبخەیت) بۆ دوای بردنەوەی یاریەکان. لێرەوە تۆ هەرچی بیت، تۆ هەر کێ بیت، دەتوانیت داخڵ بە یاریەك ببیت کارا و فاعیلانە بەرەو بردنەوە بڕۆیت.

بەپێی تیۆری کێڵگە، واتە بەپێی بوردیۆ، تۆ تا ئەو کاتەی هەیمەنەت لەسەر کراوە، تا ئەو کاتەی کە موعارەزەیت، تا ئەو کاتەی کە تەنیا یاریزانیت، توانای گۆڕینی گرەوەکان و بەرژەوەندیەکانی نێو کێڵگەت نییە، توانای پراکتیککردنی ستراتیژیەتە –تەئجیلکراوەکانی– خۆتت نییە، بۆیە مەحکومی بەو گرەو و بەرژەوەندیانەی کە بۆت دیاری کراوە نەك خۆت دیاریت کردوون. بەڵام لەو چرکەوەی کە یاریەکە دەبەیتەوە، لەو چرکەوەی کە لە کەسێکی هەیمەنە لەسەر کراوەوە دەبیت بە کەسێکی هەیمەنەدار، واتە لە موعارەزەوە دەبیت بە دەسەلات، ئیتر شەرعیەتی گۆڕینی گرەوو بەرژەوەندیەکانت دەکەوێتە دەست، تۆی کە هەیمەنە دەکەیت، تۆی کە دەگەڕێیتەوە بۆ پراکتیککردنی ستراتیژیەتە (دواخراوەکانت). ئەم یاریزانە کەسێکە کە دەیەوێت لە خۆی و لە یاریەکان تێبگات، کەسێکە کە لە زۆر کاتدا دەکرێت بڵێم واقع وەك ئەوەی هەیە دەیبینێت، نەك وەك ئەوەی خەیاڵی دەکات. (بەشی دووەم. ستراتیژیەتە دواخراوەکانی حیزبی شیوعی و یەکگرتووی ئیسلامی دەخەمە ژێر تێبینیەوە.)

## تیۆری ئەبیتیوس

کۆنسێپتی ئەبینتیوس لە نێو بونیادی تیۆری بوردیۆدا وەك میحوەر تەماشا دەکرێت، لەو چرکەدا کە ئەو تۆڕەکانی نێوان ئەو شتانەی کە بە تاکەوە نووساون و ئەو شتانەی کە بە کۆمەڵەوە نووساون بە ئێمە دەناسێنێت، دەیەوێت پێمان بڵێت کە ستریوکتیورە ناوەکیەکانی خود و ستریوکتیورە دەرەکیەکانی بابەت دوو دیوی یەك مەسەلەن. بەدەر لە کۆنسێپتی ئاوارەبوون لە بەرانبەر سروشتدا و دوور لە جەنگی نەفی کردنی دوو جەمسەر، ئەم دوو ستریوکتیورە دوو دۆخی یەك "ڕیالێتی" واقیعن و لە ڕەحمی یەك مێژووەوە دێنە دەرەوە.

ئەم ڕەهەندە لێکدانەوەو شیتەڵکردنی زۆر جیاوازتر دەخوازێت، چونکە کارکردنێکی تر و بە ڕێگاچوونێکی تر و بوونیادێکی تیۆری تەواو جیاوازتر لەو ڕەهەندەی تر کە عائیلەویترە و لەسەر بەڵگەنەویستە سەرەتاییەکانی ئەکتەرێکی

كۆمەڵایــەتی خــۆی دادەمــەزرێنێت. ئەكتــەرێك كــە ســتراتیژیەتەكانی خــۆی لــە نێــو ئــەو گرفتانــەدا دەدۆزێتەوە كە بەردەوام پشت بە دەرەوە دەبەستن و لەســەر دەرەوە كــار دەكــەن. كــە دەڵێــم دەرەوە، مەبەســتم هــەموو ئــەو شــتانەیە كــە لــە دەرەوەی مرۆڤێكــــدا دەجوڵێــــن. "وەك سۆســـیۆلۆژی ئۆرگانیزاسـۆنی سۆسـیۆلۆگ میشـێل كخـۆزیٛ[15]". سـەرەتا دەبێـت ئـەوە بڵێـم بوردیـۆ لـەبری زاراوەی ئەكتـەری كۆمەڵایەتی، زاراوەی فاعیلی كۆمەڵایـەتی بەكاردەهێنێت.

**ئەكتـەری كۆمەڵایـەتی / فـاعیلی كۆمەڵایـەتی** (*Acteur social / agent social*):

بـۆ بوردیـۆ زاراوەی فـاعیلی كۆمەڵایـەتی، بـە قــەدەر ئــەوەندەی بــەرەو دەرەوە دەڕوات لەســەر ناوەوەش كار دەكات.

دەرەوە / ناوەوە (*Exterieur / Interieur*):

لە سیستمی كارایی و هەست و بیركردنەوە بە شێوەیەكی دیاریكراوی بەنێویەكداچوو، ئەبیتیوس دێت و دەردەكەوێت، بەڵام زیاتر لـە ڕێگـای مانـای عەمەلیـەوە، واتــە لــە ڕێگــای دەســەڵاتی جــوڵان و پاڵەپەســتۆو ئــەو مەكانەتانــەی لــە نێــو پانتــایی كۆمەڵایـەتیدا و، لۆژیكی كێڵگـەدا هـەن، ئـەبیتیوس دێتو لە جوانترین حاڵەتەكانیدا دەردەكەوێت. ئێمە لـە ڕێگـای ئەبیتیوســەوە دەتوانـین بـەهێزتر كلیـك لەسەر تایبەتمەندیەتەكانی هەر ناوەندێك بكەین و لە پەیوەندی نێوان چینە جیاوازە كۆمەڵایەتیەكانی هەر كۆمەڵگەیەك بگەین.

چەمكی ئەبیتیوس بە سەرهەڵدانی لە تیـۆری بوردیۆیدا مەسارێكی تری وەرگرت. ڕاستە وشەكە وەك وشـە نـەگۆڕاوە، بـەڵام لـە ڕووی بـەكارهێنانی تیۆریـەوە بەشێوەیەكی تـەواو گۆڕاوەو بـاركراوە لـە چەندین مەدلول و مانای جیاتر.

**-لە نێوان ئەبیتیوس و ئەبیتیود[16] دا:**

كۆنســـێپتی ئـــەبیتیوس مۆڵـــەتی ئـــەوەمان پێـدەدات هــەندێك جـار دەنگـەكان بـەجۆرێكی دی بخوێنینەوە، دەمەوێت بڵێم هەندێك جار لە چركەی گوێگرتنـدا لـە بانگـەكانی ئەبیتیوسـدا گوێمـان لـە هەناســەكانی، لــە چرپــەی پێــی، لــە هاژەهــاژی ئــەبیتیود دەبێــت. تەنانــەت ئــەو جێگایانــەی هــەندێكجار ئــەبیتیود كلیكیـان لەســەر دەكــات، دەبینــین دۆســیەكانی ئــەبیتیوس یــەك بەیــەك دەكرێنەوە.

جارێكی دی هـەوڵدەدەم ئاسـانتر پێناسـەیەكی ئەبیتیوس بخەمـەوە ڕوو، بـۆ ئـەوەی بتـوانم خوێنـەر زیاتر لەگەڵ خۆمدا ڕاكێشمە نێو بابەتەكەوە:

ئەبیتیوس هەموو ئەو شتانەیە كە هەمانە، ئەو شــتانەی كــە بــەنێو جەســتەی كۆمەڵایــەتی و فەردیماندا درێژبوونەتەوەو لەگەڵماندا بە بەردەوامی دەمێننــەوەو شــكڵێكی هەمیشــەییان بــۆ خۆیــان وەرگرتووە.

لــێرەدا دەبینــین ئــەم كۆنســێپتە پێمــان دەڵێــت هــەموو ئــەو شــتانەی كــە نوســاون بــە مێژووی فـەردەوە، دەبنـەوە سـەرچاوەی مـن، بـەڵام زۆر جــار لــێرەدا دەگوترێــت بۆچــی لــەبری زاراوەی ئەبیتیوس زاراوەی ئەبیتیود بەكارنەهێنین؟ ئــــەبیتیود خۆبــــەخۆ وەك دووبارەكردنــــەوە، وەك میكـانیك، وەك بەرهەمهێنراو نـەك بەرهەمهێنـەر وێنــــا دەكرێــــت، بــــەڵام بــــە پێچەوانــــەوە ئـەبیتیوس بەهێزانــە و بــەردەوام لــە دۆخێكــی دروســتكردن و بەرهەمهێنانداپـە. بەرهەمهێنەرێكـە هەمیشـە بـەلای لۆژیكـی ئامـانجێكی مەرجگـەرایدا دەیشكێنێتەوە. هەر لێرەدایە ئەبیتیوس دەكەوێتـە بــــــەر شــــــاڵاوی تەحەولاتەكانــــــەوە "تخانسفۆخماسیۆن"[17].

ئـه‌م پرۆسـه‌یه ناچارمـان ده‌كـات بـه‌وه‌ی ئێمـه مه‌رجـه كۆمه‌ڵایه‌تیـه‌كانی خۆمـان لـه‌و شـتانه‌ی به‌رهـه‌ممان هێنـاون، سـه‌رله‌نوێ به‌رهـه‌م بێنینـه‌وه. واته لێنه‌گه‌ڕێین به‌رهه‌مهێنراوه‌كانمان ئاسوده‌و هێور بژین بۆ بۆگه‌ن كردن، به‌ڵكو له هـه‌ناویاندا ده‌بێـت ده‌ستبه‌كار بكه‌ینه‌وه‌و سه‌رله‌نوێ بیانخه‌ینه‌وه گه‌ڕ، بۆ ئه‌وه‌ی له جوڵه‌یه‌كی به‌رهه‌مهێنانی بێوه‌ستاندابن.

به‌ڵام ئه‌وه‌ی لێره‌دا گرنگه بریتیه له چاوه‌ڕوان نـه‌كردنی ئۆتۆماتیكـاندنی شـته‌كان. واتـه ئـه‌و ته‌حه‌ولاتانه به شێوه‌یه‌كی میكانیكی ئه‌نجام نادرێن، به‌ڵكو لـه‌و جێگایـه‌وه ده‌ڕژێنـه نێـو ماڵه‌كه‌تـه‌وه كـه چاوه‌ڕوان ناكه‌یت. هه‌موو ئه‌مانه ده‌كه‌نه ئه‌وه‌ی ئێمه نـاتوانین هـه‌روا بـه ئاسـانی و ماشـێن ئاسـایی، لـه وشـیاری "مه‌رجـه‌كانی به‌رهه‌مهێنانـه‌وه" بـه‌ره‌و "وشـیاری به‌رهه‌مـهێنراوه‌كان" هـه‌نگاو بنێـین. ئـه‌م توانایـیه‌ی هـه‌نگاونانیش فیتری نییـه، به‌ڵكو لـه نێو مێـژودا دروست ده‌بێت. هـه‌ر لـێره‌دا ده‌تـوانم بڵێـم، ئه‌بیتیوس ئه‌و پرانسیپه داهێنه‌رانه‌یـه كـه به‌قـه‌ده‌ر ئه‌وه‌نده‌ی له نێـو مێـژودا دروسـت ده‌بێـت، هـه‌وڵی هاتنـه ده‌ره‌وه‌ش ده‌دات لێـی. بـه‌بۆچوونی مـن پـه‌رادۆكسـی "موفاره‌قـات"ی ئـه‌بیتیوس لـێره‌وه ده‌ست پێده‌كات.

نـاواندنی ده‌ره‌وه ڕێگـا بـۆ هێزه‌كـانی ده‌ره‌وه خۆشده‌كات خۆیان مومارەسه‌ی خۆیان بكه‌ن، به‌ڵام بـه‌پێی لۆژیكـی ئۆرگانیسـمێك كـه ئـه‌وان تیـایدا به‌رجه‌سته ده‌بنـه‌وه، ئه‌مـه‌ش سیسـتیماتیكانه نـه‌ك میكانیكانه. سیستمێك كه ده‌ستمان لێی گیربووه‌و خاوه‌نی نه‌هجێكی زاوزێكاره. لێره‌دایـه ئـه‌بیتیوس توانـای به‌رهه‌مـهێنانی ئـازاد وه‌ك مـه‌دالیای شـه‌ره‌ف ده‌دات به هه‌موو فیكرێك، به هه‌موو پێشوازیكردنێك، به هـه‌موو جوڵانێك كـه خۆی تۆمـار ده‌كـات لـه نێـو سـنووره‌كانی پابـه‌ندبوون بـه دۆخـه تایبه‌تـه‌كانی به‌رهه‌مهێنانه‌وه.

ته‌نها ئـه‌و كاتانـه‌ش گرانـه بـۆ ئێمـه له‌گـه‌ڵ ئه‌بیتیوسـدا بدوێـین كـه بڕۆینـه نێـو ئایدیۆلۆژیـه ڕۆتینیـه‌كان و ئه‌لته‌رناتیڤه داخراوه‌كانـه‌وه، چونكـه ئـه‌بیتیوس خـۆی لـه خۆیـدا تواناییه‌كـه بێكۆتـایی، تواناییه‌كـه كـه ده‌بێتـه مامـانی هـه‌موو ئازادیـه‌كان، ده‌بێتـه كۆنـترۆڵی هـه‌موو به‌رهه‌مـه‌كانی فیكـر و وێناكردن و ئه‌زموون.

**-ئه‌بیتیوس له نێوان تاك و چین دا :**

لـه سـاتی گفتوگۆكـردن له‌سـه‌ر ئـه‌بیتیوس، نـاتوانین سـوچگیری بكـه‌ین لـه وروژاندنـی په‌یوه‌ندیه‌كانی ئه‌م كۆنسێپته به‌هه‌ر یه‌كێك له چین و تاكـه‌وه. گـه‌ر بڕیـار بێـت ئـه‌بیتیوس ئـه‌و فلتـه‌ره ناوه‌كیه بێت كـه پێشـوازی ده‌كـات لـه هـه‌موو ئـه‌و شتانه‌ی كه له ده‌ره‌وه دێن بۆ ئه‌وه‌ی بیانپاڵێوێت و ته‌حلیلیان بكات و سـه‌رله‌نوێ تـه‌ركیبیان بكاتـه‌وه، گه‌ر بڕیار بێت ئه‌بیتیوس ئه‌و ده‌زگا ناوه‌كیه بێت كه چاودێری هه‌موو ئه‌و په‌لامارانه ده‌كات كه له ده‌ره‌وه دێن، بۆ ئه‌وه‌ی كۆنترۆڵیان بكات و ناسـنامه‌كانیان بخوێنێته‌وه‌و دواتر له به‌حره‌كانی خۆیدا بیانشوات و سـه‌رله‌نوێ بـه‌و شـێوه‌یه‌ی خـۆی ده‌یـه‌وێت بیانهێنێتـه‌وه دونیا، گه‌ر ئـه‌بیتیوس هـه‌موو ئه‌مانـه بێت، كه‌واته ده‌كرێت بـه چ جۆرێـك لـه ئه‌بیتیوسـی تاك و چین تێبگه‌ین؟

بوردیۆ له وه‌ڵامی پرسیارێكی وادا ده‌ڵێت:

"گـه‌ر ئـه‌وه بـه دوور بزانین كه ئـه‌ندامانی یـه‌ك چینـی كۆمه‌ڵایـه‌تی، یـه‌ك جـۆر ئـه‌زموون به‌یـه‌ك ته‌رتیبه‌وه به‌رهه‌م بێنن، ئه‌وه ده‌بێت لامان ڕوون بێت كـه ئـه‌ندامانی دوو چینـی جیـاوازی كۆمه‌ڵایـه‌تی، كه‌متر شانسـی ئه‌وه‌یان هه‌یـه یـه‌ك ئـه‌زموون به‌یـه‌ك ته‌رتیبه‌وه بێننه به‌رهه‌م"[18]. واتـه ئه‌گـه‌ر شانسـێك هـه‌بێت بۆ ئـه‌وه‌ی گروپێك لـه به‌شـه‌ر، یـه‌ك ئـه‌زموون به‌یه‌ك ته‌رتیبه‌وه بهێننه به‌رهه‌م، واته ببن به خاوه‌نی

یەك ئەبیتیوس، ئەوا ئەو شانسە لە نێو ئەندامانی یەك چینی کۆمەڵایەتیدا زۆرتر دەبینرێتەوە، تا دوو چینی لەیەك جیاواز. لێرەوە ئەو ئەزموونەی کە کوڕە جوتیار و کوڕە شوانێك دەیهێننە بەرهەم، چ وەك تەرتیب و چ وەك جۆر، ئەزموونەکەش بەشێوەیەکی تەواو جیاوازە لە ئەزموون و تەرتیبکردنی ئەزموونەکانی کوڕی پیاوێکی سەر بە چینێکی سیاسی یان ئابووری.

هەر "سیستمێکی دۆخ" لەو چرکەیەدا کە دەبێت بە موڵکی تاك، دەکرێت بە بونیادێکی جیاواز لە بونیادی تاکەکانی تر تەماشابکرێت، چونکە ئەم جۆرە لە "سیستمی دۆخ" هەرچەند لە نێو چینیشدا بێت، بەشێوەیەکی فەردانی گوزارشت لە خۆی دەکات و ڕێچکەکانی خۆی پێشنیار دەکات. شێوازی تاك واتە شێوازی تایبەتگەرا کاتێك کە دەبێتە هەڵگری هەموو ئەو ئەبیتیوسانەی کە هەیەتی، هیچ نییە تەنیا جاڕدانی دورکەوتنەوەیەکی توند نەبێت لەو شێوازەی کە قۆناغێکی زەمەنی یان چینێکی کۆمەڵایەتی دەیگرێتە بەر. هەروەها پرانسیپی سەرتاپای ئەو جیاوازیانەی کە لە نێوان ئەبیتیوسی تاکەکاندا هەیە، دەگەڕێتەوە بۆ "تاکاندنی"[19] هەر یەکێك لەو مەسارە کۆمەڵایەتیانەی کە دواتر جڵەوەکانی "سنووراندن"[20] دەگرنە دەست. ئەبیتیوس هەر چرکەیەك پێشوازی لە ئەزموونێك، بونیادێك، ڕوداوێك، تێبینیەك، شالاوێك دەکات و لە هەمان چرکەشدا و لە ناوەوەی تاکدا، ئەم ئەزموونە دەگۆڕێت و تەحەولی پێدەکات بۆ ئەزموونێکی تر و لە ناوەوەی تاکەوە بۆ دەرەوەی فڕێدەداتەوە. ئەم بونیادە لە ناوەوە دەگاتەوە بە ستریکتیورێکی تر و بە دەرەوەی دەبەخشێتەوە. لێرەوە تاك بە قەدەر گەورەیی دەسەڵاتی ڕەنگ کردن "پێشوازی لێکراوەکان" بە جۆراوجۆر ڕەنگ دەکاتەوەو بە دەرەوەیان دەبەخشێتەوە.

بوردیۆ پێی وایە گەر لە ساتێکدا مومکین بێت لەسەر ئەبیتیوسی چین قسە بکەین، تەنیا ئەو کاتەیە باوەڕ بە جیاوازی و لەیەکچوونی ئەبیتیوسی تاکەکانی نێو چین بکەین. واتە جیاوازیەکان، ئەبیتیوسی تاك وەك کۆتەرە دەخەنە سەر ئاو، هاوکات لەیەکچوونەکان پێمان دەڵێن شتێکیش هەیە بە ناوی ئەبیتیوسی چین کە دواتر دەسەڵاتێکی بەهێزی "سنووراندن" دەگرێتە ئەستۆ.

**-ئەبیتیوس و ئەزموونە سەرەتاییەکان.**

ئەزموونە سەرەتاییەکانی هەر مرۆڤێك قورسایی و کارایی و جەرەس و ڕەنگ و دەنگی تایبەتی خۆیان هەیە، ئەم ئەزموونانە مرۆڤ دەکەن بە مەیدانی ڕمبازێنێکی ئەبەدی، چونکە بەردی بناغەی ئەبیتیوسی هەر مرۆڤێك لەلایەن ئەم ئەزموونە سەرەتاییانەوە دادەنرێت. جگە لەوەش، هەردوو ستراتیژیەتی "بەردەوامی" و "بەرگری" لای ئەبیتیوس ئەو ئارەزووە شێتانەیە کە ئەم ئەزموونانە دەیوروژێنن. بەبێ ئەم دوو ستراتیژیەتە ئەبیتیوس هەرگیز ئەو دەسەڵاتەی نابێت کە هەڕەشەکانی بە چەپ و راستدا دابەش بکات، هەربۆیە هەموو چرکەیەك چاوێکی لەسەر دونیایە و چاوەکەی تری لەسەر ئەم دوو ستراتیژیەتەیە.

گەمەی نێوان "زانیاریەکان" و "زانیاریە تازەکان" و ئەبیتیوس لێرەوە دەست پێدەکات، ئەویش بەم شێوەیە: ئەم دوو ستراتیژیەتە دەبنە ئەو دوو هێزەی کە ئەبیتیوس وەك قەڵغان لەبەرانبەر هەموو هێرشەکانی دەرەوەدا ڕایان دەگرێت. کاتێك دەڵێم هێرشەکانی دەرەوە، مەبەستم لە هەموو ئەو زانیاریە تازانەیە کە لە دەرەوە دێن و ڕوودەکەنە ئەبیتیوس. واتە هەر زانیاریەکی تازە، هەر

ئەزموونێکی نوێ، گەر بێت و ئەزموونە سەرەتاییەکانی بەشەرێك بخەنە ژێر پرسیار و هەڕەشە و مەترسیەوە، دەستبەجێ ئەو ئەزموونە یان ئەو زانیاریە تازەیە، لە لایەن ئەبیتیوسەوە دەکەوێتە بەر نەفرەت و ڕەتدەکرێتەوە.

ڕونتر بڵێم، کاتێك ئەزموونێکی تازە یاخود زانیاریەکی تازە، وەك ئۆپۆزیسیۆنێك دێت و ئەو زانیاریە سەرەتاییانە و ئەو ئەزموونانەی کە ئەبیتیوسیان لێپێکهاتووە، دەخاتە ژێر ڕەخنەو تیربارانەوە، ڕاستەوخۆ لە لایەن ئەبیتیوسەوە ئەو ئەزموون و زانیاریە وەك شەیتانێك ڕەجم دەکرێتەوە. بۆ نموونە:

ئەبیتیوسی پیاوێکی موسوڵمان بە هیچ شێوەیەك ئەوە قبوڵ ناکات کچەکەی لەگەڵ کوڕێکی مەسیحیدا خێزان پێکبهێنێت، چونکە ئەم ئەزموونە تازەیە هەڕەشەیەکی ڕاستەوخۆیە لە سەرجەمی ستراتیژیەتی ئەو ئەزموونە سەرەتاییانەی کە ئەمیان لێ دروست بووە. ئەمە کوفرێکی گەورەی وایە کە ئەبیتیوس هەرگیز لێی خۆش نابێت. نموونەیەکی تر:

بۆ ئەبیتیوسی کۆمەڵگەی کوردی، کچێکی ئەوروپی بریتیە لە چی؟

بریتیە لە مەخلوقێکی بێ مۆراڵ و کائینێکی سۆزانی و مرۆڤێکی شەڕواڵ پیس. کاتێك کوڕە کوردێك دێت و لەگەڵ ئەم کچەدا خێزانێك پێکدەهێنێت، ئیدی کۆی ئەم ئەبیتیوسە دەکەوێتە چاو زیتکردنەوەو ڕەفزکردن و هەڕەشە و تا دەگاتە فەتواو شتی گەورەتریش. ترسناکی و وەحشیەتی ئەبیتیوس ئالێرەوە دەستپێدەکات، ڕەنگە زیادەڕەوی نەکەم گەر بڵێم، کۆمەڵگە و چین و تاکەکان بە درێژایی مێژو هیچ نین جگە لە قوربانی ئەبیتیوس، جگە لە قوربانی ئەم دەسەڵاتەی کە دواتر هەموو سنورەکان بۆ تاك و بۆ چین و بۆ کۆمەڵگە دیاری دەکاتەوە.

ئەبیتیوس ئازادی بەو خەونە دەزانێت کە هەرگیز پێی ناگەین، سەربەخۆیی ئەو بەهەشتەیە کە هەرگیز تێی ناچین. لەبەردەم ئەبیتیوسدا ئێمە هەموومان کۆیلەین. ئەوە ئێمە نین کە پێشوازی دەکەین لەو زانیاریانەی لە دەرەوە دێن، ئەوە ئێمە نین کام زانیاری قبوڵدەکەین و کام زانیاری ڕەفز دەکەین، ئەوە ئێمە نین ستریوکتیورەکان تەرکیب دەکەینەوە، ئەوە ئێمە نین بە فڵچەکانمان لە ناوەوە ڕەنگاو ڕەنگ دەکەینەوەو دیدەینەوە بە دەرەوە، ئەوە ئێمە نین ناواندنی دەرەوەو دەرەواندنی ناوەوە دەکەین، ئەوە تەنیا ئەبیتیوسە هەموو ئەم ئۆپاسیۆنانە ئەنجام دەدات و بە ئێمەش دەڵێت: ئێوە چەند سندوقێکی خەزنکردنن و هیچی تر!

لە بەرانبەر ئەبیتیوسدا قسەکردن لە ئیختیار و ئازادی، قسەکردنێکی تەواو بێ مانایە. لێرەدا بۆ تێگەیشتنێکی زیاتر، پێویستە ئاماژە بە جیاوازی نێوان ئەبیتیوس و ئەبیتیود بدەمەوە: ئەبیتیود بریتیە لە کۆی بەرهەمەهێنراوەکان، لە عادەت و تەقلید و باو و نەریت، لە کولتور. بە پێچەوانەوە ئەبیتیوس پانسیپێکە بۆ هەڵوەشاندنەوەو پێکهێنانەوەی بەرهەمهێنراوەکان، فلتەرێکە بۆ کۆنترۆڵکردنی پێشوازی لێکراوەکان، دەسەڵاتێکە بۆ سەپاندنی سنور و مەرجەکان. جوتیارێکی دەشتی شارەزور و مامۆستایەکی زانکۆی لیۆن و فەیلەسوفێك و نەخوێنەوارێك، وەك یەك لەلایەن ئەبیتیوسەکانیانەوە حوکوم دەکرێن و سنورەکانیان بۆ دیاری دەکرێت و مەرجەکانیان بەسەردا دەسەپێنرێت.

فەیلەسوفێك کاتێك یاخی دەبێت لە ئەبیتیود، واتە لە کولتورێك، لە ڕوداوێك، لە یاسایەك، ئەم

یاخیبوونەی ئیختیارێكی پڕ و ئازادیەكی تەواوی بەدواوە نییە، چونكە مەحكومە بەو مەرجانەی كە لە لایەن ئەبیتیوسەوە بەسەریدا دەسەپێنرێت. یاخیبوونەكەی لە سەربەخۆییەكی تەواوەوە نایەت، چونكە دواتر لەو سنورانەدا بەندە كە ئەبیتیوس بۆی دیاری دەكەن.

ئیسلامیەك كاتێك بڕیاری كافربوون و كوشتنی چەپێكی كوردی دەدات و چەپێكی كوردی كاتێك بڕیاری كۆنەپەرستی و جاهیلیەتی ئیسلامیەكی كورد دەدات، دەبێت بۆ تێگەیشتنی هەر یەكێك لەم دوانە، لە بڕیاردان و تاوانباركردنیان دور بكەوینەوە. دەبێت نە ئەو تاوانبار بكەین بە كافر نە ئەمیش بە كۆنەپەرست، بەڵكو دەبێت لە ئەبیتیوسی هەر یەكێك لەم دوانە تێبگەین، چونكە هەر یەكێك لەم دوانە دیلن. ئەوە ئەبیتیوسەكانیانە كە شتەكانیان بە تەركیب دەكاتەوەو دەیانداتەوە دەستیان، ئەوە ئەبیتیوسە لاپەڕەكانی قورئان و حەدیس بۆ ئیسلامیەك هەڵدەداتەوەو پێی دەڵێت بەم جۆرە بخوێنەو بەم جۆرە بیر بكەرەوە. ئەوە ئەبیتیوسە بە برایەكی پشتیوانانی ئیسلام دەڵێت: بڵێ برایەكی یەكگرتوی ئیسلامی موشریكە، چونكە بڕوای بە دیموكراسیەت هەیە. هەر ئەبیتیوسە بە برایەكی یەكگرتوو دەڵێت: باوەڕت بەوە هەبێت بزوتنەوە كۆمەڵێك شێت دەیبات بەڕێوە. هەمان ئەبیتیوسە كە بە مام جەلال دەڵێت: تۆ عێراقیت پێش ئەوەی كورد بیت. یان بە كاك مەسعود دەڵێت متمانە بە دوژمن دەكرێت، بەڵام بە تاڵەبانی ناكرێت. نە كاك مەسعود و نە مام جەلال، نە براكەی بزوتنەوەو نە براكەی یەكگرتوو، نە تۆ و نە من و نە ئەوان، خاوەنی ئیرادەی سەربەخۆ و ئازادی تەواو نین، هەر یەكێك لە ئێمە بە جۆرێك لە جۆرەكان و بە ئاستێك لە ئاستەكان دیلین.

—ماویەتی—

## بوردیۆ لە چەند دێڕێكدا

*1930* لە یەكی ئووت بوردیۆ لە شاری دۆنگا لە ناوچەی ئووتپیرنێ لەسەر سنووری فەرەنسا – ئیسپانیا لەدایك بووە.

*1941–1947* خوێندنی ناوەندی و ئامادەیی لە خوێندنگەی لیسێ دوو پۆ تەواو كردووە.

*1948–1951* بەپێی یاسای ئەو سەردەمەی خوێندن ناوەندی ئامادەیی خوێندۆتەوە.

*1951–1954* خوێندنگە ئاسایی باڵا كە ئەگەر پلەی زۆر بەرزت نەبێت وەرتناگرێت.

*1954* پلەی مامۆستایەتی لە فەلسەفەدا بە دەست دەهێنێت.

*1954–1959* لە ئامادەیی موولان دەبێت بە مامۆستا.

*1960–1961* مامۆستای سەرەتایی لە كولیەی ئەدەب لە پاریس.

*1961–1964* مامۆستا لە كولیەی ئەدەب لە شاری لیل

*1962* لە دووی نۆڤەمبەر لەگەڵ ماغی كلێغ بغیزاغد ژیانی پێكەوە دەنێت.

*1964* بەڕێوەبەری خوێندنی باڵا لە زانستە كۆمەڵایەتیەكاندا.

*1964–1984* وەك مامۆستا لە خوێندنگە ئاساییە باڵاكاندا وانەی وتوەتەوە.

*1964–1992* بەڕێوەبەری كۆلێكسیۆنی مانای هاوبەش بووە.

*1975* بەڕێوەبەری گۆڤاری كردەی لێكۆڵینەوە لە زانستە كۆمەڵایەتیەكاندا بووە.

*1980* پشتگیری دەكات لە كۆلیوش كە خۆی پاڵاوتبوو بۆ سەرۆكایەتی وڵات. بەڵام هێشتا لەدایك نەبووبوو لە باریان برد.

*1981* لە سیازدەی دێسەمبەردا بوردیۆ و میشیل فوكۆ پێكەوە هاوارێك بەرز دەكەنەوە لە دژی جەنگ لە پۆلۆنیا و ئەو هاوارە لەو كاتەدا سەدایەكی گەورەی هەبوو.

*1982* مامۆستای سۆسیۆلۆژی لە کۆلێژ دوو فرانس.

*1984* وتارێك لەسەر میشێل فۆکۆ بڵاو دەکاتەوە کە بە هۆی ئایدزەوە کۆچی دوایی دەکات. کەم نەبوون ئەوانەی دەیانویست لەو کاتانەدا لەسەرمایە ڕەمزیەکەی فۆکۆ بدەن، بەڵام بوردیۆ بەو وتارەی کە لە ڕۆژنامەی لۆمۆندا بڵاوی کردەوە زۆرێك لەو دەنگە نازوڵاڵانەی بێدەنگ کرد و سەرمایە ڕەمزیەکەی فۆکۆی لەو تیربارانە پاراست.

*1988* بەرگری لە پرۆژەی سەرەك وەزیران دەکات.

*1989–1990* پشتگیری دەکات لە پرۆژە پەروەردەییەکەی سەرەك وەزیران میشێل ڕۆکار.

*1993* مەدالیای زێڕی سەنتەری ناسیۆنال بۆ لێکۆڵینەوەی پێدەدرێت.

*1995* چواری دیسەمبەر، لە دژی نەخشەکەی ئالان ژوپێ هاورێك لە ڕۆشنبیران دەکات بۆ ئەوەی بەشداری مانگرتنەکان بکەن و خۆیشی ڕاستەوخۆ بەشداری دەکات و ئیمزای دۆسیەی دژە ژوپێ دەکات.

*1995* دوازدەی دیسەمبەر، لە شاری لیۆن سەرلەنوێ بەشداری مانگرتنێکی تر دەکاتەوە لە بەردەمی مانگرتووەکانی وێستگەی شەمەندەفەری لیۆندا هاوار دەکات: من لێرەم بۆ ئەوەی هاودەنگی خۆم دووبارە بکەمەوە بۆ ئەو مانگرتوانەی کە سێ هەفتەیە مانیان گرتووە و ململانێ دەکەن لە دژی خەراباتەکانی ئەم شارستانیەتە.

*1996–1997* بەرگری دەکات لە سەلمان روشدی کە خومەینی فەتوای کوشتنی دەرکردبوو.

*1998* بابەتێکی یەکجار گرنگ بە ناوی (لە پێناوی چەپێکی چەپدا) بڵاو دەکاتەوەو تا ئێستاش دەنگدانەوەی هەیە، لەو نووسینەدا بە توندی ڕەخنە لە جۆسپانی چەپ دەگرێت و شرۆیدەر دەخاتە ژێر کۆمەڵێك پرسیارەوە.

*2000* بوردیۆ بەشداری گفتوگۆیەکی تەلەفزیۆنی لە کەناڵی پێنج ئارتێ دەکات و لە گەرمەی گفتوگۆدا ستۆدیۆ بەجێدەهێڵێت و دواتر شاشە بەوە تاوانبار دەکات کە مومارەسەی پەردەپۆش کردن دەکات.

*2001* لەگەڵ کۆمەڵێك ڕۆشنبیری تردا داوا لە پاریس دەکەن لیژنەیەك پێکبهێنێت، بۆ لێکۆڵینەوە لەو قەسابخانەیەی سوپای فەرەنسی لە جەزائیر ئەنجامی دابوو.

*2001* بیست و هەشتی مارس، بوردیۆ دوا وانەی لە کۆلێژ دو فرانس دەڵێتەوە.

*2002* بیست و سێی مانگی یەك، بوردیۆ بۆ هەتا هەتایەماڵئاوایی لێکردین.

لە ساڵی *1958* وە تا *2001* سی وحەوت کتێب و نامیلکەی بڵاوکردووەتەوە، جگە لە دەیان بابەت و لێکۆڵینەوە کە لە گۆڤار و ڕۆژنامەکاندا بڵاوی کردووەتەوە.

## پەراوێزەکان

*1-Maitres du monde, savez - vous ce que vous faites? Pierre Bourdieu.*

*Discours a la reunion annuelle du Conseil international du musee de la Television et de la Radio, le 11/10/1999.*

2- واتە ئیشکالیەت.

*3-Positions structures* دۆخە بوونیادنراوەکان

*4-Questions sociologie. Bourdieu. 1980.*

*5-doxa*

کۆمەڵێك بۆچوونی هاوبەش. مانای هاوبەش. بڕوای هاوبەش.

*6-La domination* هەیمەنە

*7-Iecon sur Iecon. 1982. Pp.46-47. Bourdieu*

*8-Reponses, Seuil, 1992, p.78 Bourdieu*

*9-Ia distinction. 1979. Bourdieu. P. 179*

*10*– هەمان سەرچاوەی پێشوو.

*11-Subjectivisme* زاتیەت – خودگەرایی

*12-Iespace conjoncturel des interaction*

پاناتییەکی کاتیی کارلێکردنەکان.

*13-objectivisme*

مەزهەبێکی سۆسیۆلۆژیە کە پشت بە بابەتاندن و مەوزوعیەت دەبەستێت و شتەکان بابەتیانە تەفسیر دەکات نەك زاتیانە.

*14-Ia srtategie:*

کۆی هەموو ئەو ئۆپراسیۆنانەیە کە پێکەوە گونجاون و بەرەو یەك ئامانج دەڕۆن.

*15*–بۆ شارەزایی زیاتر لەسەر ئەو سۆسیۆلۆژسەی کە کار لەسەر دەرەکیکردن و دەرکی بوون و دەرەکیاندن و دەرەکی گەرایی دەکات، دەتوانین بگەڕێینەوە بۆ ئەم کتێبە کە بۆ زۆربەی زمانە زیندووەکان تەرجەمە کراوە.

*Lacteur et Ie systeme. Les contraintes de Iaction collective.*

*M. Crozier et E. Friedberg. (points - Seuil. 1977)*

*16- Habitude*

دەتوانین بە داب و نەریت، بە عادەت، بە عورف تەرجومەی بکەین، بەلاَم من پێم باش بوو وشەکە وەك چۆن لە زمانی فەرەنسیدا هەیە بینووسمەوە، چونکە لە پەنای باسکردن لە ئەبیتیوسدا ئەبیتیود خۆی بۆ خۆی جەرەسێکی تایبەتی دەبێت.

*17-Transformation:*

ناتوانم ئەم وشەیە بە گۆڕان وەربگێڕم، چونکە گۆڕان شتێکی ترە، لە زمانی عەرەبیدا بە تەحەول وەرگێڕدراوە. لەبەر ئەوەی لە زمانی کوردیدا و لە ئێستای ئامادەدا وشەیەکم نەدۆزیەوە هەمان مانا بدات بە دەستەوە، بە هەردوو زمان عەرەبی و فەرەنسیەکە نووسیومە و ئومێد دەکەم دواتر چارەسەری ئەمجۆرە گرفتانە بکەین. هەروەها تێبینیەکی بچووك:

لە زمانی فەرەنسیدا بە "غ" نووتق دەکرێت ***R***.

*18-La sociologie de Bourdieu, Alain Accardo. P. 71.*

*19* –لە بەکارهێنانی ئەم وشەیەدا، مەبەستم بە هەموو ئەو پرۆسەیەیە کە شتە کۆمەلاَیەتیەکان فەردی دەکاتەوە.

*20* –واتە تەحدیدکردن، سنوردانان بۆ هەموو شتەکان.

## تێبینی

بەشی دووەمی ئەم لێکۆلێنەوەیە لە هەمان گۆڤاردا بلاَودەبێتەوە.

# دیالیکتیکی کۆمەڵگە و تاك

## سەرەتای میتۆد بۆ کردەی سۆسیۆلۆژی

د.فەیسەڵ سەعد

لە عەرەبییەوە: ڕۆشنا ئەحمەد

تاك بریتییە لە کۆمەڵگە، لەبەرئەوەی هەردوو تاك و کۆمەڵگە بریتین لە تاکێك لە کۆمەڵگەدا، بەمجۆرە دانپیانان بە تاك لەلایەن کۆمەڵەوە و هەروەها دانپیانان بە کۆمەڵ لەلایەن تاکەوە دەبنە بڕبڕەی پشتی پێویست بۆ دامەزراندنی دیموکراتی لەسەر بنەمای ئازادی، یاخود بۆ دامەزراندنی ئازادی لەسەر بنەمای دیموکراتی، واتە: جارێکی دیکەش بۆ دامەزراندنی دیموکراتی ئازادی و ئازادیی دیموکراتی. لەم ڕوانگەیەوە، دیالیکتیکی تاك و کۆمەڵگە شێوەیەکە لە شێوەکانی دیالیکتیکی ئازادی و دیموکراتی. ئەگەر ئازادی بریتی بێت لە مانای فەلسەفی دیموکراتیەت، ئەوا دیموکراتی بریتییە لە شێوەی سیاسی ئازادی. بەمجۆرە ئازادی بریتییە لە ناواخنی دیموکراتی و دیموکراتیش بریتییە لە شێوەی ئازادی، هەروەکو تاك کە ناواخنی کۆمەڵگەیە و کۆمەڵگەش شێوەی بوونی مرۆیی تاکە، یاخود بە دەربڕینی هیگڵ: "کۆمەڵگە واقیع بوونێکە لە بەواقیع بوونەکانی ئازادی".

ئازادی تاك بریتییە لە پرەنسیپی فەلسەفی بۆدامەزراندنی دیموکراتیەت، دیموکراتیش بریتییە لە چوارچێوە سیاسی - یاساییەك بۆ پراکسیس کردنی ئازادی تاك. ئەگەر لە ڕووی تیۆرییەوە دیموکراتیەت بەلایەنی کەمەوە لەسەر بڕیاری سیاسی یاسا دانراوەکان دابمەزرێت کە ویستی زۆربەی ژمارەی دانیشتوانی کۆمەڵگەیەك داینابێت، ئەوا ئازادی لەم ڕوانگەیەوە لەسەر چۆنیەتی ئەو بارودۆخەی ئەم یاسایانەیان داناوە دادەمەزرێت، چونکە ئەم یاسایە کە بە دەربڕینی (مۆنتسکیۆ)

بریتییە لە (ڕۆحی یاساكان)، ئەو یاسایەیە كە تاكە ئازادەكان دایدەنێن. لە كاتێكدا یاسا باڵادەستەكانی كۆمەڵگەی مانادار دەربڕینێكی یاساییە لە وویستی سیاسی دەسەڵاتداران لە كۆمەڵگەی سیاسیدا، لەبەرئەوەی ڕۆحی یاساكان بریتییە لە دەربڕینێكی فەلسەفی لە وویستی ئازادی تاكەكان لە كۆمەڵگەی مەدەنیدا.

بەم شێوەیە، دیموكراتیەت شێوەی بوونی كۆمەڵگەی سیاسییە، یان دەوڵەتە لە كۆمەڵگەی ماناداردا، یاخود شێوەی پراكسیس كردنی ئازادییە لە لایەن دەوڵەتەوە، ئازادی تاكیش بریتییە لە شێوەی بوونی مرۆڤ لە كۆمەڵگەی مەدەنیدا، یاخود شێوەی پراكسیس كردنی ئازادییە لەلایەن تاكی مرۆڤەوە لە كۆمەڵگەی مەدەنیدا. یاخود وەك (ماركس) دەڵێت: "تاكگەرایی شێوەی بوونی ڕاستەوخۆ و هەستپێكراوی مرۆڤە لە كۆمەڵگەی مەدەنیدا، بەڵام مرۆڤ لە دەوڵەتدا لە ژیانی تاكگەرایی ڕاستەقینەی خۆی داماڵراوەو بۆ گشتگیری ڕاستەقینە تایبەتكراوە[1]" بە مانای دەوڵەت وەك بەرجەستەكردنی سیاسی هەستپێكراو بۆ وویستی ئەوانەی باڵادەستن تیایدا، بڕیار لەسەر كاروبارە گشتییەكانی ژیانی تاكەكان دەدات، لە كاتێكدا كاروبارە تایبەتیەكانی ئەو كەسانە لە ناو كۆمەڵگەی مەدەنیدا كاروباری تایبەتن، واتە مەدەنیین. كەواتە بابڵێین: دیموكراتیەت مانای ڕێكخستنی سیاسی كاروباری خەڵكی دەگەیەنێت/ تاكە گشتییەكان لەسەر بنەمای كاروبارە مەدەنییەكان، یان كاروبارە تایبەتییەكان. لەم ڕوانگەیەوە دیالیكتیكی كۆمەڵگە و تاك بریتییە لە شێوەیەك لە شێوەكانی دیالیكتیكی دەوڵەت و كۆمەڵگەی مەدەنی، یاخود دیالیكتیكی دیموكراتی سیاسی و ئازادی تاكگەرایی مەدەنیەت.

ئەگەر دیالیكتیكی تاك و كۆمەڵگە، واتە ئازادی و دیموكراتی لەسەر كامڵ بوونیان (تەواو بوونیان) دابمەزرێت، ئەوا لەسەر دژایەتیشیان دادەمەزرێت، لەبەرئەوەی دیموكراتیەت دەربڕینی پێویستی كۆمەڵگەیە بە تاك، یان لە تاكدا، ئازادیش بەرگری تاك بۆ پێویستی كۆمەڵگە بۆ خۆی یان لە خۆیدا دەردەبڕێت. لەم ڕوانگەیەدا، دیالیكتیكی كۆمەڵگە و تاك بریتییە لە شێوەیەك لە شێوەكانی دیالیكتیكی پێویستی و ئازادی. یان وەكو (ئارسەر كیش) لەو بڕوایەدایە: "دیموكراتی دژایەتی نێوان بوونی كۆمەڵایەتی و بوونی تاكگەرایی دەردەبڕێت[2]".

ئەگەر ئازادی بریتی بێت لە ئاگایی پێویستی – لێرەدا پێویستی كۆمەڵگە – و پراكسیس كردنی ئەم ئاگاییە، واتە پراكسیس كردنی دیموكراتیەت، ئەوا دیالیكتیكی ئازادی و دیموكراتی وەك ڕوویەك لە ڕووەكانی دیالیكتیكی تاك و كۆمەڵگە بریتییە لە شێوەیەك لە شێوەكانی دیالیكتیكی تیۆری و پراكسیس كردنی. لەبەر ئەوەش كە دیالیكتیك لەسەر نێوەندبوونی نێوان لایەنەكانیدا دادەمەزرێت، ئەوا ئەو نێوەندبوونەی دیالیكتیكی تیۆری و پراكسیس كردنی لەسەر دادەمەزرێت بریتییە لە لێپرسراوێتی، كە لە هەمان كاتدا تیۆری و پراكسیس كردنە، واتە ئازادی ویست و ویستی ئازادی، بەو پێیەی پابەندبوونی زانستە بە تیۆرییەوە. بە گووتەی (كوسولابۆڤ ماركۆڤ): "لێپرسراوێتی لە یەك كاتدا ڕووی ئازادی و پێویستییە، لەوەدا كە بە كردە پابەندە لەسەر واقیع و مرۆڤایەتیەكەی، بە مانای داكشانی ڕووبەری پێویستی و هەڵكشانی ڕووبەری مرۆیی تیایدا. ئەویش لەسەر بنەڕەتی ئاگایی تیۆریی بە واقیع[3]".

لەبەرئەوەی پراكسیس كردن خۆماڵیكردنی ئاگایی تاك بە پێویست دەسەپێنێت، واتە گشتگیركردنی، ئەوا دیالیكتیكی ئازادی و دیموكراتی وەك ڕوویەكی دیكەی دیالیكتیكی تاك و كۆمەڵگە، دەبێتە شێوەیەك لە شێوەكانی دیالیكتیكی زانستی و ئایدیۆلۆژیا، تیایدا زانست ئازادییە و ئایدیۆلۆژیا دیموكراتییە. دیموكراتی لەم دیالیكتیكەی دواییدا مانای یەكسانی (هاوشێوەیی) دەبەخشێت، یاخود تەماهی ئایدیۆلۆژی تاكەكان دەگەیەنێت، ئازادیش تیایدا مانای جیابوونەوە (لە ڕێ لادان)ی مەعریفی – زانستی لە نێوان ئەو تاكانەدا دەبەخشێت – (ڕۆبەرت دال) بە ئەم مانایە دەڵێت: "یەكسانی مەرجێكی پێویستە بۆ دیموكراتی، تاوەكو كۆمەڵگە زیاتر دیموكراتی بێت، مەترسی لەسەر ئازادی گەورەتر دەبێت[4]". (فوئاد زەكەریا) لەم بارەیەوە ئاماژەی بۆ كردوە: "گەورەترین ئەو كارانەی مرۆڤایەتی لە دۆزینەوەو داهێنانە زانستی یان مەعریفیەكانی دیكەدا بە ئەنجامی گەیاندوە، لەسەر دەستی ئەو كەسانە هاتوونەتەدی كە ڕەتیان كردۆتەوە واز لە تاكگەرایی خۆیان بهێنن[5]". بە بۆچوونی (برجسۆن)یش: "ئازادی، داهێنان و دۆزینەوەو پێویستی دووبارە كردنەوەیە[6]". لەم ڕوانگەیەوە دیالیكتیكی جیابوونەوەی (لە ڕێ لادانی) زانستی و یەكسانی ئایدیۆلۆژی، واتە دیالیكتیكی ئازادی و پێویستی بریتییە لە دیالیكتیكی داهێنان و دووبارە كردنەوە. بەم شێوەیە جیاوازییە تاكگەراییەكانی نێوان خەڵكی بریتییە لە یاسای سروشت، بە مانای سوننەتی سروشت كە هۆكارێكی گرنگە لە هۆكارەكانی پێشكەوتنی كۆمەڵایەتی و تەكنیكی و ڕۆحی[7]. ئەگەر بوونەوەرە مرۆییەكان وەك دووانەیی یەك هێلكە لە یەكتر دەچوون، ئەوا بیرۆكەی یەكسانی هیچ سوودێكی نەدەبوو، ئەوەی بەهایەك بەم بیرۆكەیە دەبەخشێت جیاوازی نێوان تاكەكانە لە بوارە فرە ڕەنگەكاندا[8].

كامڵبوونی تاك و كۆمەڵگە لەسەر بنەمای جیاوازبوونیان لە چوارچێوەی پەیوەندی دیالیكتیكی نێوانیان، مەرجێكی پێویستە بۆ دامەزراندنی دیموكراتی لەسەر ئاستی ئەم پەیوەندییەدا، بەڵام جیاوازبوونی تاك و كۆمەڵگە لە دەرەوەی چوارچێوەی كامڵ بوونە دیالیكتیكەكەیان، دەست بەسەر مەرجی دیموكراتی لەسەر ئەم ئاستەدا دەگرێت، لەبەرئەوەی پەیوەندی دیموكراتی نێوان هەردوو لایەن مانای ڕەتكردنەوەی دیالیكتیكی یەكێكیانە لەلایەن ئەوی دیكەیانەوە، بە مانای هەریەك لە تاك و لە كۆمەڵگە بە هەر ڕادەیەك بێت ئەوی دیكەیانی لەخۆ گرتووە. ڕەتكردنەوەی كۆمەڵگە لای تاك، یان بە پێچەوانەوە، بە ڕەتكردنەوەیەكی نێگەتیڤ مانای بە شت بوونی لایەنە ڕەتكراوەكە دەبەخشێت و دواتر بەشت بوونی هەر یەكێكیان، شتی پێویستی ئەوی دیكەیانە، وەك (ماركس) دەڵێت: "ئامادەبوونی ئازادی مانای مەترسی مەرگی ڕاستەقینە بۆ مرۆڤی بوونەوەرو هەموو مرۆڤایەتی دەبەخشێت[9]". هەر لە دەركەوتنی كۆمەڵگەكان و كۆمەڵە مرۆییەكانەوە، لەسەر حسابی ئەو تاكەی خودی خۆی دەهێنێتە دی، كۆمەڵگە خۆی بەدیدەهێنێت. ئا ئەمەش نهێنی خاوبوونەوەی جووڵەی مێژووە لەسەر ئاستی مرۆیی، هەرچەندە لەسەر ئاستی تەكنەلۆژیدا جووڵەكەی خێرا دەكات. بە دەربڕینی (هنری لۆڤیڤەر): "ئەوەی پێویستە ئامانج بێت لە خودی خۆیدا، هێشتا تەنیا ئامرازێكە (ڕێبازێكە)، ئەوەش چالاكی مرۆڤی خوڵقێنەر و بەها و تاكگەراییەكەیەتی[10]". ئەگەر ئازادیش تاك

نەبووایە، ئەوا كەسێك نەدەبوو بیەوێت یان داوای بكات[11]. نابێت مرۆڤایەتی لە مرۆڤدا ببێتە ئامرازێك بۆ بوونە تاكیەكەی، كەواتە چۆن دەكرێت بۆ ئاستێك نزم بكرێتەوە كە تیایدا ببێتە ئامرازێك بۆ دەوڵەت یان بۆ چینێك یان بۆ میللەتێك[12]؟

ئێستا چین پێكهێنەرەكانی پەیوەندی دیالیكتیكی نێوان تاك و كۆمەڵگە، وەك پەیوەندییەكی بنەڕەتی لەو پەیوەندییانەی دیالیكتیكی كردەی دیموكراتی لەسەر دادەمەزرێت؟

پەیوەندی دیالیكتیكی نێوان تاك و كۆمەڵگە لەسەر مۆركی مرۆیی بۆ كۆمەڵ و مۆركی كۆمەڵایەتی بۆ تاك دامەزراوە، پەرەپێدانیش بەم پەیوەندییە لە هەمان كاتدا لەسەر قوڵ كردنەوەی ئەم دوو مۆركە دەبێت، بە جۆرێك هەریەكێكیان ببێتە روویەكی پێویست بۆ ئەوی دیكەیان، وەك (تۆگارینۆڤ) دەڵێت: "پەرەپێدان بە ئاگاداربوونی مرۆڤ لە تاكێتی خۆی مانای خولقاندنی ماوەی نێوان خۆی و نێوان بنەچە ئاژەڵییەكەی دەبەخشێت، ئەم ماوەیەش پەرەسەندنی رۆشنبیرییەكەی دەردەبڕێت[13]".

ئاگایی مرۆڤی تاك بە مەرجە كۆمەڵایەتیەكەی یەكسانییەكی لۆژیكییە بۆ ئەخلاقیەتی یان بابەتگەری ئازادییە تاكگەراییەكەی. بابەتگەری ئازادی تاكگەرایی مانای ئەوەیە مرۆڤ تاكێكە لەسەر بنەمای ئاگاداربوونی بە (ئەوانی دیكە)ی كەسانی دیكە سنوور بۆ ئازادییەكەی دادەنێت، بە جۆرێك وا درك دەكات و رێگا دەبڕێت كە ئەوانی دیكە (كۆمەڵایەتی بوو) بریتییە لە سنوورێكی ئەخلاقی بۆ خودی تاكگەرایی. بەم شێوەیە، دیالیكتیكی ئەخلاقی ئازادی تاكگەرایی یاخود ئازادی تاكگەرایی ئەخلاقی بریتییە لە پەیوەندی دیالیكتیكی نێوان ئازادی و نائازادی لە نێو چوارچێوەی خودی ئازادیدا، بە مانای نائازادی – پێویستی– بە هێزی ئەخلاقی ئازادی بەسەر ئازادیدا سەپێنراوە، نەك بە پێویستییەك كە لە دەرەوەیدا بێت. وەكو (هیگڵ) دەڵێت: "مرۆڤ ئازادی هەیە، چونكە لە بوونە تاكەكەیدا دان بە خودی خۆیدا دەهێنێت كە ئەو هەمەكی (گشتی) هەیە، واتە كۆمەڵگە[14]". (هیگڵ) لەمە زیاتریش دەڕوات، كاتێك دەڵێت: "مرۆڤی تاك لە رێگەی ئاگایی خودی هەمەكیەوە (گشتیەوە) نەبێت لە ناو خودێكی تاكگەرادا ناگاتە ئاگایی كەسایەتی[15]".

پێویستە لێرەدا ئاگایی تاكگەرایی و ئاگایی كەسایەتی لە یەكتر جیابكەینەوە، یان بە دەربڕینێكی دیكە ئاگایی تاك بۆ تاكگەرایی خۆی لە ئاگایی تاك بۆ كەسایەتی خۆی لە یەكتر جیابكەینەوە، ئاگایی تاكگەرایی مانای ئەوە دەبەخشێت مرۆڤ دەزانێت ئەو تاكێكە و لە خودی خۆیدا تاكگەرایە، بەڵام ئاگایی كەسایەتی، ئاگایی تاكگەرایی و ئاگاییەك لەخۆ دەگرێت كە تاك هەڵگری ئەو خاسیەتە تاكگەراییەیە كە ئامانجێكی كۆمەڵایەتی هەیە، بە دەربڕینێكی دیكە، ئاگایی كەسایەتی لە هەمان كاتدا ئاگایی تاكگەرایی (لە خودی خۆیدا) و ئاگایی گشتی كۆمەڵایەتییە (لە ناویدا) و ئەو گشتە كۆمەڵایەتیەش وەك سنوورێكە بۆی، واتە ئاگایی كەسایەتی لە یەك كاتدا بریتییە لە ئاگایی تاكگەرایی لەپێناو خۆیدا و لە پێناو ئەوانی دیكەدا. لەم روانگەیەوە ئازادی تاكگەرایی دەبێتە شێوەیەك لە شێوەكانی پێویستی، لەبەرئەوەی ئازادی تاك لەسەر ئاگاداربوونی تاك بە پێویستی تاك بە كۆمەڵ (یان لە ناویدا) دادەمەزرێت. وەكو سپینۆزا دەڵێت: "ئازادی چەوساندنەوەی تاكگەرا نییە، بەڵكو ئەو پێویستیەیە كە تاك دركی پێدەكات[16]". وە پیاوانی تاكڕەوانی مێژووش بە

بڕوای هیگڵ: "ئەو کەسانەن کە پرەنسیبی گشتی لە نێو ئامانجەکانیاندایە، بە مانای پێویستی، ئامانجە ئەندەکییەکانیشیان ئەو مەسەلە گەورانە لە خۆ دەگرێت کە ویستی ڕۆحی جیهانە[17]". بەم شێوەیە، تەنیا ئازادی ئەخلاقی یان کۆمەڵایەتی دەتوانێت دیالیکتیکی تاك و کۆمەڵگە بهێنێتە دی، ئازادی خۆپەرستانەی تاکگەرایش لە دەستگرتن بەسەر داواکراو زیاتر چیدیکە نییە، لەبەرئەوەی دەستگرتن بەسەر ئازادی دوژمنانی ئازادیدا مەرجی ڕزگارکردنی ئازادییە لە (ئازادی)، یان بە دەربڕینێکی ئاشکراتر لە نائازادی، یاخود وەك (سان جۆست) دەڵێت: "ئازادی بۆ دوژمنانی ئازادی نییە[18]".

ئەمە لە ڕووی مۆرکی کۆمەڵایەتییەوە بۆ مرۆڤی تاك، وەك پێکهێنەرێکی بنەڕەتی لە پێکهێنەرەکانی دیالیکتیکی تاك و کۆمەڵگە، بەڵام لە ڕووی مۆرکی مرۆییەوە بۆ کۆمەڵگە، وەکو پێکهێنەرێکی دیکەی ئەم دیالیکتیکە، ئەو کۆمەڵگەیەی پارێزگاری لە تاکگەرایی تاك دەکات لە پەیوەندی کردنی بە ئەوانی دیکە، بەبێ هەست بە زۆر لێکردن بکات لە پێویستی پەیوەندی کردنی بە ئەوانی دیکەوە، ئەوا کۆمەڵگەیەکی ئازادە[19]. هەر ئەم کۆمەڵگەیەش درك بەوە دەکات کە ئامرازێکە بۆ هێنانە دی ئامانجێك، ئەو ئامانجەش ئەوەیە تاك خۆی بهێنێتە دی، چونکە تاکەکان هەروەك (مارکس) باسی لێوە دەکات: کۆ دەبنەوە، واتە کۆمەڵێك دەخولقێنێن لە ژێر پێویستی دابینکردنی پێداویستییە تایبەتیەکانیان، بەو پێیەی ئەوانە تاکێکن و گەیشتوونەتە قۆناغێکی دیاریکراوی پەرەسەندن[20].

هێنانەدی تاکەکان هێنانەدی کۆمەڵگە لە خۆ دەگرێت و ئەمەش مەرجی بنەڕەتییە بۆ هێنانەدی یەکەمیان، کەوا بێت پێویستە هەموو کاتێك لەبەرچاوگرتنی بەرژەوەندییەکانی تاکەکان، سەرەتایەك بێت بۆ لەبەرچاوگرتنی بەرژەوەندی کۆمەڵگە، پاشان لە کۆمەڵگەوە (وەك ئامراز) بۆ تاك (وەك ئامانج). لەبەرئەوەی تاك لە بووندا پێش کۆمەڵگە دەکەوێت، بەر لەوەی تاکی کۆمەڵایەتی هەبێت، تاکی تەنیا هەبووە. یان بە دەربڕینی (تۆگارینۆڤ): "تاك یەکەمین سەرەتاکانی مێژووە[21]". هەروەها وەك (فندلباند) دەڵێت: "مێژوو بریتییە لە شانۆ یان لە گۆڕەپانی تاکەکان[22]". هەرچۆنێك بێت، شیکردنەوەی هاوکێشەی تاك و کۆمەڵگە، بەشیکردنەوەیەکی دیالیکتیکی، لەسەر دانانی ئەو چرکەساتە دەبێت کە ئەم هاوکێشەیە دەخاتە ڕوو بۆ شیکارکردن. بەم مانایەش وەك (جۆن دیوی) ووتەنی: "لە کاتی گۆڕانکارییە مێژووییە جۆرییەکاندا ئێمە پێویستیمان بە کۆمەڵگە دەبێت وەك یەك تاك، واتە بۆ دیموکراتی بە مانا ئایدیۆلۆژییەکەی، پاش ئەوە ئێمە پێویستیمان بە کۆمەڵگە دەبێت وەك چەندین تاکە لە یەکتر جیاوازەکان، واتە بۆ ئازادی بە مانا فەلسەفی یان زانستییەکەی[23]".

## پەراوێزەکان

1- بڕوانە مارکس لە کتێبەکەی (ئارسەر کیش)دا: الماركسية و الديمقراطية - مساهمة في مشكلات التفسير الماركسي للديمقراطية/ ت: رجاء احمد/ دمشق 1991- ص132.

2- هەمان سەرچاوە، لا (148).

3- بڕوانە کوسولابوف مارکوف: الحرية و المسؤولية/ ت: فؤاد مرعي/ دمشق 1975 - ص88-89.

4- بڕوانە: روبرت. أ. دال/ مقدمة الى الديمقراطية الأقتصادية/ ت: محمد مصطفى غنيم/ القاهرة 1992 - ص 40،17.

5-بڕوانە: فؤاد زكريا: كتاب العربي (17): خطاب الى العقل العربي، مجلة العربي/ الكويت 1987 - ص 83.

6-بڕوانە برجسون لە کتێبەکەی (زكريا إبراهيم)دا: مشكلات فلسفية - مشكلة الحرية، ط3/ القاهرة - بلا تأريخ، ص79.

7-بڕوانە: ف.ب.توغارينوف: الطبيعة و الحضارة و الانسان/ ت: رضوان القضماني و نجم خريط/ دار الفارابي - بيروت 1987 - ص177.

8-بڕوانە: فرانسوا جاكوب: لعبة الممكنات/ ت: أحمد صالح / دمشق 1991 -ص 96.

9-بڕوانە سەرچاوەی یەکەم، لا 126.

10-بڕوانە: هنري لوفيفر: المنطق الجدلي/ ت: إبراهيم فتحي / القاهرة 1978 - ص 143.

11-بڕوانە: رونيه دولا شاريير: دراسات حول النظرية الديمقراطية/ ت: حافظ الجمالي/ دمشق - 1986. ص 335.

12-بڕوانە ئەریك فرۆم: مفهوم الانسان عند ماركس / ت: محمد سيد رصاص/ دمشق 1998 - ص 71.

13-بڕوانە: ف. ب. توغارينوف، هەمان سەرچاوەی پێشوو. لا 178.

14-بڕوانە هيغل: العقل في التأريخ/ ت: أمام عبدالفتاح أمام/ بيروت 1981 - ص 135.

15-بڕوانە هيغل: مختارات، القسم الأول/ ت: إلياس مرقص/ ط2/ بيروت 1989 - ص 124.

16-بڕوانە: سبينوزا لە کتێبەکەی (كوسولابوف ماركوف)دا / لا 16.

17-بڕوانە هيغل: العقل في التأريخ - سەرچاوەی پێشوو - لا 93.

18-بڕوانە سان جوست لە کتێبەکەی (جان جاك سلمون)دا: العلم و السياسة / ت: هشام دياب / دمشق، 1976/ ص 316.

19-بڕوانە هيغل: مختارات، القسم الثاني/ ت: إلياس مرقص/ ط2 / بيروت 1989 - ص124.

20-بڕوانە ماركس و انجلز: الايديولوجية الألمانية/ ت: فؤاد أيوب/ دمشق - 1976 - ص 477.

21-بڕوانە ف. ب. توغارينوف: سەرچاوەی پێشوو / لا 172.

22-بڕوانە فندلباند لە کتێبی (ثيودور أويزرمان): تطور الفكر الفلسفي /ت: سمير كرم، ط4 دار الطليعة - بيروت 1988 - ص 220.

23-بڕوانە جون ديوی: الفردية قديماً و حديثاً /ت: خيری حمادة/ بيروت 1979 - ص 59.

## سەرچاوە

گۆڤاری - النهج / ژمارە 29/ زستانی 2002.

## وتاری پێنجەم

# کۆچ و ڕەو، تۆلێرانس و لێنەبووردن*...

ئومبێرتۆ ئێکۆ
لە ئیتالییەوە: یاسینی فەقێ سەعی

### 1-کۆچ و ڕەو لە هەزارەی سێهەمدا:

هێندەمان نەماوە بگەینە ساڵی *2000*، لێرەدا نامەوێ بەشداری ئەو گفتوگۆیە بکەم کە ئایا هەزارەی سێهەم لە نیوەشەوی "*31*ی دیسەمبەری *1999* یان *31*ی دیسەمبەری *2000*"ەوە دەست پێدەکات، چونکە بیرکردنەوە لە ماتماتیك و کرۆنۆلۆژیا هەر زوو بۆژۆمان دەکات. چ ماتماتیك و چ کرۆنۆلۆژیا، لە بواری سیمبۆلیزمدا، جۆرە ڕاوبۆچوونێکن، لێرەشەوە *2000* ژمارەیەکی ئەفسوناوییە، بە تایبەتی پاش ئەو هەموو چیرۆك و ڕۆمانەی لە سەدەی ڕابووردوودا لەبارەی ئەفسون و تایبەتمەندیی ساڵی "*2000*"ەوە نوسراون، زۆر زەحمەتە تازە بتوانین لەو ئەفسونەی بێ بەش بکەین.

لە لایەکی ترەوە ماوەیەکە باسی قەیرانی کۆمپیوتەر دەکرێ، گوایە لە دیدی کرۆنۆلۆژیەوە، کۆمپیوتەرەکان لە ساتەوەختی تۆمارکردنی بەرواری "*2000/1/1*"دا تووشی قەیرانێك دەبن نەك لە هەمان ساتەوەختی بەرواری "*2001/1/1*"دا. ئەمەش وەك ئەفسونێکی دیکەی ساڵی *2000* زیاتر هەست و هۆشمان بێ ئۆقرە و شپرزە دەکات، بەڵام کۆمپیوتەر، تەنانەت ئەگەر کەوتە هەڵەشەوە، هەرگیز هەڵە ناکات، خۆ ئەگەر لە بەرواری "*2000/1/1*"دا هەڵەی کرد، ئەوە بێگومان هەقیەتی.

ساڵی *2000* بۆ کێ ئەفسوناویە؟ بێگومان بۆ جیهانی مەسیحیەت، چونکە هەر نەبێت *2000* ساڵ تێدەپەڕێ بەسەر لەدایکبوونی عیسای پێغەمبەردا (گەرچی هەموومان دەزانین ئەم پێغەمبەرە لە ساڵی "سفر"ی ئەم ساڵنامەیەدا نەهاتۆتە دنیاوە). ناکرێ بڵێین هاتنی ئەم ساڵە بۆ "جیهانی خۆرئاوا" ئەفسوناویە، چونکە ئاینی مەسیحیەت لە ناو ژیارەکانی خۆرهەڵاتیشدا بڵاوبۆتەوە، بەڵام ئیسرائیل وەك بەشێکی خۆرئاوا پێناسە دەکرێ و

کەچی تێگەیشتنی تایبەتی هەیە بۆ ساڵنامەی زاینی و بە چەمکی "سەردەمی هاوبەش[1]" دەیداتە قەڵەم، بۆ خۆشیان ساڵنامەیەکی جیاواز بەکاردەهێنن.

لەلایەکی دیکەوە، "ئیسحاق دێلە پێرێر[2]"ی پرۆتستانت لە سەدەی حەڤدەهەمدا، ئەو راستیەی ئاشکرا کرد کە کرۆنۆلۆژیای "چین"ی زۆر دێرینترە لە کرۆنۆلۆژیای "یەهودیی"، لێرەشەوە ئەم گریمانەیەی بەرهەم هێنا: کەواتە "گوناهی یەکەم" تەنها بەرۆکی نەوەکانی "ئادەم" دەگرێتەوە، نەك ئەو نەوانەی زۆر پێشتر هاتونەتە بوونەوە. بێگومان ئەو پیاوە هەر زوو بە بێ دین و خوانەناس درایە قەڵەم، بەڵام لە ڕووی تیۆلۆژیەوە گریمانەکەی هەڵە بێت یان ڕاست، ڕاستیەکی بۆ ئاشکرا کردین کە ئەمڕۆ کەسمان گومانمان لێی نییە: ڕاستی ئەوەی، ساڵنامە جۆراو جۆرەکانی ژیارە جیاوازەکان، ڕەنگدانەوەی دید و تێگەیشتنی تیۆلۆژی و مێژوویی جۆراوجۆرن، "ساڵنامەی زاینی"یش یەکێکە لەوانە (جێی خۆیەتی ئاماژە بۆ ئەو ڕاستیە بکەین کە: بەکارهێنانی "ساڵنامەی زاینی" لەلای خۆشمان ئەوەندە کۆن نییە وەك هەندێ دەزانن، هەتا کۆتایی "سەدەکانی ناوەڕاست" ساڵنامەیەك بەکاردەهێنرا کە لە ساڵی ئافراندنی[3] ئەم دنیایەوە ساڵەکانی دەژمارد نەك لە ساڵی لەدایکبوونی عیساوە).

بەهۆی کاریگەریی ئەم مۆدێلی ساڵنامە ئەوروپییە لەسەر مۆدێلەکانی دیکە، من دڵنیام تەنانەت لە "پەکین و سینگاپور"یش ئاهەنگی ساڵی *2000* دەگێڕن. لە هەموو لایەکەوە ئاهەنگ دەگێڕن، بەڵام بۆ زۆربەی میللەتانی دنیا ئەم ئاهەنگە لە سنووری ڕێکەوتننامە بازرگانیەکاندا سازدەکرێت، نەك لە سنووری دید و تێگەیشتنە تایبەتی و خۆییەکاندا. ئەگەر لە چین بەر لە ساڵی "سفر"ی ساڵنامەی زاینی، ژیار و شارستانیەتی لە گەشە و پێشکەوتندا بوو بێت (هەرچەندە هەموومان دەزانین، بەر لە پەیدابوونی عیسا، لە ناوچەکانی دەوروبەری دەریای سپی ناوەڕاستدا، چەندین ژیار و شارستانیەتی گرنگ و پێشکەوتوو هەبوون، بەڵام هەرچۆنێ بێ، هەموو بەوە ڕازی بووین سەردەمی ئەفلاتون و ئەرستۆ بە ساڵەکانی "بەر لە زاینی" تۆمار بکەین) ئایا هاتنی ساڵی *2000* لای ئەوان چ مانایەکی ئەبێت؟ مانای سەرکەوتن و زاڵ بوونی مۆدێلی ساڵنامەی ئایینی مەسیحیەت؟ (بێگومان نەخێر، چونکە "بێ دین و خوانەناس"ەکانیش ئەو ئاهەنگە دەگێڕن)، بەڵام بێگومان مانای سەرکەوتن و زاڵبوونی مۆدێلی ساڵنامەی ئەوروپییە، کە پاش "دۆزینەوەی" ئەمەریکا لە لایەن "کۆلۆمبۆ[4]"وە بووە ساڵنامەی ئەو کیشوەرانەش – هەرچەندە هیندیە سوورەکان پێیان وایە لەو ساڵانەدا، ئەوان، ئێمەیان دۆزیوەتەوە –.

ئەو کاتەی لای ئێمە ساڵی "*2000*"ە، دەبێ لای ئیسلامەکان یان ئوستراڵی نەژادەکان، یان لای "چین"یەکان ساڵی چەند بێ؟ هەرچەندە پێ دەکرێت جێی بایەخی ئێمە نەبێت. بەڵام ساڵی *2000* هی خۆمانە، ساڵێکە لە ساڵنامەی ناوەندیی ئەوروپادا، واتە هەرچییەك بێت تایبەتە بە خۆمان. بەڵام ئەم مۆدێلە ئەوروپییە، گەرچی لەوە دەچێت ژیاری ئەمەریکاشی داگیرکردبێ – هەرچەندە ئەمەریکییە بە نەژاد ئەفەریقی و خۆرهەڵاتییەکان، یان بە نەژاد هیندەکان، بە مۆدێلی خۆیانی نازانن – ئایا دەتوانین هێشتاکە ئێمەی ئەوروپی بە هی خۆمانی بزانین؟

چەند ساڵێك لەمەوبەر، کاتێك "ئەکادیمیای گەردوونی کەلتورەکان[5]" لە پاریس دامەزرا، کە

دەتوانن هونەرمەندان و زانایانی هەموو وڵاتێکی ئەم دنیایە کاری تێدا بکەن، دەقی "دەستوورێك" وەك یاسای بنەڕەتی ئەم دامەزراوە بڵاوکرایەوە. سەرەڕای پێناسەکردن و دیاریکردنی ئەرك و ئامانجە زانستی و مۆراڵییەکانی ئەکادیمیاکە، بانگەوازێکی ڕاگەیاندبوو لە شێوەی پێشبینییەکدا، گوایە لە هەزارەی سێهەمدا گەورەترین "تێکەڵاوبوونی کەلتورەکان[6]" لە ئەوروپادا ڕوودەدات.

ئەگەر ڕەوتی ڕووداوەکان لە ناکاودا هەڵنەگەڕێتەوە (ئەمەش ئەگەرێکی بەهێزە)، ئێمە دەبێت خۆ ئامادەبکەین کە "ئەوروپا" لە هەزارەی سێهەمدا وەکو "نیویورك" یان هەندێ لە وڵاتانی ئەمەریکای لاتینی لێ دێت. لە نیویۆرکدا بە ئاشکرا ڕەتکردنەوەی چەمکی "خاڵی توانەوە[7]" دەبینین، چەندین کەلتوری جۆراوجۆر پێکەوە و بەیەکەوە دەژین، ئەمەش هەر لە "پۆرتۆریکی[8]" هەتا چینی، هەر لە کۆریی هەتا پاکستانی: هەندێ مرۆڤگەلی دیکەش هەن سەریان لێ شێواوە (وەك ئیتالیەکان، ئیرلەندیەکان، یەهودیەکان و پۆڵۆنیەکان)، هەندێکی دیکەش خۆیان جیاکردۆتەوە (لە گەڕەك و مەڵبەندی جیاوازدا دەژین، بە زمانی جیاواز دەئاخڤێن، بەپێی ترادیتسیۆنی[9] جیاواز هەڵسوکەوت دەکەن)، بەڵام هەر هەموویان لەسەر بناغەی کۆمەڵێ یاسای هاوبەش پێکەوە دەژین و یەك زمانی هاوبەش "کە بۆ زۆربەیان زمانی دووەمە" بەکاردێنن کە ئینگلیزییە، ئەم زمانەش هەرکەسە بەپێی توانای خۆی و بەشەق و شڕی قسەی پێدەکات. جێی خۆیەتی ئاماژە بۆ ڕێژەی هاوڵاتیە "سپی پێست"ەکانی شاری نیویورك بکەین کە تا دێت ڕووەو کەمایەتی دەچێ، ڕێژەی 42٪ی ئەم سپی پێستانە یەهودین، ڕێژەکەی تری 58٪ لە چەندین نەژاد و ڕەچەڵەکی جیاواز پێکهاتووە، لە نێوان ئەم هەموو نەژاد و ڕەچەڵەکە جیاوازانەدا، سپی پێستەکانی پێیان دەوترێ *Wasps* [10]– واسپس (سپی پێستە ئانگلۆساکسۆنی و پرۆتستانتەکان) کەمایەتین (چونکە لەو ڕێژەیەدا، واتە 58٪، کاتۆلیکی پۆڵۆنی و ئیتالی و ئیسپان – ئەمەریکی و ئیرلەندی.. هتد. هەن).

لە ئەمەریکای لاتیندا، هەر وڵاتێك و دیاردەیەکی جیاواز ڕوویداوە: لە هەندێکیاندا کۆڵۆنە ئیسپانیەکان لەگەڵ هیندەکاندا ژن و ژنخوازیان کردووە، لە هەندێکی تردا لەگەڵ ئەفەریقییەکاندا (وەك بەرازیل) خوێنیان تێکەڵاو کردووە، لە هەندێکی دیکەدا چەندین شێوە زمان و کۆمەڵە مرۆیی جیاواز دروست بوون کە پێیان دەڵێن "*Creole* – دووڕەگ[11]" لەبەرئەوە، زۆر زەحمەتە، گەرچی بە چەمکە ڕەگەزییەکانی خوێن و نەژادیش کاربکەین، بتوانین بە مەکسیکیەك، یان بە پێروڤیانییەك[12]، یا نەڵێین بە جامایکاییەك[13]، بڵێین بە ڕەچەڵەك ئەورووپییە، یان ئەمەریکی – هیندییە.

بە کورتیەکەی ئەوە لە ئەوروپاشدا ڕوودەدات، دیاردەیەك دەبێت لەم چەشنە، بەبێ ئەوەی هیچ ڕەگەزپەرست و نۆستالجیستێکی کۆنخواز[14] بتوانێ ڕێی لێبگرێت.

بە پێویستی دەزانم مانای چەمکی "پەنابردن[15]" لە مانای چەمکی "هیجرەتکردن[16]" یان "ڕەوکردن" جیابکرێتەوە. پەنابردن ئەوەیە کە چەند کەسێك (چەند زۆریش بن، بەڵام لە ڕووی ئامارەوە، کەمتر بن لە دانیشتوانی ئەو وڵاتەی بۆی چوون) لە وڵاتێکەوە بچن بۆ وڵاتێکی دیکە (وەکو ئیتالیەکان و ئیرلەندیەکان کە دەچوون بۆ ئەمەریکا، یان وەکو تورکەکان کە ئەمڕۆ دەچن بۆ ئەڵمانیا). دیاردەی پەنابردن لە ڕووی سیاسیەوە دەتوانرێ

کۆنترۆڵ بکرێت، سنووری بۆ دانرێ، هان بدرێ یان ڕێی لێبگیرێ، بەرنامەڕێژکرێ یان قبوڵکرێ.

بەڵام لەگەڵ دیاردەی "هیجرەت – ڕەو" کردندا، چ چەشنە توندو تیژەکەی بێت و چ چەشنە هێمن و ئاشتیانەکەی، ناتوانرێ هیچ بکرێت، کتومت ئەم جوڵە مرۆییە لە دیاردە سروشتییەکان دەچێت: ڕوو دەدەن بەبێ ئەوەی هیچ کەسێك توانای کۆنترۆڵکردنی هەبێت. "ڕەوکردن" دیاردەی گواستنەوەی سەرتاپای میللەتێکە، هێدی هێدی، لە خاکێکەوە بۆ خاکێکی دیکە (ئیتر ئەوە گرنگ نییە ڕێژەی چەندی ئەو میللەتە لە نیشتمانی خۆیدا دەمێنێتەوە، بەڵکو ئەوە گرنگە موهاجیرەکان بە چ ئاست و ئەندازەیەك کەلتوری ئەو خاکە و دانیشتوانەکەی دەگۆڕن کە ڕەویان بۆ کردووە). ڕەوە گەورەکانی مرۆڤ لە خۆرهەڵاتەوە بۆ خۆرئاوا ڕوویانداوە، میللەتە "قەفقاسیەکان" توانیویانە سەرکەوتوانە کەلتور و میراتی بایۆلۆژی دانیشتوانی ڕەوگەکان بگۆڕن. هەروەها هاتنی ئەو میللەتانەی پێیان ووتراوە "بەربەریەکان" بەرەو خاکی ئیمپراتۆری ڕۆما بە ڕەوی گەورەی مرۆڤ دادەنرێ، چونکە توانیان نەك هەر کەلتورێکی نوێ دروست بکەن، بەڵکو دەسەڵاتی خۆیان سەپاند و سەردەمێکی نوێیان دەست پێکرد کە ناونراوە بە "ڕۆمی – بەربەری" یان بە "ڕۆمی – جەرمانی[17]". لەلایەکی ترەوە گواستنەوەی مرۆڤ لە ئەوروپاوە بەرەو کیشوەری تازە دۆزراوەی ئەمەریکا، بە کۆڕەوە گەورەکانی مێژوو دادەنرێ، لە ئەوروپاوە بەرەو کەنارەکانی خۆرهەڵات، هێدی هێدی، هەتا دەگاتە کالیفۆرنیا لەلایەك و لەلایەکی ترەوە لە دورگەکانی "کارایبی و مەکسیك"ەوە هەتا دەگاتە دوورترین پنتکی تەوەرەی خواروو. هەرچەندە ئەم هیجرەتکردنە لە ڕووی سیاسیەوە کەم تا زۆر بەرنامەی بۆ دانرابوو، بەڵام هەر بە ڕەوی گەورە دادەنرێ، چونکە موهاجیرە سپی پێستە ئەوروپییەکان نەك لە ناو کەلتور و داب و نەریتی "ئەمەریکی نەژادەکان[18]"دا نەتوانەوە، بەڵکو ژیار و شارستانیەتێکی نوێیان دامەزراند کە دانیشتوانی ڕەوگەکە بە ناچاری خۆیان لەگەڵا گونجاند (بێگومان ئەو ژمارە کەمەی ئەمەریکی نەژادەکان کە بەخت یاریان بوو و نەکوژران).

لە لایەکی ترەوە هیجرەتی پچڕپچڕ ڕوویانداوە، وەك ڕەوکردنی میللەتانی بەڕەچەڵەك عەرەب بەرەو نیمچە دورگەی "ئیسپانیا – پورتوگال[19]". چەندین فۆرمی هیجرەتکردنی نیوە ناچڵ و نەخشە بۆکێشراو هەبوون، بەڵام کەمتر کاریگەر بوون لە چاو هیجرەتکردنی ئەوروپیەکاندا بەرەو ناوچەکانی خۆرهەڵات و باشوور (کە بوونەتە مایەی لەدایکبوونی چەند وڵاتێك کە پێیان دەوترێ "پۆست – کۆلۆنیاڵیەکان")، ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە موهاجیرەکان توانیویشیانە کەلتوری دانیشتوانی ڕەوگەکانیش بگۆڕن. من وای بۆ دەچم هەتا ئێستا نەتوانرابێ فینۆمینۆلۆژیایەك بۆ چەشن و جۆرە جیاوازەکانی هیجرەتکردن دانرابێ، بەڵام دڵنیام کە هیجرەتکردنەکان لە پەنابردنەکان جیاوازن. ئەوە تەنها بە "پەنابردن" دادەنرێ کاتێك پەنابەران (بەپێی چەند بڕیارێکی سیاسی) ناچارکراون زۆربەی زۆری داب و نەریتی ئەو وڵاتە قبوڵ بکەن کە پەنایان بۆی بردووە، ئەوەش تەنها بە "هیجرەتکردن" دادەنرێ کاتێك موهاجیرەکان (کەکەس ناتوانێ لەسەر سنوورەکان ڕێیان لێ بگرێ) بەشێوەیەکی ڕادیکاڵی کەلتوری ئەو نیشتمانە دەگۆڕن کە هیجرەتیان بۆی کردووە.

ئێمە ئەمڕۆ، پاش سەدەی نۆزدەهەم کە لێوان لێو بوو لە هیجرەتکردنەکان، خۆمان لەبەرامبەر

چەند دیاردەیەكی ناڕوون و نادڵنیادا دەبینینەوە. ئەمڕۆ – لە كەش و هەوایەكی بارگاویدا بە جوڵە و جێگۆڕكێی گەورە – زۆر دژوارە بە هەندێ دیاردە بڵێین پەنابردن یان هیجرەتكردن. ئەوەی تەواو لێی دڵنیاین ئەوەیە تەوژمێكی بەهێزی مرۆیی هەیە لە ناوچەكانی باشووری دنیاوە بەرەو ناوچەكانی باكووری دنیا (ئەفەریقی یان خەڵكانی خۆرهەلاتی ناوەڕاست رووەو ئەوروپا)، هیندەكانی هیندستان ئەفەریقاو دورگەكانی "پاسیفیك"[20] یان داگیر كردووە، چینییەكان لە هەموو شوێنێكدا ئامادەن، یابانیەكان گەرچی خۆشیان بەشێوەیەكی دیار و لەبەرچاو جێگۆڕكێ ناكەن، بەلام بە خۆیان و رێكخراوە پیشەسازی و ئابووریەكانیانەوە لە هەموو شوێنێ ئامادەن.

ئایا لەم حاڵەتەدا دەتوانرێ پەنابردن لە هیجرەتكردن جیابكرێتەوە كە سەرتاپای گۆی زەوی بۆتە پانتایی كۆچكردن و گواستنەوە گەورەكانی مرۆڤ؟ من وای بۆ دەچم: وەك ووتم پەنابردن لە رووی سیاسیەوە كۆنترۆڵ دەكرێ و هیجرەتكردن كۆنترۆڵ ناكرێ؛ چونكە وەك دیاردە سروشتییەكان وان. هەتا دیاردەكە "پەنابردن" بێت، میللەتان دەتوانن دڵی خۆیان بەوە خۆش بكەن، پەنابەران لە گەڕەك و مەڵبەندە تایبەتیەكاندا نیشتەجێ بكەن، بەو هیوایەی لەگەڵ دانیشتوانی ولاتەكەیاندا تێكەلاو نەبن. كاتێكیش دیاردەكە "هیجرەتكردن" بێت، چیدی گەڕەك و مەڵبەندی تایبەتی پەنابەران[21] باوی نامێنێ و دیاردەی تێكەلاوبوونی خوێن بە هۆی ژن و ژنخوازیەوە مەحاڵە كۆنترۆڵ بكرێت.

ئەو دیاردانەی كە هێشتاكە ئەوروپا هەوڵدەدات وەك حاڵەتی "پەنابردن" رووبەڕوویان ببێتەوە بە پێچەوانەوە حاڵەتی "هیجرەتكردن"ن. "جیهانی سێهەم" وا خەریكە لە دەرگای ئەوروپا دەدات، تەنانەت ئەگەر ئەوروپاش رازی نەبێت، ئەوان هەر دێنە ژوورەوە. كەواتە كێشەكە چیدی ئەوە نییە بڕیار بدرێ (وەك سیاسەتمەداران وا خۆیان دەخەنە روو) ئایا لە زانكۆكانی پاریس كچە خوێندكاران بە "لەچك"ەوە قبوڵبكرێن یان نا، یان ڕێگە بدرێت یان نا چەند مزگەوت لە ڕۆمادا دروستكرێن، بەڵكو كێشەكە ئەوەیە لە هەزارەی سێهەمدا (جا لەبەرئەوەی من پێغەمبەر نیم بۆیە لە توانامدا نییە بە تەواوی كاتەكەی دیاری بكەم) ئەوروپا دەبێتە كیشوەرێكی فرە ڕەگەز، یان هەیە پێی خۆشە بڵێم دەبێتە كیشوەرێكی "ڕەنگاو ڕەنگ". ئەوروپییەكان ئەگەر بەدڵیانە، ئەوا ئەوروپا وای لێ دێت؛ خۆ ئەگەر بە دڵیان نییە، ئەوا دیسانەوە هەروای لێدێت.

ڕووبەڕووبوونەوە (یان بەریەككەوتنی) كەلتورەكان ئاكام و ئەنجامی گەلێك خوێناوی لێ دەكەوێتەوە، من بۆ خۆم تاڕادەیەك دڵنیام لەو ئاكامە و ئەنجامانەی، وە هەروەها دڵنیام كە ئەو ئاكامە خوێناویە نە ڕێی لێدەگیرێ، نە لە ناو دەچێ، نە تەمەن كورت دەبێ. لە لایەكی ترەوە دڵنیام كە ڕەگەزپەرستەكان (لە رووی تیۆریەوە) دەبێت وەك چەشنە ڕەگەزێكی گیانلەبەران لەناوچن و وەچەیان كوێربێتەوە. ئەو هاوولاتیەی "*Patrizio*"[22] ڕۆمای دێرینتان لەبیرچۆتەوە كە بە هیچ شێوەیەك چاوی بەرایی نەدەهات خەڵكانێكی "گاللی"[23] یان "سەرماتی"[24] یان "یەهودی وەك سان پاولۆ" ببینێ كە ببنە هاونیشتمانیەكی شارستانی ناو ڕۆما. یان هەرگیز بە خەویش بە خەیاڵیا گوزەری نەكردووە پیاوێكی ئەفەریقی سەركەوێتە سەر عەرش و ببێ بە ئیمپراتۆر، هەروەك لە دواتردا روویدا، ئێمە هەموومان ئەم چەشنە لە هاوولاتیانی ڕۆمامان بیرچۆتەوە، بۆ؟ چونكە مێژوو سەلماندی كە

ئەو جۆرە کەسانە دۆڕاندیان و جۆرەکەی تریان بردیەوە. ژیاری ڕۆمەکان، ژیارێکی فرەڕەگەز بوو. ڕەگەزپەرستەکان پێیان وایە هەر ئەوەش بووە هۆی فەوتان و نەمانی، بابڵێین وایە، بەڵام ئەو فەوتان و نەمانە هەر نەبێ پێنج سەدەی وویستووە – من دەمەوێ بڵێم: ماوەیەکی ئاوا دوور و درێژ، هێندە زۆرە کە بوار بە ئێمەش دەدات لە ئێستەوە پرۆژەکانمان بۆ پاشەڕۆژ ئامادە بکەین.

## 2-تۆلێرانس

"فۆندەمێنتالیزم – ئوسوڵیەت" و "ئینتێگرالیزم – توندڕەویی" وەك باوە دوو چەمکی لێك نزیك و پێکەوە گرێدراون و بە دوو فۆڕمی هەرە ئاشکرای "نا – تۆلێرانس" پێناسە کراون. ئەگەر لەمبارەیەوە ڕاوێژ بە دوو سەرچاوەی باوەڕ پێکراوی هەرە باش بکەم، وەك "*Petit Robert*"[25] و "فەرهەنگی مێژوویی زمانی فەڕەنسی"[26]، لە لێکدانەوەی چەمکی فەندەمێنتالیزمدا دەمودەست داوادەکەن بڕوانینە چەمکی ئینتێگرالیزم. ئەمەش هانمان دەدا هەموو فۆندەمێنتالیستێك بە ئینتێگرالیست بزانین و بە پێچەوانەشەوە.

خۆ ئەگەر ئەمەی ووتمان ڕاستیش بێت، ناتوانین هەموو کەسێکی نا – تۆلێرانس بە فۆندەمێنتالیست و ئینتێگرالیست بزانین. گەرچی لە زەمەنی ئێستاماندا خۆمان لە بەرامبەری چەندین فۆڕمی فۆندەمێنتالیزمدا دەبینینەوەو نموونەی ئینتێگرالیزمیش لە هەموو لایەکی ئەم دنیایەوە بەرچاو دەکەون، بەڵام کێشەو گرفتی نا – تۆلێرانس زۆر لەمانە قوڵتر و ترسناکترە.

لە سنووری زاراوە مێژووییەکاندا، "فۆندەمێنتالیزم" وەك پرینسیپێکی "ئێرمێنێوتیك – *Ermeneutic* – تیۆری ڕاڤەکردن" پێناسەکراوە، کە بەسراوەتەوە بە شیکردنەوەی مانای "دەقێکی پیرۆزەوە". فۆندەمێنتالیزمی مۆدێرنی خۆرئاوا لە سەدەی نۆزدەهەمدا و لە ولاتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا لە ناو ژینگە پرۆتستانتیەکاندا سەریهەڵداو لەدایکبوو، خەسڵەتی سەرەکی ئەم فۆندەمێنتالیستە ئەو بڕیارەیە کە پێویستە دەقی پیرۆز بە دەقاودەقی شیبکرێتەوە و ڕاڤەبکرێت، بەتایبەتی ئەو لایەنەی کە پەیوەندی بە چەمك و زاراوەکانی "کۆزمۆلۆژیا – *Cosmologia*"[27] وە هەیە و گوایە "زانستی سەردەم" ڕاستیی ئەوانی خستۆتە ژێر گومانەوە. هەر لێرەوە هەموو جۆرە شیکردنەوە و ڕاڤەکردنێکی نوێ و ئازادانە بە توندی ڕەتدەکەنەوەو بە تایبەتی ئەو شێوە پەروەردەکردنە ڕەتدەکەنەوە کە هەوڵبدات بڕواو متمانە بە "دەقی ئینجیل" لەق بکات، وەك ئەوەی تیۆرەی "داروینزم – *Darwinism*" کردی.

ئەم شیکردنەوە دەقاودەقە فۆندەمێنتالیستییە نوێ نییە و هەر لە سەردەمی کۆنەوە لە نێوان قەشەکانی کڵێسەدا چەندین مشتومڕی لەبارەوە کراوەو گفتوگۆی گەرم لە نێوان "پارتیزانەکان"[28]ی شیکردنەوەی دەقاو دەق لە لایەك و لایەنگرانی شیکردنەوەیەکی نەرمتر و میانڕەو لە لایەکی ترەوە ڕوویداوە، شیکردنەوەی میانڕەو وەك ڕاڤەکردنەکانی "سان ئەگۆستین". لە جیهانی مۆدێرندا فۆندەمێنتالیستی بیرتەسك هەر دەبوو پرۆتستانتی بێ، چونکە هەر ئەوان بڕوای ڕەهایان بەوەیە لە پێناوی بوون بە فۆندەمێنتالیستێکی ڕاستەقینە پێویستە تا سەر ئێسقان بڕوا بێنێ کە حەقیقەت تەنها لە ڕاڤەکردنی "ئینجیل"ەوە دێتە دەرێ. بەڵام لە ژینگە کاتۆلیکیەکاندا بە پێچەوانەوەیە چونکە تەنها دەسەڵاتی "کڵێسە" شیکردنەوەو ڕاڤەکردنەکان گەرەنتی دەکات، دیارە

بۆ یەكسان بوون بە فۆندەمێنتالیزمی پرۆتستانتی، ئەمانیش پاڵدەدەنەوە بە فۆرمێكی "ترادیتسیۆنالیزم"[29]ەوە.

ئەمانە هێڵە گشتییەكانی فۆندەمێنتالیزمی مەسیحی بوون، من لێرەدا دەوەستم و باسكردنی هێڵە گشتیەكانی فۆندەمێنتالیزمی ئیسلامی و یەهودی وازلێدێنم (دیارە بۆ شارەزایان).

ئایا دەبێت فۆندەمێنتالیزم بەپێی پێویست نا – تۆلێرانس بێت؟ بەڵێ لە بواری "تیۆری ڕاڤەكردن"دا، بەلام لە بواری سیاسیدا بەپێی پێویست وانییە. كۆمەڵەیەكی فۆندەمێنتالیستی بهێننە بەرچاو كە پێی وایە خودی ئەندامەكانی ماف و شەرەفی ڕاڤەكردن و شیكردنەوەیەكی ڕاست و دروستی دەقە پیرۆزەكانیان هەیە، بەلام بە هیچ شێوەیەك بڕوایان بەوە نییە، كە نەك بەشداری بەڵكو پشتگیری هیچ فۆرمێكی "پرۆسێلیتیزم – *Proselitism*" بكەن (واتە خەڵكی نامەسیحی هانبدەن ببێ بە مەسیحی)، وە یان بڕوایان بەوە نییە كە خەڵكی ناچاربكەن بڕوا بە بۆچوونەكانیان بێنن، یان بڕوایان بەوە نییە خەبات بكەن بۆ دامەزراندنی كۆمەڵگایەك لەسەر بناغەی بیر و بۆچوونەكانیان.

بەلام مەبەست لە "ئینتێگرالیزم" هەڵوێست وەرگرتنێكی ئاینی و سیاسییە كە پێی وایە دەبێت پرینسیپە ئاینیەكان هەم مۆدێلێك بن بۆ ژیانی سیاسی و هەم سەرچاوەی یاساكانی وڵات بن. ئەگەر فۆندەمێنتالیزم و ترادیتسیۆنالیزم لە بناغەوە "كۆنخواز"[30] بن، ئەوا چەندین جۆری ئینتێگرالیزم هەن كە دەیانەوێ پێشكەوتوخواز و شۆڕشگێڕبن. چەند بزوتنەوەیەكی كاتۆلیكی ئینتێگرالیست هەن فۆندەمێنتالیست نین و خەبات دەكەن بۆ دامەزراندنی كۆمەڵگایەك لەسەر بناغەی پرنسیپە ئاینییەكان بەبێ ئەوەی دەقاودەق شیكردنەوەو ڕاڤەكردنی دەقە پیرۆزەكان لەبەرچاو بگرن و لەوانەشە ئامادەبن تیۆلۆژیایەكی وەك ئەوەی "*Teilhard de chardin*" یش قبوڵ بكەن.

بەناویەكداچوونی شتەكان و تێكەڵاوبوونی سنوورەكان دەكرێ بگەنە ئەوپەڕی. بیرێك لە دیاردەی "سیاسەتی ڕاست و دروست – *Political correctness*"[32] بكەنەوە لە ئەمەریكا. ئەم دیاردەیە بۆ گەشەپێدانی تۆلێرانس و دانپیانان و قبوڵكردنی هەموو جیاوازییە، ئاینی و ڕەگەزیی و جنسیەكان سەریهەڵدا، لەگەڵ ئەوەشا خەریكە دەبێتە فۆرمێكی نوێی فۆندەمێنتالیزم كە بەشێوەیەكی "ئامال"[33] بە سروتە ئاینیەكان "وەبەرهێنان"[34] لە زمانی ئاخاوتنی ڕۆژانەدا دەكات، كە كار لەسەر وشەكان دەكات بە زیانی ڕۆح – بەشێوەیەكی وا كە لە توانایدا هەیە "كوێرێك" جیابكاتەوە لە كۆمەڵ بەو بیانووەی بە وشەیەكی ناسكتر و شیاوتر بانگی لێدەكات "نابینا"، بەر لە هەمووشیان زۆرباش دەتوانێ هەموو ئەوانە جیابكاتەوە كە گوێڕایەڵی یاسا و بڕیارەكانی "سیاسەتی ڕاست و دروست" ناكەن.

ئەی "ڕاتسیزم – ڕەگەزپەرستیی" چییە؟ بێگومان ڕەگەزپەرستی نازییەكان "تۆتالیتار – دیكتاتۆر"ی بوو، خۆی بە زانستی دەزانی، بەلام لە تیۆرەی ڕەگەزیدا هیچ شتێكی فۆندەمێنتالیستی تێدا نەبوو. بەلام ڕاتسیزمی نازانستی وەك گروپی "یەكگرتووی ئیتالی"، گەرچی هەمان ئەو ڕەگوڕیشە كەلتوریانەی ڕاتسیزمی "خۆ بە زانستی زان"ی ئەڵمانی نییە (لە ڕاستیدا هیچ جۆرە ڕەگوڕیشەیەكی كەلتوری نییە)، بەلام هەر ڕاتسیزمە.

كەواتە نا – تۆلێرانس چییە؟ ئایا خۆی بچوك دەكاتەوەو دادەبەزێ بۆ ئەم جیاوازی و لەیەكچوونانەی نێوان فۆندەمێنتالیزم، ئینتێگرالیزم

و ڕاتسیزم؟ چەند فۆرمێكی نا – تۆلێرانس هەبوون كە ڕاتسیزم نەبوون (وەك بە دواداگەڕان و لەناوبردنی ئەوانەی لەسەر ئاینی مەسیحیەت نەدەمان، یان "نا – تۆلێرانس"ی دیكتاتۆرەكان لە بەرامبەری ئەوانەدا كە بەربەرەكانێیان دەكرد). كەواتە نا – تۆلێرانس شتێكە زۆر لە ڕەگوڕیشەی هەموو ئەو دیاردانە قوڵترە كە باسم كردن.

فۆندەمێنتالیزم، ئینتێگرالیزم، ڕاتسیزم "ی خۆ بەزانستی زان" هەرسێكیان شوێنگەی(35) تیۆری پێشنیاركردنی تیۆرەیەكن. بەڵام نا – تۆلێرانس لە جێگەیەكدایە بەر لە هەموو جۆرە تیۆرەیەك. بەم واتایە: نا – تۆلێرانس ڕەگوڕیشەی بایۆلۆژی هەیە و لە ناو گیانلەبەراندا وەك "وابەستەیی بە خاكێكی دیاریكراو"(36)ەوە دەردەكەوێ و لەسەر بناغەی كاردانەوە سۆزداریە ڕووكەشییەكان خۆی دامەزراندووە – لەگەڵ ئەوانەدا هەڵناكەین كە لە ئێمە جیاوازن، لەبەرئەوەی ڕەنگی پێستیان ڕەنگێكی ترە، لەبەرئەوەی بە زمانێك دەئاخفێن تێیناگەین، لەبەرئەوەی بۆق، سەگ، مەیموون، بەراز، سیر دەخۆن، لەبەرئەوەی خاڵدەكووتن..

نا – تۆلێرانس بەرامبەر شتە جیاواز و نەناسراوەكان لەلای مناڵ، مەسەلەیەكی سروشتییە، هێندەی غەریزەی دەست بەسەراگرتنی هەموو ئەو شتانەی كە ئارەزوو یان حەزی لێیانە. مناڵ هێدی هێدی فێری تۆلێرانس دەكرێ، هەروەك چۆن فێری ڕێزگرتن دەكرێ لە كەلوپەلی خەڵكی تر بەرلەوەی بتوانێ كۆنترۆڵی "كۆم"ی خۆی بكات. بۆ بەدبەختیمان، ئەگەر هەموو فێری كۆنترۆڵی لەشی خۆشیان بن، ئەوا هەر "تۆلێرانس" وەك كێشەیەكی پەروەردەكردنی بەردەوام لە ئەستۆی گەورەكاندا هەر دەمێنێ، ئەمەش لەبەرئەوەی لە ژیانی ڕۆژانەدا هەردەم گریمانەی ڕاچڵەكین و ڕاچەنین هەیە لە بەرامبەری مەترسیەكانی جیاوازیدا. توێژەرەوەكان هەمیشە خۆیان بە تیۆرەكانی جیاوازیەوە خەریك دەكەن، بەڵام بەپێی پێویست خۆخەریك ناكەن بە "نا – تۆلێرانس"ی كێوییەوە(37)، ئەمەش لەبەرئەوەی نا – تۆلێرانس لە هەموو پێناسەكردن و ڕەخنەگرتنێك هەڵدێ و خۆی دەرباز دەكات.

لەگەڵ ئەمانەشدا "تیۆرەكانی جیاوازی" نین كە "نا – تۆلێرانس"ی كێوی بەرهەمدێنن: بە پێچەوانەوە، ئەوان سوود لە بناغە و بنچینەیەكی نا – تۆلێرانس وەردەگرن كە لەوەوبەر هەبووە و بڵاوبۆتەوە. بۆ نموونە: ڕاونان و كوشتنی سیحرباز و جادوگەرەكان. ئەمە بەرهەمی سەدە تاریكەكان نییە، بەڵكو لە قۆناغی مۆدێرندا پەیدا بووە. "*il Malleus Maleficarum*"(38) كەمێك بەر لە دۆزینەوەی ئەمەریكا نووسراوە، ئەو بەرهەمە هاوسەردەمی هیومانیزمی(39) شاری فلۆرەنسایە؛ لەلایەكی تر كتێبی "*La Demonomanie des Sorciers*"(40)ی ژان بۆدین – "*Jean Bodin*"(41) بە قەڵەمی پیاوێكی ڕێنیسانس نووسراوە پاش بڵاوبونەوەی بۆچوونەكانی "كۆپەرنیكۆ – *Copernico*"(42).

بێگومان من لێرەدا مەبەستم ڕاڤەكردنی ئەوە نییە كە دنیای مۆدێرن بۆچی ئەو هەموو پاساوە تیۆرییەی هێنایەوە بۆ ڕاونان و كوشتنی سیحرباز و جادوگەرەكان. بەڵكو تەنها مەبەستم ئەوەیە كە ئەم تیۆرەیە بۆیە توانی سەرهەڵبدات چونكە پێشتر لەسەر ئاستی میللی جیاوازی سیحرباز و جادوگەرەكان لە خەڵك تا سەر ئێسقان تۆخ كرابووەوە. ئەمەش لە بەرهەمە كلاسیكیە دێرینەكانەوە (وەك ئەوانەی هۆراس) هەست پێ دەكرێت، هەتا دەگاتە فەرمان و بڕیارە جۆراو جۆرەكانی "پادشاكان" و تا دەگاتە سەر كتێبە بەناوبانگەكەی "سان تۆماز" كە بە ناونیشانی

"*Summa Theologica*" بـــوو. بـــەڵام ئەگـــەر وەك حەقیقـەتێکی نێـو ژیـانی ڕۆژانـە تەماشـا بکرایـە، هـــەروەك چـۆن "یاسـای سـزادان" تەماشـای دز و جەردەکانی دەکرد، ئەوا ئەو جیابوونەوە زۆرە ڕووی نـەدەدا. بـەڵام بـەبێ بوونـی ئـەم بـڕوا و بۆچوونـە میللیانە "نە دەتوانرا" تیۆرەیەکی تایبەت بە سیحر و جادوگـەرایی پـەیدا ببـێ و "نـە بەرنامەیـەکی پراکتیکی" بۆ ڕاونان و کوشتنیان جێبەجێ دەکرا.

ئـانتی سـێمیتیزم "ی خۆبەزانسـتی زان" لـە سـەدەی نۆزدەهـەمدا سـەری هـەڵداو هـەر لـەم سـەدەیەماندا بـووە ئەنترۆپۆلۆژیایـەکی تۆتالیتـار و پراکتیکێکـی پیشەسـازی بـۆ جینۆسـاید: بـەڵام شـتێکی لـەم بابەتـە هـەرگیز نـەیدەتوانی لـەدایکبێت، ئەگـەر پێشـتر، چـەندین سـەدە پێشـتر، هـەر لـە سـەردەمی سـەرەتای "قەشـەکانی کڵێسـەوە"[43]، مشـتومڕێك نەبوایـە بـە نـاوی "ئـانتی جودایـزم - دژەجودا"وە، کە لە نێو خەڵکە هەژار و داماوەکەدا بووە ئانتی سێمیتیزمێکی پراکتیکی کە توانیویـەتی بـە درێژایـی سـەدەکاندا و بـە نـاو هـەموو گەڕەکـە یەهودیەکاندا تێپەڕێ و خۆی بگەیەنێتە ئەو ساڵانە. تیۆرەکانی "ئانتی جاکۆبینـەکان"[44] لەبارەی پیلان و دەسیسـەی جوداییـەوە، کـە لـە سـەرەتای سـەدەی ڕابـووردوودا پـەیدا بـوون، نـەیانتوانی ئـانتی سێمیتیزمێکی میللی دروست بکەن، بەڵکو توانیان "استغلال"ی ڕقێك بکەن بەرامبـەر جیاوازەکـان کـە پێشتر هەبوو. "نا - تۆلـێرانس"ی هـەرە ترسـناك، کتومت ئەوەیـە، بەبێ هیچ تیۆرەیەك و بە تەنها بـە هـۆی کاریگـەریی هـاندەرە سـادە و سـاکارەکانەوە سـەرهەڵبدات. هـەر لەبەرئەمەشـە نـاتوانرێ ڕەخنـە بکـرێ و بـە بـاس و بابەتـە عەقڵانیـەکانیش ڕاناوەستێنرێ. بنچینـە تیۆریـەکانی "*Mein Kampf* - تێکۆشانم"[45] دەتوانرێ بەیەك دنیا باس و بابەت بسـەلمێنرێن، بـەڵام هـەر هـەموویان بابـەتی سـادە و ساکارن، خۆ ئەگەر ئەو بیر و بۆچوونانـەی کـە ئـەو دەریدەبڕین، توانیبێتیان بژین و خۆیـان لـە هـەموو بەربەرەکانی و دژایەتیەك پاراستبێ، تەنها لەبەرئەوە بووە کە شانیان دادابووە سەر "نا - تۆلێرانس"ێکی کێویی، کە بە هیچ ڕەخنەیەك تەڕ نابێ. من "نا - تۆلـێرانس"ی گروپـی "یـەکگرتووی ئیتـالی"م لـەلا ترسناکترە لە "نا - تۆلـێرانس"ی بەرەی نیشتمانی "لێ پێن - *Le pen*"[46]. چونکە هەتا ئێستاش "لێ پێن" ئەو "کاهن - ڕەبەن" و قەشانەی لە پشتەوەیە کـە خیانـەتیان لێکـردن، بـەڵام "بۆسسـی -*Bossi*- سەرۆکی یەکگرتووی ئیتالی" هیچ شتێکی نییـە، لە هاندەرە کێویەکان زیاتر.

ئاگادارن لەم ڕۆژانەدا لە ئیتالیا چی ڕوویداوە، پاش ئـەوەی لـە مـاوەی هەفتەیـەکدا دوانـزە هـەزار ئەلبانی هاتنە ناو وڵاتەکەمانـەوە. مۆدێلـی گشـتی و ڕەسمی ئەوە بووە کە باوەشیان بۆ کراوەتـەوە، بـەڵام زۆرینـەی ئەوانـەی دەیانـەوێ ڕێ لـەم لێشـاوی پەناهەندانە بگرن، چونکە پێیان وایە ئیـدی جڵـەو ناکرێ، باس و بابـەتی ئابوری و دیمۆگرافی دێننـە پێشـەوە. مەگـەر نـازانن لـە بەرامبـەری "نـا - تۆلێرانس"ێکی خشۆکدا کە ڕۆژ دوای ڕۆژ پانتایی زیـاتر داگیردەکـا، هـەرچی تیۆرەیـەك هەیـە دەبێتـە خاڵیگەیـەکی[47] چـۆڵ و هـۆڵ. "نـا - تۆلـێرانس"ی کێویـی خـۆی لەسـەر بچوکـترین درز و کەلەبـەر دادەمـەزرێنێ کـە دواتـر قـەرز دەدات بـە هەموو تیۆرەیەکی "ڕاتسیزم"ی پاشەڕۆژ: ئەگەر لە کـۆی ئـەو ئەلبانیانـەی لـە سـاڵانی ڕابـووردوودا هاتونەتـە ئیتالیـاوە، هـەندێکیان لـێ بووبێتـە دز و جـەردە یـان سـۆزانی (کـە ئەمـەش ڕاسـتە)، مانای ئەوە نییـە ئیـدی هـەموو ئەلبانیـەك دزە یـان سۆزانییە.

ئەم درز و کەلەبەر دروست بوونە، یان بڕواو متمانە نەکردنە بە خەڵکی تر، زۆر زۆر ترسناکە، چونکە بۆ هەر یەکێ لە ئێمە دەبێتە هاندەرێکی هەمیشە ئامادە: هێندە بەسە لە فرۆکەخانەی وڵاتێکدا جانتاکەمان لێ بدزن بۆ ئەوەی بگەڕێینەوە ماڵەوە و پشتگیری لەوە بکەین کە پێویستە بڕواو متمانە بە خەڵکی ئەو وڵاتە نەکرێ و بە دز و جەردە پێناسە بکرێن.

هێشتا "نا – تۆلێرانس"ی هەرە سامدار ماوە باسی بکەین، ئەویش ئەوەی هەژارانە، کە هەر خۆیان یەکەمین قوربانی جیاوازیەکانن. لە نێوان دەوڵەمەندەکاندا راتسیزم نییە. دەوڵەمەندەکان بەرهەمیان هەیە، ئەوپەڕی پەنا دەبەنە بەر تیۆرەکانی راتسیزم؛ بەلام هەژارەکان لایەنە پراکتیکیەکەی بەرهەمدێنن، کە زۆر زیاتر مەترسیدارە.

رووناکبیران ناتوانن خەبات لە دژی "نا – تۆلێرانس"ی کێویی بکەن، لەبەرئەوەی لە بەرامبەری ئاژەڵایەتیەکی پوختی بێ بیرکردنەوەدا هەرچی فیکر و بیرکردنەوەیەك هەیە خۆی بەبێ چەك دەزانێ. بەلام کاتێك خەبات لە دژی "نا– تۆلێرانس"ی خاوەن "تیۆرە" بڕیار دەدرێ، ئیدی کات زۆر درەنگە، چونکە کە نا – تۆلێرانس بووە "تیۆرە" ئیتر بەربەرەکانێکردنی گەلێك درەنگە، ئەوانەش کە مەحکومن بەو خەباتە، هەر خۆیان دەبنە یەکەمین قوربانی.

لە لایەکی ترەوە، پەروەردەکردنی گەورەکانیش لەسەر تۆلێرانس، ئەوانەی بەهۆی بیروڕای ئەتنی و ئاینییەوە فیشەك بەیەکترەوە دەنێن، لە کات بەفیڕۆدان زیاتر هیچی دیکە نییە. بەڕاستی ئیتر زۆر درەنگە. کەواتە پێویستە لە ڕەگوڕیشەوە، لە سەرەتای ژیانەوە، لە قۆناغی هەرە ساواییەوە، خەبات لە دژی "نا – تۆلێرانس"ی کێویی بکەین، ئەمەش بە هۆی پەروەردەکردنێکی یەکسان و بەردەوامەوە، بەرلەوەی یەك کتێب لەبارەیەوە بنووسرێ، بەرلەوەی نا – تۆلێرانس ببێتە توێژێ لە هەڵسوکەوت و ڕەفتاری ڕەق و ئەستوور.

### 3- لێنەبووردن.

هەندێ پرسیاری ناخۆش مرۆڤ بێزاردەکەن، وەك ئەوەی کاتێك بە ئاستەم لێوی خۆت دەگەزی، دەمودەست لەبەردەمتا قووت دەبنەوە "ئەوە چییە؟ چی بووە؟ چیتە؟". یان وەك ئەوەی، لەم ڕۆژانەدا کە سەرجەمی ئیتالیا (جگە لە چەند کەسێك) بە جدی بیر لە کێشەکەی "پریبکە – *Priebke*" دەکەنەوە، لە تۆ دەپرسن "چۆن بیری لێ دەکەیتەوە؟"، کاتێکیش لە وەڵامدا باسی بێزاریی و شپرزەیی خۆت دەکەی، ڕاستەوخۆ بێ هیوا و نائومێد دەبن، چونکە هەرکەسێ کە پرسیار دەکات، هیوایەکی زۆری بەوە هەیە لە وەڵامەکاندا ووشەیەك یان لێکدانەوەیەکی ئارامبەخش ببیستێ و بێزاریی و شپرزەیی خۆی پێ کەمکاتەوە. مرۆڤ هەست بە شەرم دەکات لە ڕیزی ئەو شارەزا و زانایانەدا قسە بکات کە "لەمسەری چەپەوە بۆ ئەوسەری ڕاست" ڕیزیان بەستووە و دەیانەوێ بە نرخێکی هەرزان ڕایەکی گشتی دروست بکەن. بەم دوادواییە ئەڵێی دادگای سەربازی ڕۆما توانیویەتی هەموو ئیتالیا یەکبخات. هەمووومان لایەنگری هەق و دادپەروەرین.

ئەگەر ئەم کێشەیەی "پریبکە" (وەك تاوانبارێك کە دانی ناوە بە تاوانەکەیدا و دادگاش بە شەرم و ترسەوە مامەڵەی لەگەڵدا کردووە) کە پێدەچێت چیتر هەستی کەس نەبزوێنێ و بخرێتە پەراوێزەوە، سنووری کێشەیەکی تاکەکەسی بەزاند و بوو بە جۆرە کێشەیەکی تر، ئایا هەر نەبێ ئەو گومانەمان لا

دروست ناكات كە ئێمەش خۆمان بەبێ تاوان نەزانین؟

ئەگەر بەپێی تێگەیشتنەكانی یاسای باو "ئەوەی هەنووكە كاری پێدەكرێت" ڕووداوەكە هەڵسەنگێنین، لەوانەیە "پریبكە" حوكم بدرێ بە "مەرگ"، خۆ ئەگەر بەپێی چەمك و تێگەیشتنەكانی زانستی یاسا ڕەفتار بكەین، ناتوانین تەنانەت بە دادگای سەربازیی ڕۆما بڵێین بەشێوەیەكی ناماقوڵ مامەڵەی لەگەڵدا كردووە، چونكە ئەوانیش وەكو هەموو دادگایەك، گەرچی لەبەردەمی تاوانبارێكدان كە دانی ناوە بە تاوانێكی زۆر ترسناكدا، بەڵام گەڕاون بەدوای هەموو ئەو بەڵگە و كەرەسە یاساییانەدا كە ئەو حوكمە كەمتر بكاتەوە. بە هەر حاڵ، ئەو سەردەمە، سەردەمی هەرە سەخت بوو، "پریبكە"ش پاڵەوان نەبوو، داماوێكی هەڵخەڵەتاو بوو، خۆ ئەگەر بەر لە ڕاپەڕاندنی كارەكەی زۆر بە باشی پێوانەی گەورەیی تاوانەكەی بكردایە، هەر نەیدەتوانی لەو ترسە گەورەیە ڕزگاری بێت كە لە كاتی ڕانەپەڕاندنی كارەكەیدا هەڕەشەی لێدەكرد: لەبەرئەوەی چەند كەسێكی زیاتری كوشت، هەمووشمان دەزانین، كاتێك مرۆڤ بە خوێن مەست دەبێ، ئیتر دەبێتە درندە؛ بە هەرحاڵ، ئەم مرۆڤە تاوانبارە، زۆر باشە، ئەی بۆ لەبری ئەوەی سزا بدرێ بە "مەرگ"، سزا نەدرێ بە زیندانی هەتاهەتایی؛ خۆ لەم حاڵەتەشدا دادپەروەریی هەر پارێزراوە و پیاوانی یاساش بەپێی بنەماكانی كارەكەیان ڕەفتاریان كردووە، بەو شێوەیە دەمانتوانی دۆسیەی كارەساتێكی ئازاراویی ئەرشیف بكەین. بەڵام ئێمە تەنانەت لەگەڵ "ڕاسكۆلنیكۆڤ"یشدا بەو شێوەیە ڕەفتارمان نەكرد، كە تەنها یەك پیرەژنی كوشتبوو، ئایا لەبەرئەوە بوو كە هیچ جۆرە پاساو هێنانەوەیەكی سەربازیی نەبوو؟

هەر ئێمە بووین داوامان لە دادوەرەكان كرد، بەپێی یاسای باو ئەو تاوانبارە حوكم بدەن، ئێستەش هەر خۆمان پێشنیازی پێداویستیەكی مۆراڵی و عاتفیان دەخەینە بەردەم؛ بەڵام ئەوان لە وەڵامدا دەڵێن ئێمە پیاوانی "عەبارەش"[48]ی یاساناسین، بكوژ نین.

لەگەڵ ئەوەشا كە بەشی زۆری ڕەتكردنەوەكان لە دەوروبەری چۆنێتی لێكدانەوە و ڕاڤەكردنی ئەو نۆرمانە دەخولێنەوە كە پێشوەخت نووسراون. ئایا "پریبكە" دەبوایە ئەو كارە جێبەجێ بكات كە پێی سپێردرابوو، لەبەرئەوەی یاسای سەربازی وڵاتێك وا دەخوازێ كە لە دۆخی شەڕدا بێ، بێگومان نەخێر، تەنانەت نازیەكانیش چەند یاسایەكیان هەبوو كە ڕێگەی بە نازیستەكان دەدا ئەو ئەرك و فەرمانانە جێبەجێ نەكەن كە بڕوایان پێی نییە، لەمەش زیاتر، نەیاندەتوانی بەپێی یاسا سەربازیەكان مامەڵەیان بكەن، چونكە هێزی "S. S"[49] هێزێكی پۆلیسی خۆبەخش بوو؛ بەڵام ڕێكەوتننامە نێودەوڵەتیەكان ئەو مافەیان بۆ وڵاتان مسۆگەر كردووە كە بە هێزی سەربازیی وەڵامی دەستدرێژییەكان بدەنەوە، بێگومان ئەمەش بە تەنیا لە حاڵەتی جەنگێكی ڕاگەیەنراودا، لەم ڕووەوە پێ ناچێت ئەڵەمانیا بە هیچ شێوەیەك لە دژی ئیتالیای پاشایەتی جەنگی ڕاگەیاندبێ، كەواتە ئەو ئەڵەمانیانەی لە ناو ئیتالیادا بوون، هێزێكی داگیركەری سەرپێچیكار بوون لە ناو خاكی ولاتێكدا كە بە ڕەسمی لە جەنگدا نین، هەر ئەمەش بوو هۆی ئەوەی كە ئەڵمانیەكان نەیاندەتوانی هیچ گلەیی و گازندەیەك بكەن، ئەگەر كەسێك خۆی لێ بكردنایە بە "كەنناس"ێك و بۆمبێكی بهاویشتایەتە نێو مەفرەزەیەكی گەڕۆكیانەوە.

بەردەوام لەناو ئەم بازنەیەدا دەخولێینەوە، هەتا مرۆڤایەتی بڕیار دەدات کە پێویستە لە بەرامبەری ڕووداوی نوێ و تایبەتیدا کار بە یاسای باو نەکرێت، بەڵکو دەبێ لە ئاستی لێپرسینەوەدا بین و یاسای نوێ بەرهەم بێنین.

ئێمە هێشتا باسمان لە کۆی پاشهاتەکانی ڕووداوی سەردەم نەکردووە، کە ئەویش پرۆسەی دادگایکردنەکەی "نۆریمبێرگ"[50]ە. لە میانەی تێگەیشتنە یاساییە پوختەکان یان داب و نەریتە نێودەوڵەتیەکانەوە دادگایکردنێکی ڕەوا بووە. ڕایان هێنابووین کە جەنگ یارییەکی نەخشەبۆکێشراو بوو، کە لە کۆتایدا "پاشا"ی دۆڕاو باوەش دەکات بە "ئامۆزا" براوەکەیدا، ئەی ئێوە چی ئەکەن؟ دۆڕاوەکان دەگرن و لە سێدارەیان دەدەن؟ لە وەڵامدا ئەوانەی بڕیاری "نۆریمبێرگ" یان دابوو، دەڵێن: بەڵێ گەورەم، لە سێدارەیان دەدەین: با وای دانێین لەم جەنگەدا هەندێ کارەسات ڕوویانداوە کە سنووری "تۆلێرانس" یان بەزاندووە، لەبەرئەوە دەبێ نۆرمەکان بگۆڕین. بەڵام ئەو ڕووداوانە بەپێی بەهاکانی ئێوەی براوە "نا -تۆلێرانس"ن، ئێمە بەهای جیاوازمان هەبوو، ئایا ڕێزیان لێ ناگرن؟ نەخێر، چونکە ئێمەش بردوومانەتەوەو ئێوەش لە بەهاکانی خۆتاندا بەچاوی ڕێزەوە ڕوانیوتانەتە "هێز"، ئێمەش هێزتان لەگەڵا بەکاردێنین و لە سێدارەتان دەدەین: کێ دەزانێ جەنگەکانی پاشەڕۆژ چۆن دەبن؟ ئەوەی بەشداری جەنگ دەکا، پێشوەخت دەزانێ، ئەگەر دۆڕاندی، لە سێدارە دەدرێ؛ کەواتە بەر لە دەستپێکردن بیرێکی باش بکەرەوە. ئەی خۆ ئێوەش کاری ناشرین و درندانەتان کردووە! بەڵێ، بەڵام ئەمە قسەی قسەکەرێکی دۆڕاوە، ئێمە بردوومانەتەوە، لەبەرئەوە ئێمەین کە ئێوە لە سێدارە دەدەین. بەڵێ باشە، بەڵام ئەو لێپرسینەوەیە دەخەنە ئەستۆی خۆتان؟! بەڵێ ئەو لێپرسینەوەیە دەگرینە ئەستۆ.

من دژی هەموو جۆرە سزایەکم بە "مردن"، ئەگەر خودی "هیتلەر"یشم بکەوێتە بەردەست، لەبری حوکم بە "مەرگ"، ڕەوانەی زیندانی "ئەلکاتراز – *Alcatraz*"[51]ی دەکەم: هەر لەبەرئەمە، لێرە بە دواوە وشەی "هەڵواسین"، بە مانا سیمبۆلیەکەی، بەکاردێنم بە مانای سزادانی توندو تیژی تاوانباران. بەڵام بە دوور لە وشەی هەڵواسین، ئایا شێوەی بیرکردنەوەو لێکدانەوەی نۆریمبێرگ، جۆرە کەرتبوون و لێک جیابوونەوەیەك دروست ناکات. لە بەرامبەر هەڵسوکەوت و مامەڵەی نا - تۆلێرانسدا پێویستە توانست و وورەی گۆڕینی نۆرمەکانمان هەبێ، بە یاساکانیشەوە. ئایا دادگایەك لە هۆڵندە دەتوانێ هەڵسوکەوت و مامەڵەی کەسێك تاوتوێ بکات کە خەڵکی "سیبریا یان بۆسنە" بێت؟ بەپێی نۆرمە کۆنەکان نەخێر، بەپێی نۆرمە نوێیەکان بەڵێ.

لە کۆتایی ساڵی *1982*دا لە پاریس، کۆنفرانسێك سازکرا لەبارەی بابەتی "تەدەخولی سەربازیی"یەوە، چەندین یاساناس و ئەفسەر و پاسیفیستی خۆبەخش و فەیلەسوف و سیاسەتمەدار بەشدار بوون. ئایا بەپێی چ مافێك و چ پێوانەیەکی پێشبینی کردن دەتوانرێ تەدەخولی سەربازیی بکرێت لە ناو ڕووداوەکانی وڵاتێکی دیکەدا کاتێك وای بۆ دەچن هەندێ شتی نا - تۆلێرانس ڕوودەدا بۆ سەرتاپای کۆمەڵگای نێودەوڵەتی؟ جگە لەو حاڵەتە دەگمەنەی وڵاتێك کە هێشتا ڕژێمێکی باوەڕپێکراو و هەڵبژێردراوی هەیە و داوای کۆمەك و یارمەتی کردبێت لە دژی داگیرکار و دەستدرێژیی دەرەوە، ئیتر سەرجەمی حاڵەتەکانی دیکە بەرهەمی بڕوبیانوو و نیاز و مەبەستی شاراوە

بوون. ئایا کێ داوای تەدەخولم لێدەکات؟ بەشێك لە هاووڵاتیان؟ چەند ئەو بەشە نوێنەرایەتی وڵاتەکە دەکات، هێندەش تەدەخولێکی سەربازیی بە جۆرەها بروبیانوی ڕەوا پیلانێك دادەپۆشێ، ئایا ئەمەش ویستێکی ئیمپریالیانە نییە؟ ئایا کاتێك تەدەخولی سەربازیی دەکرێ کە ئەو شتانەی لەو وڵاتەدا ڕوودەدەن دژی پرینسیپە ئاکاری و مۆراڵییەکانی ئێمە بن؟ بەڵام ئایا پرنسیپەکانی ئێمە هی ئەوانیشن؟ تەدەخولی سەربازیی دەکرێت لەبەرئەوەی لە وڵاتێکدا هەزاران ساڵە پراکتیکی "کانیبالیزم - گۆشتی مرۆڤ خواردن" دەکرێ، کە لای ئێمە کارێکی ترسناك و تۆقێنەرە بەڵام لای ئەوان سرووتێکی ئاینییە؟ ئایا بەم شێوەیە مرۆڤی سپی پێست خۆی بە زانست و زانیاریی پڕچەك کردووەو میللەتانی ژیارە دێرینەکانی خستۆتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە، تەنها لەبەرئەوەی لە ئێمە جیاوازبوون؟

تەنیا وەڵامێك لەمبارەیەوە بە شیاوی بزانم ئەو وەڵامەیە کە "تەدەخولی سەربازیی" و "کردەی شۆڕش" وەکویەك دەبینێ: لە هیچیاندا بەپێی یاسایەکی ئامادە ئەو کارە ئەنجام نادرێ، بە پێچەوانەوە ئەو کارە بۆ هەڵتەکاندن و لە دژی یاسا و شتەباوەکان دەکرێ. تەنیا جیاوازییەکیش لە نێوانیاندا ئەوەیە کە تەدەخولی سەربازیی بڕیارێك نییە لە لوتکەی ئەڵماسێکەوە ببریسکێتەوە یان لە بزاڤی کۆمەڵە مرۆڤە ڕاپەڕیووەکانەوە سەرهەڵبدات، بەڵکو بڕیارێکە لە گفتوگۆیەکی نێوان ڕژێمەکان و نەتەوە جیاوازەکاندا دەدرێ. کاتێکیش باس لە ڕێزگرتنی ڕاوبۆچوون و داب و نەریت و شێوەی هەڵس و کەوت و بیروڕای ئەوانی تر دەکرێت، هەندێ شت وەك "نا - تۆلێرانس" دێنە بەرچاومان. قبوڵکردنی "نا - تۆلێرانس"یش خودی شوناسمان دەخاتە کێشەوە. کەواتە پێویستە لە ئاستی لێپرسینەوەدا بین و بڕیاربدەین چ شتێ "نا - تۆلێرانس"ە و پاشان ڕەفتار بکەین، بێگومان دەبێ ئامادەش بین نرخی هەڵەکانمان بدەین.

کاتێك بۆ یەکەمجار "نا - تۆلێرانس"ی نوێ و بێ وێنە پەیدا دەبێت، ئیتر کەنارەکانی "نا - تۆلێرانسبوون" ئەو کەنارانە نامێنن کە یاسا کۆنەکان دیاریان کردبوو. بەڵکو دەبێت کەناری نوێ بەپێی یاسای نوێ دیاری بکەین. بێگومان پێویستە دڵنیا بین کە ئەم کەنارە نوێیانەی "نا - تۆلێرانسبوون" جێی ڕەزامەندی بەرفراوانترین خەڵکن، دەبێت سنوورەکانی تاکە وڵات ببەزێنن و بەشێوەیەك لە شێوەکان "کۆی کۆمەڵگاکان" گەرانتی بکەن - ئەمەش کۆنسێپتێکی بزۆزە و بە ئاسانی خۆی نادا بەدەستەوە، گەرچی بەشێکە لە بنچینە هاوبەشەکان، تەنانەت بەشێکە لە بناغەی باوەڕی هاوبەشمان بە سووڕانەوەی زەوی. بەهەرحاڵ سەرئەنجام پێویستە ئێمە هەڵبژاردن بکەین.

ئەو کارەساتانەی بەهۆی "نازیزم و هۆلۆکۆست"ەوە ڕوویانداوە کەنارێکی نوێیان بۆ "نا - تۆلێرانسبوون" دیاریکردووە. هەرچەندە بە درێژایی سەدەکانی ڕابووردوو، چەندین جار و لە چەندین شوێن جینۆساید کراوە، ئێمەش لە هەر هەموویان بووراوین. ئەم لێبوردنەشمان هۆی زۆرە، جارێك لەبەرئەوەی لاوازبووین، جارێکی دیکە چونکە بەربەریی بووین، یان لەبەرئەوەی نەماندەزانی "10میل" لەودیوو گوندەکەمانەوە چی ڕوویدەدا. بەڵام ئەم جینۆسایدە مۆدێرنە، کە بە نووسراوی ڕەسمی و بە بەکارهێنانی چەمکە "زانستییەکان" ڕاگەیەنراوە (و جێبەجێ کراوە)، بە وشەی ئاشکرا و گوزارشتی ڕوون داوای ڕەزامەندی گشتی و تەنانەت فەلسەفی بۆ کراوەو وەك

مۆدێلێکی "گەردوونی" پڕوپاگەندەی بۆ کراوە. ئەمە بە تەنها کاری نەکردە سەر هوشیاری مۆڕالیمان: بەڵکو فەلسەفە و زانست و کەلتوور و تەنانەت بیروڕامان لەبارەی چاکەو خراپەوە، هەر هەمووی خستە سەر چۆك و پاشەوپاش بەرەو خاڵی سەرەتا ڕایکێشانە دواوە. لە بەرامبەر بانگەوازێکی ئاوادا نەدەکرا بێدەنگی هەڵبژێرین، هەر دەبوو وەڵام بدەینەوە، تەنها وەڵامێکیش کە شیاو بێ، نەك هەر تەنها لەو ساتەوەختەدا، بەڵکو دوای پەنجا ساڵ و دوای چەندین سەدەش، هەر ئەوە دەبوو کە بڵێین: مەحاڵە ئەمجارە لێیببوورین.

لەبارەی ئەم "نا - تۆلێرانس"ەوە، بیروبۆچوونە بەدەکانی "نەخێرگەرایی - نێگەتسیۆنیزم *Negazionism*"[52]، گومانە قێزەونەکانی خۆیان دەربڕی و لە ڕاستی ژمارەی قوربانیەکان کۆڵینەوە تا بزانن ئایا ڕاستە "شەش" ملیۆن مرۆڤ بوون، وەك ئەوەی کوژرانی پێنج، چوار، دوو یان یەك ملیۆن بواری چاوپۆشی و ڕێکەوتنی ناوکۆیی تیا بێت. ئایا ڕاستە کە هەموویان لە ژووره گازییەکاندا خنکێنراون، یان تەنها بەهۆی باری خراپی ژیان و گوزەرانەوە مردوون؟ یان زۆر بەئاسانی بەهۆی "ئەلێرجی - حساسیة"یانەوە بە "خاڵ کوتاندن" ژیانیان لەدەستداوە!

بەڵام داننان بە نا - تۆلێرانسدا، مانای ئەوەیە لە نۆرێمبێرگ دەبووایە هەر هەموویان سزا بدرێن بە "هەڵواسین"، گەرچی تەنها یەك کەسیش، ئەویش بەهۆی پشتگوێخستن لە فریاکەوتنی سەرەتایدا مردبێ چونکە ئەم "نا - تۆلێرانس"ە نوێیە تەنها جینۆساید نییە بەڵکو تیۆرێزەکردنەکەیەتی. ئەمەش بەرۆکی هەموو تاوانبارەکان دەگرێ و هەموویان دەخاتە بن لێپرسینەوەی توندەوە، بەو کرێکارە داماوانەشەوە کە بە کرێی ڕۆژانە لەو تراژیدیا تۆقێنەرەدا کاریان کردووە. لە بەرامبەری نا - تۆلێرانسدا هەموو بیانوویەك بۆ خۆپەراندنەوە پوچەڵ دەبێتەوە، وەك ئەوانەی کە ووتویانە "من مەبەستم ئەوە نەبوو" یان "من بە دڵپاکیەوە کارم کردووە" یان "هەڵەبووم": چونکە تەنها یەك لێپرسینەوەی بابەتی هەیە و بەس. یان هەیە (ووتویەتی) من بە تەنها پاڵم ناوە بە زەلامەکانەوە بۆ ناو ژووره گازییەکان، ئەمەش لەبەرئەوەی فەرمانیان پێدەکردم و لە ڕاستیشدا وامدەزانی لەو ژوورانەدا لە میکرۆب و پیسی پاکیان دەکەنەوە. ئەوانەی دەیڵێی هیچی بەلای منەوە گرنگ نییە، زۆر بە داخەوە، ئێمە لێرەدا لە بەرامبەری "ئێپیفانیە - *Epifania*"[53]ی نا - تۆلێرانسدا وەستاوین، یاسا کۆنەکان و هەوڵەکانیان بۆ کەمکردنەوەی سزاکان، لە کار کەوتوون و بەکەڵك نەماون: لەبەرئەوە تۆش، وەك ئەوانی تر بە پەتی سێدارە سزا دەدەین.

بۆ ئەوەی کۆمەڵگایەك خۆی بگەیەنێتە ئاستی ئەم نۆرم و یاسایانەی مەترسییەکان ناهێڵن (کە هەمان شت دەبن بۆ "نا - تۆلێرانس"ەکانی پاشەڕۆژ، ناچارین ڕۆژ لە دوای ڕۆژ بە دوای جێگای نا - تۆلێرانسدا بگەڕێین و بیدۆزینەوە) دەبێ ئامادەبێ چەندین بڕیاری چارەنووسساز بدات، بە هەندێ بڕیاری توند و تیژەوە، هەروەها دەبێ لەناوخۆدا ڕیزەکانی خۆی پتەوبکات و یەکگرتوو بێت تا بتوانێ هەموو لێپرسینەوەیەك لە ئەستۆ بگرێت. ئەو مەسەلەیەی، وەك گۆشەیەکی تاریك و نادیار، لە کێشەکەی "پریبکە"دا سەغڵەتمان دەکات، ئەوەیە کە هەست بە دووری خۆمان دەکەین لە بڕیارێکی لەو چەشنەوە، بە لاووپیرمانەوە، بە ئیتالی و بیانیەوە، هەموومان هێشتا زۆر دوورین. هەموومان دەستمان لە کێشەکە شتووە و وتومانە: یاسا هەیە، با دادگا لەگەڵ ئەم وەحشیەتەدا مامەڵە

بکات. ئەمڕۆ پاش دادگایکردنەکەی ڕۆما، بۆمان ئاشکرابوو کە چەند دووریـن لـە پێناسـەکردنێکی پتەو و یەکگرتووی "نا - تۆلێرانس"ەوە، باشە خۆ پێشتریش هەر زۆر دووربووین. ئەم هەستەش هێدی هێدی دەمانکرۆژێ. بۆمان ڕووندەبێتەوە (بەلاّم دانی پیانانێین) کە ئێمەش، بەشـێوەیەك لـە شـێوەکان بەرپرسین.

دە کەواتە با داوا لە کەس نەکەین "زەنگەکە بۆ کێ لێدەدا؟".

بـۆ ئـەم زانیاریانـەی خـوارەوە کـەڵکم وەرگرتووە لە:

*1-Vocabolario della lingua italiana – GARZANTI.*

*2-Petit Robert.*

*3-Enciclopedia Britanica.*

## پەراوێزەکانی وەرگێڕ

*ناونیشانی ئەم ووتارە بە ئیتالی: *Le migrazioni, La Tolleranza e Lintollerabile*.

. تۆلێرانس -*Tolleranza*- بە مانای لێبوردن و پێکەوە هەڵکردن دێت و لەمەش زیاتر سەرەتای پەیدابوونی ئەم چەمکە دەگەڕێتەوە بۆ بەیەکدادانی ئاینەکان. لەو کاتەدا بە مانای قبوڵکردن و بە ئاشتی ژیان هاتووە لەگەڵ ئەوانەدا کە بڕوای ئاینیان جیاوازە. لە ئێستادا بە مانای قبوڵکردن و هەڵکردن دێت لەگەڵ هەموو ئەوانەدا کە شێوەی بیرکردنەوەو هەڵس و کەوت و ڕەفتار و دید و بۆچوونیان جیاوازە.

. نا- تۆلێرانس -*Intolleranza*- واتە قبوڵنەکردن، هەڵنەکردن، پێکەوە نەژیان و پێکەوە نەگونجان.. زیاتر مەبەست لەو ڕەفتار و کارە خراپانەیە کە هێندە دڕندانەو هێندە بە زەقی هەست و کەرامەت دەڕووشێنێ، کە کەس ناتوانێ قبوڵی بکات. بەشێوەیەکی گشتی ئەم دوو چەمکە لە خۆرئاوادا بەکاردێ بۆ ماناکانی "لێبووردن، هەڵکردن" یان "قبوڵکردن، پێکەوە ژیان، بەخشین، تەحەمول کردن" و نەفیەکانیان.

. لەم ووتارەدا (دوو کەوانە)، "دوو جووت فاریزە"، -دو خەتی بچوك- نووسەر بۆ مەبەستی خۆی داینـاون، بۆ هەندێ حاڵەتی پێویست "دوو جوت کەوانە" وەرگێڕ دایناوە.

*1-Common Era* - سەردەمی هاوبەش.

*2-Isaac de la Peyrere* - ئیسحاق دێ لە پێرێر. یەکێکە لە تیۆلۆژە هەرە ناودارەکانی ڕێبازی پرۆتستانت، فەرەنسییە و بیروبۆچونەکانی هێندە کڵێسەی سەغڵەت کردووە، بەشێوەیەك وەك (خوانەناس - کافر) پێناسە کراوە.

*3*-ئافراندن: خوڵقاندن: دروستکردن.

*4-Colombo* - مەبەست لە "کریستۆفەر کۆڵۆمبس"ی دۆزەرەوەی ئەمەریکایە.

*5-Academie Universelle des Cultures* .. ئەکادیمیای گەردوونی کەلتوورەکان.

*6-meticciato di Culture* - مەبەست لە تێکەڵاوبوونی کەلتورەکانە لە ڕەوگەکاندا، کە بە هۆی تێکەڵاوبوونی خوێنەوە، زۆرجار چەشنە کەلتورێکی نوێ دروست دەبێ.

*7-melting pot*، زاراوەیەکی ئینگلیزییە، واتە لەناو یەکتردا توانەوەی کەلتور و ئێتنییە جیاوازەکان.

*8*-واتە خەڵکی ولاّتی (پۆرتۆریکۆ).

*9-Tradizione* - ترادیتسیۆن: مەبەست لە هەموو ڕەفتار و بیروڕاو داب و نەریتێکی بۆماوەو کۆنە، یان بنەماڵەیی و خێزانییە.

*10-wasp*: کورتکراوەی ئەم چوار ووشەیەیە: *White Anglo - saxon Protestant* واتە ئەو سپی پێستانەی "ئینگلیز - ساکسۆن"ی پرۆتستانت بوون. مەبەست

لەوانەیە کە خۆیان بە دانیشتوانی سەرەکی و بنچینەیی ئەمەریکا دەزانن و نەوەی ئەوانەن کە لە سەرەتاوە ئەو کیشوەرەیان ئاوەدان کردۆتەوە.

*11–Creolo* – کریۆلۆ – مەبەست لەوانەیە کە لە کۆلۆنە فەرەنسی و ئیسپانیەکانی ئەمەریکای لاتیندا، لەدایکبووبن، لە دایك و باوکی بە نەژاد و ڕەگەز جیاواز. یان بەو کەسانە وتراوە کە باوکیان سپی پێست و دایکیان هیندی سوور بووە. (دوو ڕەگ).

*12*–واتە خەڵکی وڵاتی (*Peru* – پیڕۆ).

*13*–واتە خەڵکی وڵاتی (جامایکا – *Giamaica*).

*14– Nostalgico*– نۆستالجیك: ئەو کەسەی حەز بە گەڕانەوەی دەسەڵاتێکی بەسەرچوو بکات، زیاتر مەبەست لەوانەیە کە دەخوازن فاشیزم بگەڕێتەوە. *Reazionario* – ڕێئاتسیۆنار: وابەستەبوون بە بیروباوەڕ و ڕەفتاری کۆمەڵایەتی و سیاسی بەسەرچووەوە، زۆر بە توندی وەستان لە دژی هەموو بزاڤێکی نوێکار و پێشکەوتووخواز (بەتایبەتی لە بواری کۆمەڵایەتی و سیاسیدا).

*15–immigrazione* – ئیمیگرەیشن: نووسەر لەم ووتارەدا بە مانای (پەنابردن) بەکاریهێناوە.

*16–Migrazione*: میگرەیشن: نووسەر بە مانای (هیجرەتکردن) بەکاریهێناوە. کە دەکرێ لە کوردیدا ووشەی "ڕەوکردن"ی بۆ بەکاربێنین.

*17–Romano-Barbariche* ، *Romano-Germaniche* :

*Romano-Barbarico*: ڕۆمانی – بەربەریی: مەبەست لەو دیاردە زمانەوانی و کەلتوریانەیە کە بە هۆی تێکەڵاوبوونی ژیانی ڕۆمەکان و مەسیحییەکان لەگەڵ ژیارە بەربەریەکاندا سەریان هەڵداوە و پەیدابوون. بوونەتە خەسڵەتی سەردەمێکی ئاشکرای ژیان لەو ژیارانەدا.

*Romano-Germanico*: ڕۆمانی – جەرمانی: مەبەست لەو دیاردە مێژوویی و زمانەوانی و کەلتوریانەیە کە بە هۆی تێکەڵاوبوونی نێوان ژیاری ڕۆمەکان و ژیاری میللەتە جەرمانیەکانەوە سەریانهەڵداوە. میللەتی جەرمانی وەك (ئینگلیز، هۆڵەندی، ئەڵمانی، دانمارکی، سویدی...هتد).

*18*–مەبەست لە هیندیە سوورەکانە، کە دانیشتوانی ڕاستەقینەی کیشوەری ئەمەریکان.

*19*–بەو نیمچە دوورگەیە دەوترێ: *iberica* – ئێبێریکە.

*20*–واتە دورگەکانی ئۆقیانووسی (هادی – ئارام).

*21*–وەك ئەو (*ghetto* – گێتتۆ) یانەی بۆ یەهودیەکان دروستکرابوون.

*22–Romano patrizio* – لە ڕۆمای دێریندا (*patrizio*) پایەیەکی کۆمەڵایەتی بووە، کە دراوە بە ئەندامانی خێزانە (خاوەن زەوی و زارەکان)، ئەوانەی دانیشتوانی هەرە ڕاستەقینەی وڵات بوون. کە پێیان وتراوە (*patres*)، سەرۆکی ئەم بنەماڵانە، ئەندامی ئەنجوومەنی (سێنات) بوون.

*23–Galli* –خەڵکی (*gallia* – گالیە)، ئەم زەویە ئەو پێدەشتە دەگرێتەوە کە رووباری (*po* – پۆ)ی پیادەڕوا، واتە فەڕەنسای ئەمڕۆ – لە سەردەمی ڕۆمەکاندا (گالیە)ی ناوبووە.

*24–Sarmati* – میللەتێکی کۆنە لە خێزانی میللەتە ئێرانیەکانە، زۆر نزیکن لە (شیتەکان)ەوە.

*25–Petit Robert* – فەرهەنگێکی گرنگی زمانی فەرەنسییە، *2600* لاپەڕەیە.

*26*–بە فەڕەنسی: *Dictionnaire Historique de la langue Francaise*.

*27–Cosmologia* – کۆزمۆلۆژیا – زانستی دیراسەکردنی ستراکچەر و گەشەی گەردوون.

*28*–ئەم وشەیە بە کەمێك قۆشمەییەوە لێرەدا بەکارهێنراوە لە لایەن نووسەرەوە.

*29–Tradizionalism* – ترادیتسیۆنالیزم: *1*–تیۆرەیەکی فەلسەفی و ئاینییە لە نێو کاتۆلیکی فەرەنسیدا و لە

سەردەمی (بنیاتنانەوە – تعمیرات)دا سەریهەڵدا. ئەم تیۆرەیە هەموو حەقیقەتە سروشتییەکان (وەك: نەمریی ڕۆح، بوونی خودا، یاسا مۆڕاڵییەکان.. هتد)

بە نێردراوی خودا دەزانێ، ئەمانەش هەر لە سەرەتای مرۆڤایەتیەوە (خواوەند) بۆ مرۆڤی ناردۆتە خوارەوە و لە ڕێگەی کۆمەڵگاکانەوە وەك تراديتسیۆن (عادات و تقاليد) بۆمان ماونەتەوە. *2*–ڕیزگرتن لەو دید و داب و نەریت و بیروباوەڕانەی لە کۆنەوە بۆمان ماونەتەوەو بۆمان بوونەتە کۆمەڵێ نۆرم و یاسای شێوەی هەڵسوکەوت و مامەڵەمان.

*30*–من ووشەی (کۆنخواز)م لە بەرامبەری (کۆنسێرڤاتۆر – *Conservator*)دا بەکارهێناوە.

*31–Teilhard de Chardin* – تێیلهارد دێ کاردین (فەڕەنسا *1881* – نیویورك *1955*) تیۆلۆگ و فەیلەسوفی فەرەنسییە، خاوەنی دیدێکی تایبەتیە لە تیۆلۆژیای مەسیحیدا.

*32–Political Correctness*: یان *politically correct* – زاراوەیەکی ئینگلیزیە، ئەم گوزارشتە لە بنچینەدا لە لایەن دانیشتوانی ئەمەریکای باکورەوە بەکارهاتووە – مەبەست لە ڕەفتار و شێوەی مامەڵەی پڕ ڕێز و ستایشە بەرامبەر هەموو کەسێ کە شوناس و سیاسەت و ئێتنی و ئایین و سێکس و کۆمەڵایەتی.. هتد. جیاواز بێ.. واتە سیاسەتێکی ڕاست و دروست بەرامبەر هەموو ئەو تاکە کەسانەی لە شتێکدا لەوان جیاوازن.

*33*–ئامال: واتە – نزیك بە.. (بڕوانە: هەژار، هەنبانە بۆرینە، فەرهەنگی کودی – فارسی).

*34*–وەبەرهێنان: واتە: استثمار.

*35*–شوێنگە: واتە – پۆزیشن – *Posizione*.

*36*–چەمکی (تێریتۆریالیتە – *Territorialita*) واتە: وابەستەیی بە خاکێکی دیاریکراوەوە.

*37*–ووشەی (کێویی) لە بەرامبەری (*selvaggia*)ی ئیتالیدا بەکارهاتووە.

*38*–ئەم ناونیشانی کتێبە (لاتینی)یە.. ماناکەی (خراپە و خراپەکاریی)یە. نووسەر هەر بە لاتینیەکە نووسیویەتی، بەبێ وەرگێڕانی – ئەمەش میتۆدێکی تایبەتە بە (ئیکۆ) و ئێستاش لە زۆربەی نووسینەکاندا نووسەر ڕەچاوی دەکەن، ناونیشانی کتێبەکان بە زمانی ئەسڵی دەنووسن.

*39–Umanesimo* – ئومانیزم یان هیومانیزم: *1*– لە کۆتایی سەدەی (*14*) هەتا کۆتایی سەدەی (*15*) لە شاری (*Firenze* – فلۆرەنسا)ی ئیتالی، نوێکاریەکی بەرچاو سەریهەڵدا لە بواری دیراسەکردنی فیکر و هونەر و ئەدەبدا، بەتایبەتی بۆ بەرهەمە دێرینەکان، ئەمەش وەك چالاکیەکی قوڵ و زۆر لە بواری فیلۆلۆژیادا – لە ڕووی کەلتوریەوە لەو سەردەمەدا هەوڵدرا بۆ دۆزینەوەی ڕاڤەکردنێکی دیکەی هوشیاری و شوێنگەی شایستە و گونجاوی مرۆڤ لە جیهانی سروشتدا، هەروەها گەڕان بە دوای پێوەرێکی بالاتردا بۆ زانین و توانا و کەرامەتی مرۆڤ.. *2*–بەو هەڵسوکەوتە رۆحی و کەلتوریەی ئەو سەردەمە مێژووییە دەوترێ، یان بە (کەسێك)ی داهێنەر کە ئەوپەڕی شارەزایی و هوشیاری هەبێ لەبارەی دنیای کلاسیکەوە، هاوشان بە شارەزاییەکی قوڵ لە زمان و ئەدەبی یۆنانی و لاتینیدا.

*40*–ناونیشانی ئەم کتێبە بە کوردی: (شەیتان چوونە ناو) رۆحی ساحیرەکانەوە. یان: "بەشەیتانبوونی ساحیرەکان".

*41–Jean Bodin* – ژان بۆدین: ئابوریناس و فەیلەسوفی فەڕەنسی (*1529* یان *1530–1596*).

*42–Copernico* – *1*–کۆپێرنیکۆ (*1473–1543*) پسپۆری شارەزای کۆزمۆلۆژیای پۆلۆنی. خاوەنی تیۆرەی (*eliocentrica*) – واتە ئەو تیۆرە ئەستێرەناسیەی کە دەڵێ: هەموو ئەستێرەکانی ئەم کۆمەڵەیە، بە دەوری خۆردا دەسوڕێنەوە، خۆریش بە دەوری زەویدا. یان هەر شتێ خۆر بکات بە سەنتەری خۆی. *2*–کۆپەرنیکۆیی: هەر دۆزینەوە و داهێنانێك سەرجەمی تێگەیشتن و

بۆچوونەکانی بەر لە خۆی پوچەڵکاتەوە. واتە ڕاستیەك بێتە پێش هەموو ڕاستیەکانی پێشتر بەدرۆ بخاتەوە.

*43*–مەبەست لە پیاوانی ئاینی مەسیحییە لە قۆناغی سەرەتای ئەو ئاینەدا، واتە هاوڕێیانی عیسا – یەکێك لەوانە (جودا) بووە، کە خیانەتی لێکردووە و لەو کاتەوە (دژە جودایی) دروست بوە.

*44–Giacobinism* – جاکۆبینیزم: مەبەست لە بیرو بۆچوون و ئایدۆلۆژیای جاکۆبینەکانی فەڕەنسایە، (جاکۆبین) بەوانە دەوترا کە سەر بە پارتی هەرە ڕادیکاڵی ناو پارتە سیاسیەکانی شۆڕشی فەڕەنسا بوون. ئەمانە بەوە ناسرابوون کۆڵنەدەرانە لە بەرژەوەندیەکانی میللەتدا بوون.

*45*–ناونیشانی کتێبە بەناوبانگەکەی هیتلەرە (کفاحی).

*46– Le -Pen* – لێ پێن – سەرۆکی پارتی بەرەی نیشتمانی فەرەنسییە، پیاوێکی ڕاستڕەو و کەم تا زۆر ڕەگەزپەرستە.

*47*–خاڵیگە: شوێنێ خاڵی بێت لە هەموو شتێ (بڕوانە: هەژار – هەنبانە بۆرینە).

*48*–ئەو عەبایەی پارێزەر و دادوەر دەیدەن بە شانی خۆیاندا لە کاتی دادگایی کردندا – پێی دەوترێ (*Toga*) ئەم (تۆگە)یە لە ڕۆمای کۆندا بەکارهاتووە و بۆ هەر پلە و پایەیەك ڕەنگێکی جیاوازی هەبووە.

*S.S–49* – کورتکراوەی هەردوو وشەی ئەڵەمانی (*Schutz Staffel* -) واتە (ستافی ئاسایش) ناوی ئەو ڕێکخراوە سەربازیەی پارتی (ناتسیۆنال – سۆسیالیست)ی ئەڵمانیە، کە کاروباری دامەزراوەکانی (پۆلیس)ی پێ سپێردرا بوو. بە توندوتیژی و دڕندەیی ناسراوە. بە تایبەتی لە ڕووداوەکانی جەنگی جیهانی دووەمدا.

*Norimberg–50* – نۆریمبێرگ: شارێکە لە ئەڵمانیا، کە پاش کەوتنی دەسەڵاتی نازیەکان، گەورەترین دادگای تیادا تەشکیل کرا بۆ دادگایکردنی نازیەکان و تاوانبارانی جەنگ.

*51– Alcatraz* – ئالکاتراز: دوورگەیەکی زۆر چکۆڵەی نزیك سانفرانسیسکۆ–یە لە ئەمەریکا، کرابوە زیندانێکی گەورە و تایبەتی بۆ تاوانبارە هەرە گەورە و پڕ مەترسیەکانی (مافیا) و جەنگە گەورەکان، لە دوای جەنگی جیهانی دووەمەوە هەتا ساڵی *1975* – ئیتر لە دواتردا وەك شێوە مۆزەخانەیەك سازکرا بۆ دیدەنی گەشتیاران.

*52–Negazionism* – نێگاتسیۆنیزم: فۆرمێکی تایبەتە لە ڕیفیزیۆنیزمی مێژوویدا، خەسڵەتی سەرەکی (نەخێرکردن)ی ڕاستی و حەقیقەتی ڕووداوەکانە، بە تایبەتی ئەو ڕووداوانەی لە سەردەمی نازیەکان و فاشیەکاندا لە جەنگی جیهانی دووەمدا ڕوویانداوە.

*53–Epifania* – ئێپیفانیە: دەرکەوتن یان بەرجەستەبوونی (یەزدان) لە فۆرمێکی بینراودا – لە تراديتسیۆنی مەسیحیەتدا، ڕۆژی (*6*ی کانوونی دووەم) ئەو ڕۆژەیە کە (عیسا) لە شاری (بێتلێمەێ – *Betlemme* – بیت لحم) دەرکەوتن و بەرجەستەبوونی (یەزدان) لە خودی خۆیدا پیشانی سێ ساحیر دەدات.

# زانستی هیومانیستی مرۆڤ

ئەریك فرۆم

لە ئینگلیزییەوە: عەبدوڵڵا سیوەیلی

### 1) چەند لەبەرچاوگرتنێکی پێشینە

ئـەم سـەردەمەی ئێسـتامان بـەو جیاوازییـە سـیواخ دراوە کـە لـە نێـوان مەعریفـەی زانسـتی و تەکنیکیماندا هەیە لەلایەك و ئەو مەعریفە کەمەی کە تا ئێستا لە بارەی مرۆڤەوە هەمانە لە لایەکی ترەوە.

ئەمە تەنها بریتی نییە لە جیاوازییەکی تیۆری، بەڵکو جیاوازییەکی پراکتیکی زۆر گرنگیشە: ئەگەر مرۆڤ نەتوانێت دەربارەی خۆی زیاتر بزانێت و ئەو مەعریفەیـەش بـۆ باشـتر ڕێکخسـتنی ژیـانی خـۆی بەکارنـەهێنێت، ئـەوا مـرۆڤ لەلایـەن بەرهـەمی مەعریفەی زانستی خۆیەوە لەناودەچێت، بەڵام ئایا ئەمە پێویسـتی بـەوە نییـە کـە مـرۆڤ مەعریفەیـەکی باشتر بەدەست بهێنێت دەربارەی خۆی نەك ئەوەی کـە لەلایـەن هـەزارەها پشـکنەرەوە لـە بوارەکـانی سـایکۆلۆژیای کۆمەڵایـەتی، فسـیۆلۆژی، دەرونشـیکاری و، پەیوەندییـە مرۆڤیـەکان.. هتـد، بەدەسـت هـاتووە؟ وەڵامـی ئـەم پرسـیارە لـە ڕووی دامـەزراندنی "پەیمانگایـەکی نـوێ بـۆ زانسـتی مـرۆڤ" خـۆی بەرجەسـتە دەکـات. ئەگـەر کەسـێك وا هەسـت دەکـات کـە ئامانجـەکانی زانسـتی مـرۆڤ لەلایـەن زانسـتە کۆمەڵایەتیەکانـەوە بـە تـەواوەتی بەرجەستەکراوە، ئەوا ئەو کەسە لە ڕاستیدا دەبێت ئەو چوارچێوەیە بەهێز بکات کە هەیە نەك هەستێ بە دامەزراندنی پەیمانگای نوێ.

ئەوانـەی کـە بەشـداری لـە گفتوگـۆ دەربـارەی پەیمانگای نوێ دەکەن بە ئاشکرا وا ڕادەگەیەنن کە ئەو زانستە کۆمەڵایەتیانـەی کـە هـەن هەڵناسـتن بـە دابینکردنی ئەوەی کە پێویستە.

ئەمانـەش هـەندێکن لـە هۆکارەکـانی ئـەو قەناعەتە:

1-زانسـتە کۆمەڵایەتیـەکانی ئـەمڕۆ (بـە ژمارەیـەك ئیستیسـنای بـەرچاوەوە) کـە لەلایـەن سەرکەوتن و پێگەی زانستە سروشتییەکانەوە کاری تێکـراوە، هـەوڵ دەدات کـە میتـۆدی زانسـتە سروشـتیەکان پـەیڕەو بکـات بەسـەر بـەرەوپێش

چوونەکانی مرۆڤدا. نەك تەنها ئەو زانستانە پرسیار ناکەن لەوەی کە ئایا ئەو میتۆدەی کە بۆ دیراسەکردنی شتەکان شیاوە بۆ دیراسەکردنی مرۆڤیش هەر شیاوە، بەڵکو تەنانەت لە کردنی پرسیاری ئەوەی کە ئایا ئەم چەمکەی میتۆدی زانستی ئایا بێپێز و بەسەرچوو نییە، شکستیان خوارد.

ئەوان لەو باوەڕەدان کە تەنها بە میتۆدێك دەگوترێت زانستی کە بتوانێت بژمێرێت و هەڵسەنگاندن بکات، ئەمە لە کاتێکدا کە بێئاگان لەوەی کە زۆربەی زانستە پێشکەوتووە سروشتییەکانی ئەمڕۆ وەك فیزیکی تیۆری کار بە چەند گریمانەیەکی پتەو دەکات کە لەسەر هەلهێنجانی خەیاڵی وەستاوە. تەنانەت بە بیرو بۆچوونی ئەنشتاین (حەدەس – *Intution*) ناکرێ وەلابنرێت. ئاکامی ئەم لاساییکردنەوەیەی میتۆدی زانستی خراپ وەرگیراو بریتییە لەوەی کە میتۆدی (راستی و شێوەکان – *facts and figures*) ئەو گرفتانە دیاری دەکات کە کەسێك دیراسەیان دەکات. لێکۆڵەرەوان کۆمەڵە گرفتێکی ناگرنگ هەڵدەبژێرن لەبەرئەوەی دەتوانرێت وەڵامەکانیان بخرێتە سەر شێوەی (شێوە و فۆرمەلەی ماتماتیکی، ئەمە لەجیاتی هەڵبژاردنی گرفتگەلێکی گرنگ و گەشەپێدانی کۆمەڵە میتۆدێکی نوێ کە گونجاو بێت بۆ لێکۆڵینەوە لەم کێشانە.

ئاکامی ئەمەش ئەوەیە کە هەزارەها پرۆژەی لێکۆڵینەوە هەیە کە زۆربەیان هەر ناچن بەلای پرسیارە بنەڕەتیەکانی مرۆڤدا. ئەو بیرکردنەوەیەی کە بەسەر ئەم پرۆژەیەدا تەتبیق دەبێت بیرکردنەوەیەکی وورد و قووڵ نییە بەڵکو بیرکردنەوەیەکی بێ پێزەو خاوەن سروشتێکی (پراکتیکی – تەکنیکی)یەو هیچ سەیر نییە کە زانستە سروشتییە گەشەکردووەکان لە زانستی کۆمەڵایەتیەکان زیاتر دەتوانن باشترین عەقڵەکانی میللەت ڕابکێشن بەلای خۆیاندا.

*2*–ئەوەی کە بەشێوەیەکی زۆر نزیك پەیوەستە بە گرفتی میتۆدی زانستی خراپ تێگەیەنراوەوە بریتییە لە (ڕێژەگەرایی – *Relativism*) کە زانستە کۆمەڵایەتیەکان لێوان لێو بوون لەم ڕێژەگەراییە. لە کاتێکدا ئێمە خزمەتێکی زۆر لە ترادیسیۆنی مرۆڤیی گەورەدا دەبینینەوە، کەچی زۆربەی زانا کۆمەڵایەتیەکان ڕێچکەیەکیان گرتۆتەبەر کە تەواو ڕێژەگەرایە، ڕێچکەیەك کە تیایدا بەهاکان وەك مەسەلەیەکی پەیوەست بە چێژەوە نەك پەیوەست بە شیاویی بابەتیەوە سەیر دەکرێت. لەبەرئەوەی پشکنین و تاقیکردنەوەی رەوایەتی (مشروعیەت)ی بابەتیی بەهاکان کارێکی قورسە، زانستی کۆمەڵایەتی ئاسانترین ڕێچکەی هەڵبژاردووە، ڕێچکەی فرێدانە دەرەوەی هەموویان پێکەوە. لەم کردەی فرێدانەدا، زانستی کۆمەڵایەتی هەستاوە بە فەرامۆش کردنی ئەو ڕاستییەی کە هەموو جیهانی ئێمە بە هۆی لەدەستدانی ڕوو لە زیادبوونی واتای بەهاکانەوە کەوتۆتە مەترسییەوە. ونکردن و لەدەستدانی واتای بەهاکان بۆتە هۆی زیادکردنی نەتوانایی لە بەکارهێنانی بونیادنەرانەی بەرهەمەکانی بیرکردنەوەمان و هەوڵەکان لە زانستە سروشتییەکاندا.

*3*–لایەنێکی تری ئەم ڕێژەگەراییە بریتییە لە لەدەستدانی چەمکی مرۆڤ وەك قەوارەیەکی تەواو کە جەخت لەسەر دەرکەوتە جیاوازەکانی مرۆڤ دەکاتەوە وەك چۆن لە کلتورە جیاجیاکاندا بەدەردەکەوێت. ئەم لایەنەی ڕێژەگەرایی بە جۆرێك لە مرۆڤ دەکۆڵێتەوە وەك ئەوەی مرۆڤ پەڕەیەکی بەتاڵی سپی بێت و هەر کلتورێك نووسینی خۆی

لەسەر بنووسێت، نەك وەك بوویەك كە تەنها بریتی نییە لە قەوارەیەكی بایۆلۆژی بەڵكو لە ڕووی سایكۆلۆژیشەوە قەوارەیەكی لە ناساندن هاتووە. ئەگەر ئێمە ئەم چەمكەی مرۆڤ وەك راستی دەرخەرێك بەدەست نەهێنینەوە، ئەوا چۆن دەتوانین پێشبینی بەكارهێنانی بەرهەمداری یەكێتی جوگرافی و كۆمەڵایەتی گەشەكردووی مرۆڤ بكەین كە ئەمەش خۆی لە خۆیدا بریتییە لە مەیلی مێژوویی بۆ داهاتوو؟

## 2) ئامانجە گشتییەكان:

لەبەر ڕۆشنایی ئەم لەبەرچاوگرتنە پێشینانە، ئێمە دەگەینە فۆرمەلەكردنی ئامانجی گشتی پەیمانگا كە دەبێت زانستی مرۆڤ لە روحیەتی هیومانیزمدا بەدەست بهێنێت. گەر وردتربین، ئەمە ئەم واتایانەی خوارەوەشی هەیە، یەكەم، دیراسەكردنی مرۆڤ دەبێت لە چەند ڕوانگەیەكی مرۆڤییەوە سەرچاوەی گرتبێت، بەشێوەیەكی سەرەتایش ئەوانەیان كە مایەی لەبەرچاوگرتنی هەموو ترادیسیۆنی فەلسەفی و ئایینی مرۆڤ بوون: ئایدیای كەرامەت و تواناكانی مرۆڤ بۆ خۆشەویستی عەقڵ بەكارهێنان كە دەتوانرێت لە بارودۆخە ویستراوەكاندا بكرێنە ڕاستی. دووەم، لێكۆڵینەوە لە مرۆڤ دەبێت لەو ڕوانگانەوە سەرچاوەی گرتبێت كە لە بارودۆخی مێژوویی خۆمانەوە دێتە بەرهەم: دارمانی سیستمی بەهای تەقلیدی خۆمان، گەشەكردنی بێ بناغە و كۆنترۆڵ نەكراوی چالاكییە تەكنیكی و فیكرییە پوختەكان و، پێویستی دۆزینەوەی دامەزراوەیەكی تازەو عەقڵانی بۆ دامەزراندنی بەهاكانی ترادیسیۆنی مرۆڤی. ئەم ڕوانگانە وا گریمانە دەكەن كە سەرباری هەموو جیاوازییەكان مرۆڤ هەر یەك جۆر (نوع – *species*)ە، ئەمەش نەك تەنها لە ڕووی بایۆلۆژی و فسیۆلۆژییەوە بەڵكو لە ڕووی عەقڵی و سایكۆلۆژیشەوە.

ئەم ئامانجە سەرەكیانە كاتێك دەتوانرێت بهێنرێتە دی كە ئەو میتۆدانەی گونجاون بۆ لێكۆڵینەوە لە مرۆڤ پەیرەوكراون و گەشەیان كردبێت. گرفتەكە بریتی نییە لە گرفتی هەڵبژاردن لە نێوان لێكۆڵینەوەیەكی زانستی و نازانستی مرۆڤدا، بەڵكو بریتییە لە گرفتی دیاریكردنی ئەوەی كە میتۆدی گونجاو و عەقڵانی پێك دەهێنێت بۆ تێگەیشتن لە مرۆڤ.

زانستی هیومانیستی مرۆڤ دەبێت بەردەوامی بدات بە كۆششی خوێندكارە مەزنەكانی مرۆڤ لە رابردوودا، وەك ئەرەستۆ و سپینۆزا. ئەمە بەو داتا نوێیانەی كە فیسیۆلۆژیا، بایۆلۆژیا، و سۆسیۆلۆژیا پێمان دەبەخشن پێكەوە لەگەڵ ئەزموونەكانی خۆمان وەك كۆمەڵە ئەزموونێكی هاوچەرخ لەم سەردەمەی گۆڕاندا كە بایەخ بە داهاتووی مرۆڤ دەدات، دەوڵەمەند بكرێت.

لەم مەسەلەیەی دووەمیاندا تێبینییەكی تر سەرهەڵدەدات كە زۆر پێویستە. زۆرجار زانا كۆمەڵایەتییەكان ووتویانە كە بارودۆخی لێكۆڵینەوەیەكی زانستی بریتییە لە غیابی هەر ئامانجێكی خود – بەرژەوەندگەرا و پێشتر وێناكراو. ئەو ڕاستییەی كە ئەمە گریمانەیەكی بێ پێزە، بەشێوەیەكی ئاشكرا لەلایەن پەرەسەندنی زانستە سروشتییەكانەوە پیشان دەدرێت: ئەم زانستە سروشتییانە تا ڕادەیەكی زۆر لە لایەن ئامانجە پراكتیكییەكان و پێداویستییەكانەوە ڕێخۆشكەری بۆ كرا. ئەوە كاری زانایە كە واتاكانی خۆی بەشێوەیەكی بابەتیانە بپارێزێت و بێ هیچ ئامانجێك كاری لێكۆڵینەوە ئەنجام نەدات – ئامانجیش ئەوانەن

کە مانا و پاڵنەر دەبەخشن بە کارەکەی. هەروەك چۆن هەموو سەردەمێك خاوەنی گرفتی ئابووری و تەکنیکی دیاریکراوی خۆیەتی، بەهەمان شێوە هەموو سەردەمێك خاوەنی گرفتی مرۆڤی دیاریکراوی خۆشیەتی و، لێکۆڵینەوە و دیراسەکردنی مرۆڤیش ئەمڕۆ دەبێت لە لایەن ئەو گرفتانەی کە لەم سەردەمەی مێژووی جیهاندا دێتە کایەوە ڕێبەری بکرێت و پاڵی پێوە بنرێت.

### 3) ئامانجە دیاریکراوەکان

*1*-لێکۆڵینەوەی ئەو میتۆدانەی کە گونجاون بۆ زانستی مرۆڤ:

ئەبێت ئەوە ڕوون بکرێتەوە کە چی جیاوازییەك لە ڕێچکەدا لە نێوان لێکۆڵینەوە لە شتەکان و لێکۆڵینەوە لە بووە زیندووەکان بە تایبەت لە مرۆڤدا هەیە. بۆ نموونە، جیاوازییەك هەیە لە نێوان ڕێچکەی "بابەتگەرایی" کە تیایدا "بابەت" هیچ نییە جگە لە شتێك و ڕێچکەیەك کە تیایدا سەرنجدەر یان چاودێر لە هەمان کاتدا بەشێوەیەکی ناسۆزداری پەیوەستە بەو کەسانەوە کە سەرنجیان دەدات.

*2*-لێکۆڵینەوە و دیراسەکردنی چەمکی مرۆڤ و سروشتی مرۆڤ:

لە کاتێکدا کە فەلسەفەی هیومانیستی یەکێتی هەموو مرۆڤایەتیی بە هەند وەردەگرێت، پێویستییەکی گەورە هەیە بۆ سەلماندنی عەقڵانیانەو دیار بۆئەوەی کە لە ڕاستیدا شتێکی وەك مرۆڤ و سروشتی مرۆڤ لەودیو شانشینی پوخت و پەتی توێکاری (ئەناتۆمی) و فیسیۆلۆژییەوە هەیە. چەمکی سروشتی مرۆڤ دەبێت بەهۆی تێکەڵکردنی ئەوەی کە ئێمە لە ڕابردوودا لەسەر مرۆڤ زانیومانەو ئەوەی ئەمڕۆ ئێمە دەربارەی مرۆڤ لە کەلتوورە تەواو گەشەکردوو و سەرەتاییەکاندا دەیزانین بچەسپێنرێت. ئەم ئەرکەش بریتییە لە تێپەڕاندنی ئەنترۆپۆلۆژیایەکی وەسفی و لێکۆڵینەوە لە هێزە مرۆڤیە بنەڕەتیەکانی پشت جۆراوجۆرییە هەمەچەشنییەکان کە تیایدا ئەم دەربڕدراوە. لێکۆڵینەوەی تەواوەتی و داینامیکی هەموو دەرکەوتەکانی سروشتی مرۆڤ دەبێتە هۆی بەرهەمهێنانی وێنەیەکی کاتی بۆ سروشتی مرۆڤ و جۆری ئەو یاسایانەش کە دەیبەن بەڕێوە. زانستی هیومانیستی دەربارەی مرۆڤ دەبێت بە چەمکی (سروشتی مرۆڤ) دەست پێبکات و، لە کاتێکدا و لە هەمان کاتدا خوازیاری زانینی ئەم سروشتەی مرۆڤیشە. پێویست ناکات بووترێت کە دەبێت ژمارەیەك لێکۆڵینەوە لەسەر کۆمەڵگا جیاوازەکان بکرێت (پیشەسازی، پێش پیشەسازی، سەرەتایی) کە تیایدا گریمانەکان دەربارەی سروشتی مرۆڤ دەبێت تاقی بکرێنەوە.

*3*-لێکۆڵینەوە لە بەهاکان:

دەبێت ئەوە پیشان بدرێت کە بەها دیاریکراوەکان هەروا بە ئاسانی بریتی نین لە مەسەلەی پەیوەست بە چێژەوە، بەڵکو لە بوونی مرۆڤدا ڕیشەی داکوتاوە. دەبێت ئەوە پیشان بدرێت کە ئەم بەها بنەڕەتیانە چین و چۆن لە سروشتی مرۆڤدا ڕەگیان داکوتاوە. دەبێت بەهاکان لە هەموو کلتورەکاندا دیراسە بکرێن لە پێناو دۆزینەوەی هەر یەکێتییەکی شاراوەدا. هەروەها دەبێت هەوڵ بدرێت بۆ لێکۆڵینەوە لە گەشەسەندنی ئاکاریی مرۆڤایەتی. لەمەش زیاتر، کارێکی پێویستە کە کاریگەری پێشێلکردنی پێودانگە بنەڕەتیە ئاکارییەکان لەسەر تاك و لەسەر کلتوریش بپشکندرێت. بەپێی بۆچوونی ڕێژەگەراکان جا کوشتوبڕ بێت یان خۆشەویستی کە لەلایەن کلتورەوە دادەنرێت یەکسەر ڕەوایەتی پەیدا دەکات. بەڵام هیومانیزم

پێی وایە کە پێودانگە دیاریکراوەکان لە هەڵوێستی وجودیانەی مرۆڤدا وەك (بۆماوەیی)یەك بوونی هەیە و پێشێلکردنی دەبێتە هۆی چەند ئاکامێك کە زیانبەخشن بە ژیان.

*4*–لێکۆڵینەوە لە وێرانکاریگەرایی:

ئەوەی کە پەیوەندی بەوەی سەرەوە هەیە بریتییە لە وێرانکاریگەرایی بە هەموو فۆرمەکانیەوە: وێرانکردنی ئەوانی دی، ماسۆشیزم. ئێمە نزیکەی هیچ شتێك دەربارەی هۆکارەکانی وێرانکاریگەرایی نازانین و ئەوەی کە بوونیشی هەیە بریتییە لە بوارێکی بەرفراوانی داتای ئەزموونی کە ڕێگەمان پێدەدات لانی کەم چەند گریمانەیەك دەربارەی تاك و هۆکارە کۆمەڵایەتیەکانی وێرانکاریگەرایی دابنێین.

*5*–لێکۆڵینەوە لە ئەفراندنگەرایی:

بوارێکی فراوانی سەرنجدانی یەکسان هەیە بۆ لێکۆڵینەوە لە پاڵنەرە ئەفرێنەرەکان لە منداڵ، هەرزەکار و، گەورەکاندا بۆ ئەو فاکتەرانەی کە ڕێخۆشکەر و ڕێگری ئەم پاڵنەرانەن. لێکۆڵینەوە لە ئەفراندنگەرایی بەهەمان شێوەی لێکۆڵینەوە لە وێرانکاریگەرایی دەبێت دیمەنی ئەمریکی فرازمەند بکەن و ئەگەر کراش دەبێت کۆمەڵە ماددەیەك لە کلتورە جیاوازەکانەوە بەدەست بهێنرێت.

*6*–لێکۆڵینەوە لە دەسەڵات:

سەردەمی مۆدێرن کە سەردەمی سەربەستی و تاکگەراییە لە دژی دەسەڵات جەنگاوەو غیابی تەواوەتی دەسەڵاتی وەك ئایدیالی خۆی چەسپاندووە. ئەم غیابە ئاشکرایەی دەسەڵات هەرچۆنێك بێت یارمەتیدەر بووە لە زیادکردنی هێزی دەسەڵاتی نادیار، کە لە بەرامبەردا بۆتە هۆی خستنەوەی ڕێژەیەکی ترسناکی ملکەچی. لێکۆڵینەوە لە گرفتی دەسەڵات کارێکی پێویستەو جیاوازی کردنی ئەزموونیانە لە نێوان فۆرمە عەقڵانی و ناعەقڵانیەکانی دەسەڵاتیش بایەخی زۆری هەیە. هەروەها لێکۆڵینەوە لە دیاردەی ملکەچگەرایی بە هەموو دەرکەوتەکانیەوە دووبارە کارێکی زۆر پێویستە.

*7*–لێکۆڵینەوە لە ئایدیا پێشینە سایکۆلۆژیەکانی ڕێکخراوی دیموکراتی:

ئایدیای هاوڵاتی بەرپرس و باش ئاگادارکراو کە بەشداری لە بڕیارە گرنگەکانی جڤات دا دەکات بریتییە لە چەمکی ناوەندی دیموکراسیەت. بەڵام بەپێی زیادبوونی بڕ ئاسای دانیشتوان و بەپێی کاریگەری میتۆدەکانی پێشنیاری، دیموکراسیەتیش بەرەو لاوازی دەچێت. لێکۆڵینەوە کردن گرنگە بۆ دەرخستنی ئەوەی کە چی بە مێشکی دەنگدەردا دێت (ئەمەش لە دەرەوەی دەنگدان و بیرو ڕاخستنە ناو سندوقی دەنگدانەوە)، ئایا ئەو دەنگدەرە تا چەند پێشنیارکەرە، ئەو ڕاستییە چییە کە ئەو دەتوانێت بە کەمی کار بکاتە سەر ئەو کردە سیاسییەی کە کاردەکاتە سەر وریایی و بەئاگایی بیرکردنەوەی سیاسی ئەو. تاقیکردنەوەکانی گفتوگۆی گروپ و بڕیار دەرکردن دەبێت زیاد بکرێن و ئاکامەکانیشی دەبێت دیراسە بکرێت.

*8*–لێکۆڵینەوە لە پرۆسەی پەروەردە و فێرکردن:

ڕاستییەکە ئەوەیە کە ئێمە لە هەر کەسێکی تر لە هەر شوێنێکی ئەم دنیایەدا زیاتر خاوەنی خوێندنی باڵاین، بەڵام سیستەمی خوێندنی باڵای ئێمە کارێکی تاڕادەیەك کەم دەکات بۆ هاندان و وروژاندنی فکری ڕەخنەیی و بۆ کارکردنە سەر شێوە گرتنی کاراکتەریش. وەك چەند دیراسەیەك پیشانیان داوە، خوێندکاران زۆر بە کەمی لەلایەن کەسێتی مامۆستاکانیانەوە کاریان تێکراوە و لە باشترین حاڵەتیشدا لە مەعریفەی فیکریی پەتی

هیچی زیاتریان چنگ نەکەوتووە. دیراسە نوێیەکان پێویستیان بە لێکۆڵینەوە لە بارودۆخەکانی فێرکردن و پەیوەندی خوێندکار - مامۆستا هەیە. پەروەردە و فێرکردن چۆن دەتوانێت پرۆسە فیکرییە زارەکیە پوختەکان تێبپەڕێنێت و بچێتە ناو شانشینی ئەزموونی واتادارەوە؟

*9*-دیراسەکردنی مێژوو وەك مێژووی پەرەسەندنی مرۆڤ:

مێژووی تەقلیدی بەشێوەیەکی ناوچەگەرایی دیراسەکراوە. ڕەگ و ڕیشەکانی کەلتووری ئێمە لە فەلەستین، یۆنان، ڕۆما و لە مێژووی ئەوروپی و ئەمریکیشدا لە ناوەندی سەرنجداندا بوون. ئێمە پێویستمان بە مێژوویەکی راستەقینەی جیهان هەیە کە تیایدا پەرەسەندنی مرۆڤ بەشێوە راست و دروستەکەی پیشان درابێت. دەبێت ئەوە پیشان بدرێت کە چۆن هەمان ئایدیا بنەڕەتیەکان لە لقە جیاوازەکانی خێزانی مرۆڤدا سەریان هەڵداوە،چۆن هەندێکیان تێکەڵ بوون و هەندێکی تریش بە جودا ماونەتەوە، ئەمە هەرچەندە کە جیاوازییەکان بەشێوەیەکی بەرفراوان و بە بەراوردکردن لەگەڵ لێکچواندنەکاندا موبالەغەی تیاکراوە.

دەتوانرێت لە مێژووی راستەقینەی مرۆڤدا، پەرەسەندنی مرۆڤ، کاراکتەر و ئایدیاکانی مرۆڤ و گەشەکردنەکەی بۆ یەکێتییەکی هەمیشە تێکەڵبوو پیشان بدرێت. لێرەوە دەبێت جەخت لەسەر پشك و هەماهەنگی کلتور و سەردەمە جیاوازەکان بکرێتەوە. مێژووی لەم جۆرە دەبێت وا لە مرۆڤ بکات کە وێنەیەکی بابەتی هەبێت دەربارەی هەموو ڕەگەزی مرۆڤ و گەشەکردن، تێکەڵبوون و یەکێتییەکەی. لەم چەند ساڵەی پێشوودا ژمارەیەك مێژووی گەردوونی کە کەم تا زۆر وەلامدەرەوەی ئەم جۆرە بوو نووسرا، بەلام نەیانتوانی پڕکەرەوەی پێداویستییە راستەقینەکە بن، کە بریتییە لە دانانی کتێبێکی زانایانەی چەند بەرگی کە لەلایەن ژمارەیەك لە پسپۆڕی مەزنەوە نووسرابێت و بەهۆی روحیەتێکی هیومانیستییەوە یەکی پێگیرابێت.

## *4*)چەند تێبینییەکی گشتی:

*1*-بۆئەوەی پەیمانگا بەهایەکی هەبێت، دەبێت خاوەنی وێنەیەکی جیاکەرەوە بێت. ناتوانرێت ئەم وێنەیە بە تەواوەتی لە ڕێگەی ووشەوە دەرببڕدرێت (زیاتر لەبەر ئەوە نا کە وشەمان نییە، بەڵکو بەهۆی ئەوەوە کە وشەکان لە قسەی پڕوپووچدا خراپ بەکارهێنراون)، بەڵکو زیاتر دەبێت لەلایەن ئەو کەسانەوە دەربڕدرێت کە ئەم وێنەیە لە کارەکانیاندا بەکاردەهێنن و لە کەسێتیاندا ڕەنگ دەداتەوە.

*2*-دەبێت پەیمانگا دوای پراکتیکەکانی دامەزراوەی زەبەلاح نەکەوێت کە هەوڵەکانی بریتییە لە هاندانی خەڵك کە بیر لە گرفتە زانستییەکان بکەنەوە لە رووی ئەوەی کە دەتوانن "بیفرۆشن" بە دامەزراوەیەك، کە یەکەم جار بیر لە کۆمەکی دارایی بکەنەوەو تەنها دواتر بیر لەوە بکەنەوە کە دەبێت بیدۆزنەوە، پەیمانگا دەبێت وا لە پارە بکات کە تەنها کاتێك لەبەردەستدا بێت و بەکاربهێنرێت ئەوەندەی کە پرۆژەیەك لە راستیدا پێویستی پێیەتی. وەك مەسەلەیەکی پەیوەست بە بنەماوە دەبێت بودجەکان لە ناو کەمترین ئاستی مەعقولدا بپارێزرێن و سەرتاپاش وەزیفی بێت. بەم جۆرە پەیمانگا هەوڵ دەدات بۆ هاندانی گەڕانەوە بۆ شێوازێکی کۆنی کارکردن کە تیایدا بیرکردنەوە و دیراسەکردن لە ناوەندی لێکۆڵینەوەدایە نەك بەدەستهێنانی دارایی و بەڕێوەبردنەکانیان.

3–پـەیمانگا دەبێـت پشـتگیری لـە دوو جـۆر چالاکی بکات (هەروەها دامـەزراندنی کتێبخانەیـەك کە تەرخان کرابێت بۆ زانستی مرۆڤ):

أ–کار و نووسینی زانا و تێکۆشەرە گەورەکان:

لێرەدا ئامانجەکە نابێت بریتی بێت لە گرفتێکی دیـاریکراو، بـەڵکو دەبێـت زیـاتر بریـتی بێـت لـە پشتگیری کردنی کەسێتییەکی بەرهەمهێن کە دەبێت بەردەوامی بدات بە لێکۆڵینەوەکەی لەسەر زانستی مرۆڤ دوور لە هەر ناچارکردنێکی ڕێگرانەی تر.

ب–گرفتەکانی تایبەت بـە لێکۆڵینـەوە دەبێـت لەلایـەن کەسـانی بەهرەمـەندەوە چارەسـەر بکرێـن. دۆزینەوەو ئەفراندنەکانی کەسانی لەم جۆرە دەبێت ببێـت بـە یـەکێك لـە ئەرکـەکانی دامـەزراوە. لـێرەدا کۆمەکی دارایی دەبێت بدرێت بە پرۆژە تایبەتـەکان. دەسـتەی بەڕێوەبـەری پـەیمانگا دەبێـت گەشـە بـە سیاسـەتی لێکۆڵینـەوەی خـۆی بـدات، ئەمـەش هـەر هـەڵبژاردنی خـەڵکی بەهرەمـەند ناگرێتـەوە بـەڵکو هەڵبژاردنی گرفتیـش لەسـەر بناغـەی دیراسـەیەکی تێکـەڵ لـە هـەموو بوارەکـان. دەسـتەی بەڕێوەبـەری پـەیمانگا تاڕادەیـەك دەکـرێ ببێتـە دەسـتەیەکی زانستی پلاندانەر بۆ زانستی مرۆڤ.

4–پـەیمانگا دەبێـت پشـتگیری لـە خـەڵك و لـە پرۆژەکـــانی دەرەوە و نــــاوەوەی ویلایەتــــە یـەکگرتووەکانی ئـەمریکا بکـات. کۆمـەکی دارایـی دەبێت لە هـەموو بـارودۆخێکدا بدرێـت بـە زانکـۆ و شوێنی تـری وەك زانکۆ. دەبێت تەنها ئەو کـەس و پرۆژانەی کە لەلایـەن پـەیمانگاوە پێشنیار و قبـووڵ دەکرێن کۆمەکیان پێ بدرێت.

5–پـــەیمانگا دەبێــت خـــاوەنی دەســـتەیەکی بەڕێوەبەری چالاکی 5–7 ئەندامی بێت کە لانی کەم بـۆ مـاوەی یـەك هەفتـەی تـەواو سـاڵی دووجـار کۆببێتـەوە بـە مەبەسـتی گفتوگۆکردنـی نـەك تەنـها کۆمەکـەکان بـەڵکو پلانـە گشـتییەکانی کـارکردن و، تەرخان کردنی چەند کاتێك لـە ماوەی ساڵەکەدا بۆ ئامادەکاری کردن بۆ ئەم کارە لە بوارەکانی خۆیاندا.

دەستەی لـەم جۆرە دەکرێ لـە نوێنـەرانی لقـە جیاجیاکانی بوارەکانی زانستی مـرۆڤ پێـك بێـت، بەڵام ئەندامـەکانی دەبێـت بەشـێوەیەکی سـەرەتایی لەسەر بناغەی بنـەما گشـتییەکان، بەرهـەمداریێتی و خـــــەیاڵی تـــــاك ئاســـــایی هـــــەڵبژێردرێن. ڕوحیـەتی بیرۆکراتی دەبێت تا کەمترین ئاست کـەم بکرێتەوە.

## سەرچاوە

*www. Erichfromm. De*

## گفتوگۆیەك لەگەڵ نووسەر

## ( هاروكی موراكامی - *Haruki Murakami* )

# ژاپۆنییەكان بە نامۆم دەزانن

لە فارسییەوە: شەیدا سەلاح

پاڵەوانەكانی نێو ڕۆمانە سەرسووڕهێنەر و ڕەوشت سەیر و تاڕادەیەك سەیر و سەمەرەكانی نووسەری ژاپۆنی (هاروكی موراكامی) (*The End of the world , A wild sheep Hard chase Boiled wonderland*) بە هیچ شێوەیەك لەگەڵ قاڵبگیری ژاپۆنییە نەریت خواز و پاریزكارەكاندا ڕێك ناكەون. پاڵەوانەكانی ڕۆمانەكانی ئەم نووسەرە مرۆگەلێكی دەرونگەرا و خەیاڵی و زیرەكن و عاشقی كەلتووری (والا و پاپ)ن و حەزدەكەن پەیوەندییان لەگەڵ ژنانی پڕ نهێنی و پیلان و دەسەداوی سەیر و سەمەرەدا هەبێت. (تور و ئاكادا) كە گێڕەرەوەی نوێترین كاری موراكامی‌یەو، (*The wind - up Brid chronicle*) بەشێكی زۆری ڕۆمانەكە لە جۆرێك بێكاری لەگەڵ خۆشگوزەرانیدا دەگوزەرێنێت؛ چێشت لێدەنێت، دەخوێنێتەوە، مەلە دەكات و چاوەڕوانی ئەوەیە لە پڕا كۆمەڵێك كەسایەتی سەیرو سەمەرە دەركەون و چیرۆكە تراژیكەكانی خۆیانی بۆ بگێڕنەوە. لەوێوە كە موراكامی خولیاكانی خۆی لەگەڵ پاڵەوانی چیرۆكەكانی ناشارێتەوە، هیچ جێی سەرسوڕمان نییە كە ئەو بۆ ماوەیەك لە وڵاتەكەی خۆیدا و تەنانەت لە نێوان نووسەرەكانی تردا هەستی بە نامۆیی كردووە. خاڵێكی سەرنجڕاكێشتر لێرەدایە كە ئەم چیرۆكنووسە تازە لەگەڵ ژاپۆن و هاووڵاتییەكانیدا ئاشت بوەتەوە و ئەمەش بوو بە



هاروكی موراكامی

هۆی ئەوەی کە چاوی بە قوربانییەکانی هێرشی غازی -ژەهراوی- گروپی (ئایوم) بکەوێت کە لە مێترۆیەکی شاری توکیۆدا لە مارسی ساڵی *1995*ز دا ڕوویدا.

موراکامی دەڵێت، ئەم گەڕانەوەیە لە درێژەی ئەو چوار ساڵەدا کە لە برنیستن نیشتەجێ بووە و لە کاتی نووسینی (*The wind - up Brid chronicle*)دا دەستی پێکرد. نیشتەجێ بوونی موراکامی لە وڵاتی ئەمریکادا، جگە لەمەی کە بووەتە هۆی ئەوەی دەستەڵاتێکی شیاو بەسەر زمانی ئینگلیزیدا پەیدا بکات، کاریگەریەکی هەست و سۆزداریشی بەسەردا هەبوو کە ئەو تەنانەت دوو ساڵ پاش گەڕانەوەی بۆ ژاپۆن ناتوانێ دەربیبڕێت و بە کارێکی دژواری لە قەڵەم دەدا. من موراکامیم لە سەفەرێکی کورتی خۆی لە ڤست کئوستدا بینی کە بۆ ناساندن و بڵاوکردنەوەی کتێبەکەی *The wind - up Brid chronicle* هاتبوو. هاوڕێی لەگەڵ (دانی جورج) هەڵەچنی گۆڤاری (*Wanderist*) کە ساتێکی گرنگا دەستپێشخەری کرد و رۆڵی وەرگێڕی بینی و منیش گفتوگۆیەکم لەگەڵیدا ساز کرد. وەڵامە هێواش و وردەکانی موراکامی زیاتر نیشانەی راستگۆیەکی تەواو بەبێ ئاگا لە خۆ بوو تا هەر جۆرە نەتوانایییەك لە زماندا. (موراکامی زۆر کەم گفتوگۆ دەکات).

- ***بیرۆکەی نووسینی (The wind - up Brid chronicle) تان لە کوێوە هێنا؟***

-وەختێ دەستم بە نووسین کرد بیرۆکەی ناو خەیاڵم زۆر بچووك بوو، تەنها دیمەنێك بوو و لە راستیدا ئەسڵەن بیرۆکە نەبوو. پیاوێکی (*30*) ساڵ کە لەناو چێشتخانەی ماڵەوە خەریکە خۆراکی ماکارۆنی لێدەنێت و تەلەفۆنەکە زەنگ لێدەدات - هەر ئەمەنە. زۆر سادەیە، بەڵام هەستێك پێی ووتم خەریکە کارەساتێك لەوێ روودەدات.

- ***ئایا ئێوە خۆشتان سەرتان لە رووداوەکانی چیرۆك سووڕدەمێنێت، بۆ نموونە وەکو بڵێیت خەریکن چیرۆکی کەسێکی دی دەخوێننەوە، یان ئەمەی کە دەزانن چیرۆکەکە پاش قۆناغێکی دیاریکراو چۆن درێژە پەیدا دەکات؟***

-نا بەهیچ شێوەیەك وانییە، من لە نووسین خۆشی دەبینم. وەختێ دەگەمە بەشێکی تایبەت لە چیرۆکەکە، بە راستی نازانم بڕیارە چ شتێك روو بدات، ئەمە لای من وەکو حاڵەتی منداڵێکە کە خەریکی خوێندنەوەی چیرۆکێکە. زۆر وروژێنەرە وەختێ نەزانی رووداوی دوایی لە چیرۆکەکەدا چی دەبێت. من وەختێ خەریکم چیرۆك دەنووسم ئاوا حاڵەتێکم هەیە. سەرنجڕاکێشە.

- ***ئێوە لەم چیرۆکەدا خەریکی بابەتگەلێك دەبن کە بۆ ئێوە نوێیە. کەسێتییەك لە چیرۆکدا هەیە کە هەندێ ئەزموونی راستی ترسناك لە شەڕی جیهانی دووەم وەسف دەکات. بۆچی بڕیارتان دا سەبارەت بەم بابەتە راوێژ بکەن؟***

-هەوڵم وا بوو کە دەربارەی شەڕ بنووسم بەڵام لەلای من کارێکی ئاسان نەبوو. هەر نووسەرێك بۆ خۆی تەکنیکێکی هەیە، واتە "توانا" یان "ناتوانایی" ئەو نووسەرە لە وەسف کردنی شتێك وەکو شەڕ یان مێژوو. من سەبارەت بەم جۆرە بابەتانە ناتوانم بە باشی بنووسم، بەڵام هەوڵی خۆم دەدەم لەبەرئەوەی وا هەست دەکەم کە نووسین سەبارەت بەو بابەتانە کارێکی پێویستە. من لە زەینی خۆمدا چەکمەجەگەلێکم هەیە، یەك دنیا چەکمەجە. لە نێو ئەم چەکمەجانە سەدان کەرەسەی خاوم هەیە. ئەو یادەوەری و دیمەنانەی پێویستمە لەم چەکمەجانە دەریدێنم. شەڕ لای من

چەکمەجەیەکی گەورەیە، چەکمەجەیەکی زۆر گەورە. هەمیشە وا هەستم دەکرد کە هەر ڕۆژێک دێت و لەم چەکمەجەیە سوود وەردەگرم و شتێکی تێدا دەردێنم و لەسەری دەنووسم. نازانم بۆچی. دەشێ لەبەرئەمەیە کە ئەمە چیرۆکی باوکمە. باوکم لە نەوەیەکە کە بەشداری شەڕی ساڵەکانی *1940*ز کردووە. وەختێ منداڵ بووم باوکم چیرۆکگەلێکی بۆ دەگێڕامەوە؛ هەڵبەت ژمارەی ئەو چیرۆکانە زۆر نەبوون، بەڵام لای من زۆر پڕ مانا بوون. دەموویست بزانم پاشان چ شتێك بەسەریاندا هات، مەبەستم نەوەی باوکمە. یادەوەرییەکەی جۆرێکە لە میرات، بەڵام ئەو شتانەی لەم کتێبەدا نووسیوومە دروستکراوی خەیاڵی خۆمە، گشتی خەیاڵییە، لە سەرەتاوە تاکو کۆتایی.

- *ئایا بۆ ئەم کتێبە لێکۆڵینەوەیەکی زۆرتان کرد؟*

–هەڵبەت لێکۆڵیمەوە بەڵام زۆر نا. لە وەختی نووسینی ئەم کتێبەدا من لە شاری برنیستن بووم و لەوێ کتێبخانەیەکی گەورەم هەیە. من لەو ڕۆژانەدا بۆ ئەنجامدانی هەموو کارێك، وەختی تەواوم بەدەستەوە بوو، ئیدی هەموو ڕۆژێك دەچووم بۆ کتێبخانە، کتێبگەلێکم دەخوێندەوە، ئەو کتێبانە زیاتریان مێژوویی بوون. لەو کتێبخانەیەدا کۆمەڵێك کتێبی چاك سەبارەت بە ڕووداوەکانی سنووری مەگولستان و مەنچووری هەیە. زۆربەی ئەو زانیارییانە لام نوێ بوون. من لە خوێندنەوەی ئەو هەموو بێ بەزەیی و بێ ئەقڵی و خوێن ڕشتنانە سەرم سووڕدەما. پاش تەواوکردنی نووسینی کتێبەکەم چووم بۆ مەغولستان، کە ئەمەش کارێکی سەیرە، لەبەرئەوەی زۆربەی نووسەران بەر لە نووسینی کتێب بۆ لێکۆڵینەوە بۆ شوێنێك دەچن، بەڵام من بە پێچەوانەوە کارم کرد. "خەیاڵ" گرنگترین داراییە، بۆیە بەر لە نووسینی کتێبەکەم بۆ ئەوێ نەچووم تاکوو خەیاڵی خۆم وونی نەکەم.

- *ئەم کتێبە لە چاو کتێبە پێشووەکانتا زیاتر ژاپۆنییە، لە گۆشە نیگای خوێنەرە ڕۆژئاواییەکاندا، کەسێتییەکانی هەندێ لە کتێبەکانی ترتان ڕۆژئاوایی دێنە بەرچاو.*

–وایە.

- *بەڵێ، دەشێ لەبەر ئەوە بێت کە کەسایەتییەکانی ناو کتێبەکانتان زۆر حەزیان لە کەلتووری ڕۆژئاوایە. وەختێ مرۆ کتێبەکانتان دەخوێنێتەوە وا هەست ناکات ڕووداوەکانی دوایی لە ژاپۆندا ڕوودەدات؛ بەڵام ئەمە هەستی خوێنەری ڕۆژئاواییە. بە دڵنیاییەوە ئەم کتێبە چەقی لەسەر ژاپۆن بەستووە. بۆچی بڕیاری ئەنجامدانی ئەم کارەتان دا؟*

–هۆکارەکەی ئەمەیە کە من لەو کاتەدا لە ئەمریکادا دەژیام! من لە ساڵی *1991*ز تا *1995*ز لەوێدا ژیاوم، واتە لەو وەختەدا کە خەریکی نووسینی ئەم کتێبە بووم. بۆیە تێڕوانینێکی تایبەتم بەرامبەر وڵاتەکەم و خەڵکی وڵاتەکەم هەبوو. من وەختێ کتێبەکانی دیم لە ژاپۆندا دەنووسی دەموویست هەڵبێم. وەختێ لە وڵاتەکەی خۆم چوومە دەرەوە لە خۆم پرسی، من چ شوناسێکم هەیە؟ من وەکو نووسەر چ شوناسێکم هەیە؟ من بە زمانی ژاپۆنی کتێب دەنووسم و ئەمە مانای وایە من نووسەرێکی ژاپۆنیم بەڵام شوناسم چییە؟ وەختێ لێرەدا بووم هەمیشە بیرم لەمە دەکردەوە. بەڕای خۆم ئەمە یەکێك لەو هۆکارانەیە کە من سەبارەت بە شەڕ کتێبم نووسی. ئێمەی ژاپۆنی گەل لە هەندێ لایەنەوە خۆمان ون کردبوو. ئێمە پاش شەڕ بە توندی خەریکی کارکردن بووین. خەریك بووین دەوڵەمەند دەبووین. گەیشتینە

قۆناغێکی تایبەت بەڵام پاش گەیشتن بەو قۆناغە لە خۆمان پرسی، خەریکین بۆ کوێ دەچین؟ خەریکی چ کارێکین؟ مانای ئەمە زیانە. هەڵبەت پێویستە ئەمەش بڵێم کە من بەدوای دۆزینەوەی هۆکارێکم بۆ نووسینەکەم. شیکردنەوەی کارێکی ئاسان نییە. بۆ من زۆر بە گرێ و گۆتە.

- *وەختێ لە ژاپۆن دوور بوون، ژاپۆنتان چۆن دەهاتە بەرچاو؟*

–(پاش وەستانێکی دوور و درێژ) ووتنی زۆر گرانە.

- *دەتانەوێت بە زمانی ژاپۆنی بیڵێن؟*

–(بە زمانی ژاپۆنی) تەنانەت بە زمانی ژاپۆنیش شیکردنەوەی زۆر دژوارە.

- *(دان جورج، کە بە گۆڤاری (Wanderiust) دەچێتەوە بە زمانی ژاپۆنی) ئایا دەتانەوێ بڵێن کە وەختێ لە دوورەوە و لە وڵاتێکی ترەوە سەیری وڵاتەکەی خۆتان دەکەن، مانی ژاپۆنی بوون – ئەمەی کە ژاپۆنی بوون چ مانەیەکی هەیە– بۆتان روونتر دەبێتەوە؛ ئەمەی کە وەختێ مرۆ لە ژاپۆندایە، لە ژاپۆندا دەژی، بیر لە ئاوا مەسەلەگەلێك ناکاتەوە – بەڵام دوایی وەختێ لەپڕ خۆی لە وڵاتێکی تردا دەدۆزێتەوە، بە ژاپۆنی بوون مانایەکی تری لا دروست دەکات؟*

–بەڵێ، ئەمە بەشێکە لە مەسەلەکە، بەڵام... لە راستیدا مەسەلەکە ئەوەندە گەورەیە کە دوان و دەربڕینی لام زۆر گرانە. دەکرێ بچینە سەر بابەتێکی دی؟

- *بە دڵنیاییەوە. پاڵەوانی چیرۆکەکانت لەگەڵ تایبەتمەندییەکانی ژاپۆنییەکانی زەحمەتکێشدا رێك ناکەون و بە وتەی خۆتان ئەم تێکۆشانە پاش شەڕ زۆر تووند بوو. لای ئێوە خاڵی سەرنجڕاکێش سەبارەت بە کەسێتی گەلێکی وەکو (تورو) لە رۆمانی (The wind - up Brid chronicle) کە بێکارە و زۆر لە ماڵەوە دەمێنێتەوە، چییە؟*

–من هەر لەو کاتەوە کە خوێندنم تەواو کرد و لەسەرپێی خۆم وەستام و بە تەواوی سەربەخۆ بووم، پەیوەندیم لەگەڵ هیچ کۆمپانیا یان رێکخراوێکدا نەبوو.

ژیان بەم شێوەیە لە ژاپۆندا ئاسانە. لێرەدا لەسەر ئەوەی کە پەیوەندیت لەگەڵ چ کۆمپانیا یان رێکخراوێکدا هەیە داوەریت لەبارەوە دەکەن و ئەمە بۆ من زۆر گرنگە. لەم رووەوە من هەموو کاتێك نامۆ بووم. تا رادەیەك ئەمە بۆ من گران بوو، بەڵام من ئەم شێوەیەی ژیانم زۆر خۆش دەوێت. لەم رۆژانەدا، لاوان بە دوای شێوازێکی وای ژیاندا دەگەڕێن، ئەوان متمانە بە هیچ کۆمپانیایەك ناکەن. دە ساڵ لەمەوبەر کۆمپانیای متیسوبیشی یان کۆمپانیا گەورەکانی دی زۆر توند و تۆڵ بوون، بەڵام چیتر وا نەماون، بە تایبەت ئێستا کە لاوان متمانەیان بە هیچ شتێك نییە. دەیانەوێت ئازاد بن. ئەوان سیستەم و کۆمەڵگای ئێستایان قبوڵ نییە. ئیدی ئەم لاوانە ئەگەر خوێندن تەواو بکەن و بەشداری هیچ کۆمپانیایەك نەکەن وەکو ئەندام، ناچارن نامۆبوون هەڵبژێرن. ئەمڕۆ ئەم کەسانە خەریکە لە کۆمەڵگاماندا دەبنە گرووپێکی گەورە. دەتوانم بە باشی لە هەستیان تێبگەم. من تەمەنم (48) ساڵە و ئەوان لە دەیەی بیست یان سیی تەمەنیانن، بەڵام من لە تۆڕی ئەنتەرنێتدا لاپەڕەیەکم هەیە کە پێکەوە پەیوەندیمان هەیە، ئەوان نامەم بۆ دەنێرن و بەباشی باسی کتێبەکانم دەکەن. زۆر سەیرە، نێوانمان جیاوازییەکی زۆرە بەڵام زۆر ئاسایی لە یەك تێدەگەین. من لەم مەسەلەیەدا حەزم لەم لایەنەی ئاسایی بوونەیە. من وا هەست دەکەم کە

کۆمەڵگاکـەمان لـە گۆڕانکاریدایـە. ئێمــە خــەریکین دەربارەی پاڵەوانەکانی ناو کتێبەکانمان دەدوێین. دەشـێ خوێنـەری کتێبـەکانم لەگـەڵ پاڵەوانــەکاندا هـاودەردی یـان هـاودڵی بکـەن. بـڕوام وایـە دەشـێ چیرۆکەکانی من جۆرێك هەستی ئازادی یان رزگاری بۆ خوێنەرەکانم پێك بهێنن.

- ***پاڵەوانەکانتان تا رادەیەك وەکو نووسەران دەژین لەبەرئەوەی کارێکی سەربەخۆیان هەیە. ئایا بە نووسەربوون لە وڵاتی ژاپۆندا کارێکی گرانە؟***

-گران نییە. من لەو یاسایە ئاوارتەم، تەنانەت نووسەران لە ژاپۆندا بۆ خۆیان رێکخراویان هەیە، بەڵام من ئەندامیان نیم. ئەمە یەکێکە لەو هۆکاری هەڵاتنەم لە ژاپۆن. ئەمە مافی خۆمە، من دەتوانم بۆ هـەر شـوێنێك کـە بمـەوێت، بـڕۆم. نووسـەران لـە ژاپۆنـدا کۆمەڵگەیـەکی ئـەدەبیان رێکخسـتووە، ئەڵقەیەکی ئەدەبی، ئەنجوومەنێك. وا بزانم لە سەدا نەوەدی نووسەرانی ژاپۆن لە شاری توکیۆدا دەژین. بۆیە ئاساییە ئەگەر کۆمەڵگەیەك پێکبهێنن. هەندێ گـروپ و نـەریتیش بوونـی هەیـە، ئـەوانیش بـە شێوەیەك پێکەوە دەبەسترێنەوە و ئەمە بەڕای مـن شتێکی پێکەنین هێنەرە. ئەگەر مرۆ نووسەر بێت بۆ ئەنجامدانی هـەموو کـارێك ئـازادە و ئـازادە کـە بـۆ هەموو شوێنێك بچێت و ئەمە لە لای من گرنگترین مەسـەلەیە و بەشـێوەیەکی سروشـتی زوربـەیان خۆشیان ناوێم. مـن حـەزم لـە دەسـتەبژێری نییـە. وەختێکیـش لـێرە دەڕۆم کەسـێك دڵـی بـۆم تـەنگ نابێ.

- ***ئایـــا ئـــەوان گرفتیـــان لەگـــەڵ نووسینەکانتاندا هەیە؟***

-من عاشقی کەلتووری پاپم. رولینگ ئستونز، دۆرز، دیڤید لینـچ و ئـەم جـۆرە شـتانە. هـەر بـەم بۆنەش بوو کە وتم حەزم لە دەستەبژێری نییە. من حـەزم لـە فیلمـە ترسـناکەکانە. ئسـتڤن کنینـگ، ریمونـد چندلـر، چیرۆکـە پۆلیسـییەکان. هەڵبـەت دەربارەی ئەم بابەتانە نانووسم. ئەو مەسـەلەیەی رەچاوم کردووە ئەمەیە کە لە بونیادی ئەو شتانە سوود وەربگرم نەك ناوەڕۆکەکەیان. حەز دەکەم ئەو ناوەڕۆکـەی رەچـاوم کـردووە لـە بوونیـادێکی وادا دانێم، ئەمە شێوازی منە، رێبازی منە. ئیدی ئـەم جۆرە نووسـەرانە منیـان خـۆش نـاوێت. نووسـەرە سـەرگەرمکەرەکان خۆشـیان نـاوێم و خـەڵکی ئـەدەبیاتی جیدیـش خۆشـیان نـاوێم. مـن بـە جۆرگەلێك لە ناوەڕاستدام و خەریکم کارێکی نوێ پێشکەش دەکەم، بۆیە نەمدەتوانی بۆ ماوەی چەند ساڵ شوێنی خۆم لە ژاپۆندا بدۆزمەوە. بەڵام ئێستا وا هەست دەکەم خەریکە گۆڕانکاریگەلێکی سەیر روودەدات. سنوورەکەم خەریکە فراوانتر دەبێتەوە. لە ماوەی ئەم پانزە ساڵەدا خوێنەری وەفاداری خۆم هـەبووە. ئـەوان کتێبـەکانم دەکـڕن و لایـەنگرمن. نووسەر و رەخنەگران هەواداری مـن نـین. وەختـێ سـنوورەکەم فراوانـتر دەبێتـەوە منیـش وەکـو نووسەرێکی ژاپۆنی هەستی بەرپرسیێتییم زیاتر و زیاتر دەبێت. ئەمە شتێکە کە ئێستاکە خەریکە بۆم روودەدات و هـەر بـەم بۆنەوەیـە کـە دوو سـاڵ لەمەوبـەر گەڕامـەوە بـۆ ژاپـۆن. سـاڵی رابـردوو سەبارەت بە هێرشی غازی سارین بە مێژووی تۆکیۆ لە مانگی مارسی *1995*ز دا کتێبێکم نووسی. مـن چاوپێکەوتنم لەگەڵ *63* کەس لەو قوربانیانە کرد کە لـەو رۆژەدا لـەو مێترۆیـەدا بـوون. ئـەم کـارەم کـرد لەبەرئـەوەی دەمـوویسـت لەگـەڵ خـەڵکی ئاسـایی ژاپۆندا بدوێم. رۆژێکـی دووشـەممە لـە کـاتژمێری *8:30* ی بـەیانی وەکـو رۆژانـی تـر خـەریك بـوون دەچوون بۆ مەرکەزی تۆکیۆ. میترۆی تۆکیۆ تـەواو داخـراو بـوو. دەزانـن ئـەوە کـاتێکی زۆر قەرەباڵغـە و

کەس ناتوانێ بجووڵێتەوە شان لە شان ئەدات. ئەوانە مرۆگەلێکی زۆر زەحمەتکێشن. ئەم مرۆڤە ئاساییانە، ئەم ژاپۆنییە ئاساییانە بێ هیچ هۆکارێك کەوتنە بەر هێرشی غازی ژەهراوی، گاڵتەجارییە. تەنها بە دوای ئەمەدا بووم کە تێبگەم چی روویداوە و ئەم مرۆڤانە کێن. ئیدی چاوم بە یەکەیەکەیان کەوت، ماوەی ساڵێکی خایاند. بەلاّم وەختێ لە چاوپێکەوتنەکاندا تێگەیشتم ئەو مرۆڤانە کێن زۆر بێ تاقەت و نارەحەت بووم. بۆیە من ڕقم لەو کەسانەیە کە دەچن بۆ کۆمپانیا، مووچەخۆر و بازرگانان. بەلاّم پاش ئەنجامدانی ئەو چاوپێکەوتنانە دڵم بە حاڵیان سووتا. لە ڕاستیدا من نازانم بۆچی ئەوان وا بە سەختی کاردەکەن. هەندێ لەو کەسانە لە کاتژمێری *5:30* ی بەیانییەوە لە خەو هەڵدەستن تا بچن بۆ مەرکەزی تۆکیۆ، زیاتر لە دوو کاتژمێر لە ناو مێترۆ دەمێننەوە، گشتیان پێکەوە لکاون. ناتوانی تەنانەت کتێبێك بخوێنیتەوە. بەلاّم ماوەی *30* تا *40* ساڵە ئەم کارە ئەنجام دەدەن. ئەمە بۆ من سەرسووڕهێنەرە. لە کاتژمێری (*10*)ی شەودا دەگەڕێنەوە بۆ ماڵەوە و لەو کاتەدا منداڵەکانیان خەوتوون. ئەوان تەنها یەك شەممان دەتوانن منداڵەکانیان ببینن. ئەمە شتێکی ترسناکە. بەلاّم گلەیی و گازندە ناکەن. لێم پرسین بۆچی گلەیی ناکەن؟ وەلاّمیان دایەوە کە بێ سوودە. ئەمە کارێکە گشت خەڵك ئەنجامی دەدەن ئیدی هۆکارێك بۆ سکاڵاکردن بوونی نییە.

- *ئایا ئیرەییتان پێ نابەن؟*

—نا، ئیرەیی نابەن. ئەوان فێری ئەو جۆرە ژیانە بوون. ساڵەهای ساڵە بەم شێوەیە دەژین. ڕێگایەکی تریان نییە. هەڵبەت ئەو مرۆ گرووپییانە و مرۆ ئاساییانە لە یەك شتدا لەیەك دەچن، وتنی سەختە، بە پێناسەیەکی دی، من عاشقی ئەو خەڵکەم، گوێ لە چیرۆکی منداڵییەکانیان دەگرم، دەمپرسی لە منداڵیدا چۆن مرۆڤێك بوون؟ ئەی لە قوتابخانەی دواناوەندیدا چۆن؟ وەختێ چوونە ژیانی هاوسەرێتییەوە چۆن مرۆێك بوون؟ چۆن کچێکتان هێنا؟ ژیانیان پڕە لە چیرۆك. هەریەك لەم خەڵکە بۆ خۆیان چیرۆکگەلێکی سەرنجڕاکێشیان هەبوو. ئەمە بۆ من زۆر سەرسووڕهێنەرە. ئێستا وەختێ سواری مێترۆ دەبم و ئەو کەسانە دەبینم کە —نایانناسم— زۆر لەگەڵیاندا ئاسوودەم. دەتوانم ئەمە ببینم کە ئەم خەڵکانە بۆ خۆیان چیرۆکیان هەیە. ئەو چاوپێکەوتنانە زۆر بەسوودبوون بۆ من. وا بزانم خەریکم دەگۆڕێم.

- *کاردانەوەی خوێنەران سەبارەت بەو کتێبەتان چۆن بوو؟*

—نامەگەلێکی زۆرم لە خوێنەران بەدەست گەیشت، بە زۆری کەوتبوونە ژێر کاریگەری کتێبەکەم، هەندێکیش دڵگەرم بوون. ئەم کاردانەوەیە بۆ کتێبێکی پۆلیسی کە چیرۆك نەبێ کاردانەوەیەکی سەیر بوو. خوێنەرەکان وتیان کە دڵگەرم بوون. خەڵك زۆر بە سەختی و بەراستگۆییەکی زۆرەوە کاردەکەن و ئەم کتێبە ڕایچڵەکاندن. ئەمە لەگەڵ گۆشەنیگاکانی پێشوماندا ڕێك نەدەکەوت — ئەمەی کە بە سەختی کارکردن، شتێکی باشە. وانییە. ئەمە جۆرێکە لە بەزەیی.

- چاوتان بە ئەندامانی گرووپی ئایوم کەوت؟

—ئێستا خەریکی ئەم کارەم. خەمیان بۆ دەخۆم. ئەوان لاون، زۆربەیان لە دەیەی بیست ساڵی تەمەنیانان. ئەوان زۆر جیدین. زۆر ئایدیالیستن، ئەوان زۆر بە جیدی دەربارەی جیهان و سیستەم و بەهاکان بیر دەکەنەوە. من لە ساڵی *1949*ز دا لەدایك بووم و لە ساڵەکانی دەیەی *1960*ز

**دا کە سەردەمی چالاکییە شۆڕشگێڕانەو دژ بە نەریتەکانی بوو، خوێندکار بووم. ئێمەش خاوەن ئایدیابووین، مەبەستم نەوە و چینی خۆمانە. بەڵام ئێستا نیشانەیەك لەو ئایدیایە نەماوە و "ئابووریەکی تازە" هاتووە ئاراوە. ئەو لاوانەش تا ڕادەیەك وەکو سەردەمی لاوی خۆمانن، خاوەن ئایدیان و ناتوانن خۆیان بە بەشێك لە سیستەمی نرخ و بەهاکان بزانن، هیچ کەس قبوڵیان ناکات و بەم بۆنەیە کە چوونەتە لای ئەو گروپەوە. لە چاوپێکەوتنەکاندا دەیانووت کە پارە لای ئەوان هیچ مانایەکی نییە. ئەمەی کە بەدوای شتێکی بە نرخترەوەن، شتێکی مەعنەوی، کە ئەمە بیرۆکەیەکی خراپ نییە هەڵەش نییە. بەڵام هیچ کەس جگە لە خۆیان ناتوانێ پێشنیارێکیان پێ بکات. ئەوان بۆ دووبارە بینین و پشکنین سیستەمێکیان نییە تا بتوانن لەسەر ئەمە داوەری بکەن کە چ شتێك ڕاستەو چ شتێك هەڵەیە. ئێمە ئەم سیستەمە داوەریەمان پێ نەداون. بەڕای من ئێمەی نووسەران بەرانبەر ئەم مەسەلەیە بەرپرسین. ئەگەر من چیرۆکێکی شیاوتان پێشکەش بکەم، ئەو چیرۆکە سیستەمێکی داوەریتان پێشکەش دەکات و پێتان دەڵێت کە چ شتێك ڕاستەو چ شتێك هەڵەیە. بەڕای من چیرۆك بە مانای لەپێکردنی پێڵاوی کەسێکی دیکەیە. لە دنیادا کۆمەڵێکی زۆر پێڵاو هەیە، وەختێ مرۆ قاچی دەخاتە ناویان لە ڕوانگەی کەسانی دیکەوە سەیری دنیا دەکات. مرۆ لە ڕێی چیرۆکە باش و جیدییەکاندا سەبارەت بە دنیا شت فێردەبێ. بەڵام کەسێك چیرۆکێکی باشی بەو گروپە نەدا. کاتێ ئاساهارا - گورووی ئایوم - چیرۆکەکەی پێدان، ئەوان بە توندی کەوتنە ژێر کاریگەری توانا و هێزی چیرۆکەکەی. ئاساهارا خاوەنی توانایەکە کە هەڵبەتە ئەنجامێکی شەیتانی هەبوو. بەڵام ئەوەی گرنگە ئەمەیە کە ئاساهارا چیرۆکێکی بەهێز و توندی پێدان و، من بۆ ئەمە داخدارم. ئەو خاڵەی من ڕەچاوم کردووە ئەمەیە کە دەبوایە "ئێمە" چیرۆکی باشمان پێبدانایە.**

**لە (*The wind - up Brid chronicle*)دا، (نوبورو) برای هاوسەری (تورو) کەسایەتیەکی زۆر سەرنجڕاکێشە، وەکو پسپۆڕێکی ڕاگەیاندن کە بۆ تەلەفزیون دەچێت تا سەبارەت بە سیاسەت و ئابووری بدوێت، بەڵام ئەو باوەڕی بە هیچ شتێك نییە، تەنها ئەو شتە دەڵێت کە بەسوودی خۆی بێت. چ سەرچاوەیەکی ئیلهامی بوو بەهۆی دروستبوونی؟ تەلەفزیۆن (پێ دەکەنێت).**

**هەڵبەت من بە شێوەیەکی گشتی سەیری تەلەفزیۆن ناکەم، بەڵام ئەگەر تەنها یەك ڕۆژی تەواو لە بەیانییەوە تاکو شەو سەیری تەلەفزیۆن بکەیت دەتوانی کەسێتییەکی وا بخوڵقێنیت. ئەو دەتوانێ قسە بکات، بەڵام لە ئاستێکی سادە و ساکار لە ناوەوەی خۆیدا هیچ شتێکی نییە. لەم جۆرە مرۆڤانە لە ژاپۆندا زۆرن، هەروەها لە وڵاتە یەکگرتووەکانیشدا. زۆربەی نەتەوەخوازەکان وەکو نوبورو مرۆگەلێکی بەتاڵ و ساکارن. وا هەست دەکەم بوونی ئەم جۆرە کەسانە تاڕادەیەك مەترسیدارە. هەڵبەت دەتوانین پێیان پێبکەنین بەڵام لە ڕاستیدا بوونیان مەترسی هێنە.**

- ***ئایا لە فاشیزم یان شتێکی وا دەترسن؟***

**-فاشیزم وشەیەکی گونجاو نییە، پێویستە بوترێت نەتەوەخوازی و "ئەوانەی داواکاری تیۆری تازەن" ئەوان دەڵێن کە هیچ کوشتنێکی بە کۆمەڵی "نان لینگ" لە ئارادا نییە و مەسەلەیەك بە ناوی "ژنان بۆ ئاسایش" بوونی نییە (مەبەست لە ژنان بۆ ئاسایش ئەو ژنە چینی و کۆرییانەیە کە بە دەستی لەشکری ژاپۆن بە زۆر وەکو کۆیلەی**

سێکسی، سوودیان لێ وەردەگیردرا). ئەوان خەریکن سەرلەنوێ مێژوو پێك دەهێننەوەو ئەمە زۆر مەترسیدارە. چەند ساڵێك لەمەوبەر چووم بۆ مەنچووری و سەردانی چەند گوندێکم کرد. خەڵکی ئەو گوندانە پێیان وتم کە "سەربازە ژاپۆنییەکان *50* تا *60* کەس لە خەڵکی ئەو گوندەیان کووشتووە" گۆڕستانە بە کۆمەڵەکانیان پێشاندام، هێشتاش هەر ماون. بەڕاستی تووشی هێدمەت دەکات و هیچ کەسێك ناتوانێ ئەم ڕاستییە ڕەت بکاتەوە، بەڵام ئەمە کارێکە کە ئەوان خەریکن ئەنجامی دەدەن. ئێمە دەتوانین بۆ پێشەوە بچین، بەڵام پێویستە رابردوومان لەیاد نەکەین. پێویست ناکات دیلی ڕابردوو بین بەڵام پێویستە لە یادی نەکەین، ئەمە جیاوازی هەیە.

- *ئێوە دەڵێن کە خەیاڵ لەناو کارەکانتاندا زۆر گرنگە. هەندێ جار ڕۆمانەکانتان زۆر (ڕیالیستی)ین و هەندێ جار زۆر متافیزیکین.*

—من چیرۆکی عەجیب و غەریب دەنووسم. نازانم بۆچی ئەوەندە حەز دەکەم نووسینەکانم عەجیب و غەریب بن. من بۆ خۆم مرۆیەکی ریالیستم. متمانەم بە هیچ شتێکی سەردەمی نوێ نییە؛ یان بەرجەستەکردن و (تاروت) خەون و بەخت و.... بە هیچ شێوەیەك متمانەم بەم جۆرە شتانە نییە. لە کاتژمێری *6*ی بەیانی لەخەو هەڵدەستم و *10*ی شەو دەنووم. هەموو ڕۆژێك لەسەرخۆ ڕادەکەم و مەلە دەکەم، خۆراکی تەندروست دەخۆم. من مرۆیەکی زۆر ریالیستم، بەڵام وەختێ دەنووسم، عەجیب و غەریب دەنووسم و ئەمە زۆر سەیرە. هەرچەند زیاتر جیدی دەبم زیاتر عەجیب و غەریب دەبم. وەختێ دەمەوێ سەبارەت بە ڕاستییەکانی کۆمەڵگە و جیهان بنووسم، نووسینەکەم عەجیب و غەریب دەبێ. زۆر کەس لێم دەپرسن بۆچی (،) من

وڵامێکم نییە. بەڵام وەختێ لەگەڵ ئەو *63* کەسەدا گفتوگۆم کرد پەیم بەم مەسەلەیە برد؛ ئەوان زۆر سادە بوون، بێ فڕ و فێڵ و ئاسایی بوون، بەڵام هەندێ جار چیرۆکەکانیان گەلێك سەیر بوو و ئەمە بۆ من زۆر سەرنجڕاکێش بوو.

- *ئایا ئێوە خۆتان وەکو (تورو)ی پاڵەوانی چیرۆکەکەتان لەبن بیرێکی وشکدا دانیشتوون؟*

—نا، بەڵام بیرەکان هەمیشە لای من سەرنجڕاکێش بوون، زۆر زۆر. هەر جار کە بیرێك دەبینم دەچمە لای و دەوەستم و سەیری ناوی دەکەم.

- *ئایا چاوەڕێی ئەوە دەکەن ڕۆژێکیان بچنە ناو بیرێك؟*

—نە، نە.

- *دەترسیت؟*

—بەڵێ دەترسم — من نووسینی کەسانێکم خوێندۆتەوە کە کەوتوونەتە ناو بیرەوە. چیرۆکێکم خوێندبووەوە، نووسینی ریموند کارور — سەبارەت بە کوڕێك کە کەوتبووە ناو بیرێکەوە و ڕۆژێکی تەواو لە ناو بیرەکە مابووەوە، چیرۆکێکی باش بوو.

- *کارور نووسەرێکی زۆر ریالیست بوو.*

—بەڵێ، زۆر ریالیست بوو. بەڵام لە لای منی نووسەر نەست زۆر گرنگە. من زۆر لە بەرهەمەکانی یونگ ناخوێنمەوە بەڵام نووسینەکانی زۆر لە نووسینەکانی من دەچێت. "نەست.. لای من ناوچەیەکی نەناسراوە. نامەوێ شی بکەمەوە، بەڵام یونگ و دەروونناسەکان هەمیشە خەریکی شیکردنەوەی خەیاڵەکان و ڕێژەی گرنگایەتی هەموو شتێکن. من نامەوێ کارێکی وا بکەم. نەست لە لای من هەر نەستە. ڕەنگە ئەم ڕوانگەیە تا ڕادەیەك سەیر بێت، بەڵام وا هەست دەکەم کە دەتوانم بەم ڕوانگەیەوە بەو شتە بگەم کە ڕەچاوم

کــردووە. هــەندێ جــار کونــترۆڵکردنی لەگــەڵ مەترسـیدایە. دیمـەنی ئوتێلــە پــڕ لــە نهێنیەکــەت لـەبیرە؟ من چیرۆکی ئارڤیوسم خۆشدەوێت. هاتنـە خوارەوەی بەپێی ئەو چیرۆکەیە. "دنیای مەرگ"، و مرۆڤ بە ترسەوە دەچێتە ناویـەوە. خۆم وا هەست دەکەم نووسەرم و دەتوانم ئەم کارە ئەنجام بدەم. واتە خەریکم کارێکی مەترسیدار ئەنجام بدەم. دڵنیام کە دەتوانم ئەنجامی بدەم. بەڵام کاتی دەوێت. وەختێ دەستم کرد بە نووسینی ئەم کتێبە، هەموو ڕۆژێك دەمنووسی و دەمنووسی. هەرکە تاریکی داهات دەچوومە ناویەوە، هەڵبەتە پێشتر کاتی دەویست، مەبەستم گەیشتن بەو قۆناغەیە. مرۆ ناتوانێ ئەمرۆ دەست بە نووسین بکات و سبەینێ بچێتە ناو دنیایەکی واوە، پێویستە هەموو ڕۆژێك تاقەتت هەبێت و زەحمەت بکێشیت. پێویستە توانای تەرکیزت هەبێت. بەڕای من ئەمە گرنگترین بەشی کاری نووسەرە. هەموو ڕۆژێ بۆ ئەم مەبەستە پرۆڤەم دەکرد. توانای جەستەیی زۆر پێویستە. زۆربەی نووسەران بەهایەك بۆ توانای جەستەیی دانانێن (پێ دەکەنێت) زۆر دەخۆنەوەو جگەرەی زۆر دەکێشن. هەڵبەت من ڕەخنەیان لێ ناگرم بەڵام توانای جەستەیی لای من زۆر گرنگە. خەڵك بڕواناکەن کە من نووسەرم لەبەرئەوەی هەموو ڕۆژێك ڕادەکەم و مەلە دەکەم. دەڵێن: "ئەوە نووسەرە؟".

- *وەختێ دەربارەی ئەو شتە تاریکانە دەنووسن، خۆشتان دووچاری ترس دەبن؟*

—نە، بە هیچ شێوەیەك.

- *تەنانەت لەو ساتەشدا کە بوونەوەرە شەیتانەکە لە دەرگای ئوتێلەکەوە دێتە ژوورەوە تاکو (تورو) بگرێت، یان ئەو کاتەی کە ئەو سەربازە بە زیندوویی پێستی لێ دەکەنەوە؟ نووسینی دیمەنی ئاوا بێتاقەتتان ناکات؟*

—لەم لایەنەوە بەڵێ دووچاری ترس دەبم وەختێ ئەو دیمەنانەم دەنووسی خۆیشم لەوێ بووم. ئەو شوێنەم دەناسی. دەتوانم هەست بەو تاریکیە بکەم. دەتوانم بۆنی ئەو بۆنە سەیرانە بکەم. ئەگەر نەتوانی ئەم کارانە بکەیت ئەوە نووسەرنیت. ئەگەر نووسەر بیت دەتوانی لە ژێر پێستتا هەستی پێ بکەیت. وەختێ خەریکبووم دیمەنەکانی لێکردنەوەی پێستی ئەو سەربازەم دەنووسی، لام زۆر ترسناك بوو و منیش زۆر ترسابووم. لە ڕاستیدا نەمدەویست ئەو دیمەنانە بنووسم، بەڵام نووسیم. لە نووسینی ئاوا دیمەنێك قایل نەبووم، بەڵام نووسینی لەم چیرۆکەدا پێویست بوو. مرۆڤ ناتوانێ خۆی لێ بەدوور بگرێت. بەشێکە لە بەرپرسێتی.

- *لەوە دەچێت وەختێ لە نووسینی شتێك دەترسیت، وا بڕیار دەدەیت بە دوایدا بچیت؟*

—ناکرێت لێی هەڵبێیت. پەندێکی ژاپۆنی هەیە دەڵێت: "ئەگەر بێچووی پڵنگت دەوێت، پێویستە بچیتە ناو لانەی پڵنگەکەوە".

## سەرچاوە

ماهنامەء ادبی، هندی گلستانه. ژمارە *42* شهریور *1381*.

# کیژه قژ درێژه‌که

**هاینریش بول**

**له عه‌ره‌بییه‌وه: ره‌ووف بێگه‌رد**

*هاینریش بول له نووسه‌ره ناوداره‌کانی ئه‌ڵمانیایه، ساڵی 1917 له شاری کوڵن له‌دایك بووه، بەرهەمەکانی بەرئەنجامی بیری پێشکەوتنخواز و مرۆڤ دۆستی ئەون، له ئازادی و ئاینده‌ی گه‌شاوه‌ی مرۆڤایه‌تی ده‌دوێت و ئه‌وانه ڕسواده‌کات – هه‌ندێك جار له شێوازی گاڵته‌جاڕدا – که هه‌لپه‌رستان به‌رژه‌وه‌ندی خۆیان له‌سه‌رووی خه‌ڵکه‌وه ده‌بینن. هاوده‌ردی چینه هه‌ژاره‌کانی کۆمه‌ڵگا و دژ به چه‌وساندنه‌وه‌ی سه‌رمایه‌دار و چینی زۆر ده‌وڵه‌مه‌نده، بول له شه‌ڕی دووه‌می جیهانیدا به زۆر کراوه‌ته سه‌ربازی سوپای هیتله‌ر، ئه‌و به‌شداریکردنه‌ی که خۆی پێی قایل نه‌بوه وای کردوه ببێته دوژمنێکی سه‌رسه‌ختی جه‌نگ و هه‌میشه نه‌فره‌تی لێ بکات. به کۆتایی هاتنی شه‌ڕ و گه‌ڕانه‌وه‌ی بۆ کوڵن ئیتر نووسینی کرده پیشه و زۆری نه‌برد بوو به یه‌کێك له ڕۆماننووسه تازه و ناوداره‌کانی ئه‌ڵمانیا، له‌به‌رئه‌وه‌ی ناوه‌ڕۆکی کاره‌کانی ده‌رخستنی دیارده و ژیانی به‌ته‌نگهاتووی خه‌ڵکانی سته‌م لێکراوه (سه‌ربازه‌کانی شه‌ڕ، برسیه‌کان، که‌سانی بێ ماڵ و سامانی دوای شه‌ڕ، ئاواره و قوربانیه‌کان) ئه‌مه‌یش به زمانێکی ساده‌ی بێ زۆر له خۆکردن، بۆیه زۆر زوو جه‌ماوه‌رێکی زۆری خوێنه‌ری کاره‌کانی بۆ ڕه‌خسا. بول نووسه‌ری کورته چیرۆکه و هه‌ر به‌وه‌یش ناوی ده‌رکردوه. به‌ڵام له‌سه‌ر جوانترین ڕۆمانیشی که به ناوی (سیمای ژنێك له نێو کۆمه‌ڵدا) یه ساڵی 1972 خه‌ڵاتی نۆبڵی ئه‌کادیمای سویدی درایه.*

–وه‌رگێڕ–

شتێکی سه‌یره! هه‌ر پێنج ده‌قیقه پێش ئه‌وه‌ی پۆلیس کۆنترۆڵی ئه‌و ناوه بکات، من هه‌ستم به ڕوودانی شتێك کرد. ترسێك باڵی به‌سه‌ردا کێشام، به پارێزه‌وه له‌ملاو ئه‌ولای خۆمم ڕوانی، پاشان له‌سه‌رخۆ به که‌نار –ڕاین–دا به‌ره‌و وێستگه‌که چووم، ده‌مبینین چۆن به کڵاوی سور و ماشینه بچووکه‌کانیانه‌وه په‌لاماری خێرا ده‌ده‌ن، له ماوه‌یه‌کی زۆر که‌مدا ته‌واوی گه‌ڕه‌کیان گه‌مارۆدا و که‌وتنه پشکنین، هه‌رگیز چاوه‌ڕێ نه‌ده‌کرا به‌و خێراییه ئه‌و کاره بکرێت، وه‌لێ من له ده‌ره‌وه‌ی بازنه‌که وه‌ستام و جگه‌ره‌یه‌کم پێ کرد. کاره‌که بێ کێشه ته‌واو بوو، گه‌لێك که‌س ده‌ستبه‌رداری جگه‌ره‌کانیان بوون. منیش به خۆم وت: به داخه‌وه، زیانێکی زۆر. پاشان بێ ویستی خۆم خێرا که‌وتمه ئه‌ژمار و سه‌روبنی زیانه‌که تا بزانم چه‌ندێك فرێ دراوه‌ته سه‌ر شۆسته‌که. له چاوتروکانێکدا ماشینی

بەندیخانەکە پڕکرا، هەموو ئەوانەی گرتبوویانن تێیان خزاند، "فرانتس" یەکێکیان بوو، لە دوورەوە ئامارژەیەکی نائومێدانەی بۆ کردم، وەك پێم بڵێت: "ئای لەم بەدبەختیە!" پۆلیسێك ئاوڕی دایەوەو تەماشای کردم، دەرفەتم هێناو بۆی دەرچووم، بەڵام هێدی هێدی. ئای خودا، ئەگەر منیشیان بگرتایە!

نەمدەویست بگەڕێمەوە ئەو ژورە بچووکەی تیا دەژیام، بۆیە لەسەرخۆ بەرەو وێستگەکە بەڕێ کەوتم. بە دارەکەی دەستم بەردی سەر ڕێگاکەم لادا.

هەتاوەکەی گەرم و، شەماڵێکی خۆش لە ڕاینەوە هەڵی کردبوو. کە گەیشتم چوومە مەیخانەی وێستگەکە. دوو سەد جگەرەم دایە -فریتس- و پارەکەیم لە گیرفانم نا، ئیتر بێجگە لە پاکەتێك جگەرە بۆ کێشانی خۆم هیچی ترم پێ نەمابوو، پاشان، ئەگەرچی شوێنەکە زۆر جەنجاڵ بوو بەڵام هەرچۆنێك بوو توانیم جێگایەکی بەتاڵ بۆ خۆم پەیدا بکەم. داوای نان و قاپێك شۆربام کرد، جارێکی تر -فریتس-م بینیەوە ئامارژەی بۆ ئەکردم. بەڵام من نەمویست دیسان خۆم ماندوو بکەم. بۆیە خۆی بە هەنگاوی گورج بەرەو لام هات و کارگەرە چکۆلەکەیشی لەگەڵدا بوو کە ئێمە پێمان دەوت کۆڵبەر، هەردووکیان پەشۆکابوون، فریتس چرپاندی "تێئەگەیت؟" پاشان بەدەم سەر لەقاندنێکی بێزاریەوە دوورکەوتەوەو کۆڵبەرەکەیش بە هانکە هانك هاتە لامەوەو بە دەنگی پچڕ پچڕ وتی: "دەبێت هەر ئێستا هەڵبێیت، ژوورەکەتیان پشکنیوەو شتەکانیان دۆزیوەتەوە" بەدەم قسەکانەوە خەریك بوو دەخنکا. بۆ ئەوەی هێوری بکەمەوە دام بە شانیا و بیست مارکم خستە گیرفانیەوە، پێم وت: "باشە" و ئیتر زوو بۆی دەرچوو. لەو چرکەساتەدا شتێکم بیرکەوتەوە: "هاینی گوێ بگرە، ئەتوانیت هەرچۆنێك بوە کتێب و پاڵتاوەکەم بشاریتەوە، من دوای پانزە ڕۆژ دێمەوە، تێدەگەیت؟ هەرچیەکی تر کە دەمێنێتەوە بۆ خۆت" بەسەر ئامارژەی قایلبوونی کرد. من بڕوای پێ ئەکەم، هاینی پیاوێکی دەست پاکە.

"چ زیانێکی گەورە! هەشت هەزار مارك بە باچوو، ئێمە هەرگیز دڵنیا ناژین" کە لەسەرخۆ دانیشتم سەیر تەماشایان دەکردم، منیش بەهێمنی و بێ دەربەستانە دەستم لە گیرفانم دەگێڕا. پاشان گوێ قوڵاغی ئەو ژاوەژاوە بووم کە لە هەموو لایەکەوە دەوری دابووم، هەستم بەوە کرد من هەرگیز ئەو تەنیاییە دەگمەن و خۆشەم لە شوێنی تردا بۆ هەڵناکەوێت وەك لە ناو ئەم هەراو زەنای مەیخانەی وێستگەکەدا دەستم کەوتوە. لە پڕ شتێکی سەیر سەرنجی ڕاکێشام: من کە بێ مەبەست بە هەموو لایەکی هۆڵەکەدا دەمڕوانی بێ ئەوەی لەسەر شتێکی دیاریکراو بوەستم، کەچی زۆر جار ڕوانینەکەم لە نوختەیەکدا گیری دەخوارد بێ ئەوەی ئارەزووی خۆمی لە پشتەوە بێت. بەردەوام بەو نوختەیەوە دەگیرسایەوەو، پێش ئەوەی خۆی لێ کەلا بخات پێوەی دەنوسا. ئەمە وای ڕاکێشام وەك ئەوەی یەکێك لە خەوێکی قووڵم ڕابچڵەکێنێت. بۆیە پاشان بە ناچاری کەوتمە تەماشاکردنی.

دوو مێز لەولای مێزەکەمەوە، ژنێك دانیشتبوو، پاڵتاوێکی ڕەنگ کراوەی لەبەردا بوو، کڵاوێکی زەردی کەمێك گەنم ڕەنگی نابوە سەر قژە ڕەشەکەی و دەیخوێندەوە. لە پێشدا بێجگە لە لەشە کەمێك گرمۆڵەکەی و تۆزێك لە لووت و دەستە ناسکەکانی چی ترم نەبینی، هەروەها پووزە خشتەکەیشی، نازانم لە کەیەوە لێم دەڕوانی، هەندێك جار دەموچاوە ناسکەکەیم لێ دەردەکەوت، بەتایبەتی کە لاپەڕەکانی هەڵدەدایەوە. کتوپڕ سەری هەڵبڕی و بۆ چرکەساتێك چاوە گەورەکانی تێ بڕیم، ڕوانینەکەی

خێسەیەکی بێ دەربەستانە بوو. پاشان، سەرلەنوێ دەستی بە خوێندنەوە کردەوە.

ئەو تۆزە ڕوانینە پەلەیە بەس بوو بۆ ئەوەی لە داوم بنێت. لەسەرخۆ کەوتمە چاودێری کردنی. تا لە خوێندنەوەکەی بوەوە دڵم بە توندی لێی دەدا. پاشان هەردوو ئانیشکی خستە سەر مێزەکە، بەبزاوتێکی نائومێدانەوە پێکە بیرەکەی بەرەو دەمی بەرزکردەوە. ئیتر بە تەواوی دەم و چاویم بۆ دەرکەوت، ڕەنگی پەڕیوو هەڵبزڕکاو، دەمی بچووك و لێوی تەنك، لووتی ڕێك و خنجیلە، بەلآم چاوی.. دوو چاوی خۆڵەمێشی و خەمبار، قژی ڕەشی تا سەرشانی هاتبوو. من لە تەماشاکردنەکەمدا وام دەهاتە بەرچاو کە لە پرسەیەکی گەورەدا بێت. نازانم تێڕامانەکەم چەندی پێ چوو. بیست دەقیقە، سەعاتێك یان زیاتر، نازانم، کاتێك ڕوانینە غەمگینەکەیم بەردەکەوت وام دەهاتە بەرچاو کە خەمۆکیەکەی تا دەهات لە ناوەوەیدا گەورە دەبوو، هەستم بەوە نەدەکرد لە سیمایدا دوودڵی و توڕەیی، یان هیچ دەربڕینێك کە لە حاڵی وادا بە ڕووی کیژۆڵانەوە دەیبینیت دەربکەوێت. خەمۆکیو تەنیا خەمۆکی، دەموچاوی هەر ئەوەی پێوەدیار بوو، خەمۆکیەکی ترسناك.

من لەوە دڵنیام کە نەمدەویست بارەکەی لێ تێك بدەم، بەلآم نەیشم دەتوانی تەماشای نەکەم. تا لە دواییدا، لە ناکاوێکدا هەستا، جانتاکەی دا بە شانیا و بە پەلە چووە دەرێ.

دوای کەوتم، بێ ئەوەی بۆ جارێکیش ئاوڕ بداتەوە بەرەو دەرگا بچووکەکە بە پلیکانەکاندا سەرکەوت، وەك دیل کەوتبوە ناو تۆڕی ڕوانینەکەمەوە، تەنانەت لە کاتی کارت بڕینیشدا چاوم لێ نەدەتروکاند، کەمێك لێم دوور کەوتبوەوە. بۆیە بە ناچاری داردەستەکەم لە بن هەنگڵم ناو خێراتر کەوتمە دوای. لەوەدابوو لە ڕاڕەوە تاریکەکەدا، کە لە پێش گەیشتنە شۆستەکان دەبێت بیبڕیت لێم ون بێت، لەوێدا بینیم پاڵی دابوە قوڵغێکی ڕوخاوەوە، زۆر بە وردی لە هێڵە ئاسنینەکەی دەڕوانی و بۆ جارێکیش ئاوڕی نەدایەوە، هەوایەکی فێنك لە "ڕاین"ەوە دەهات و خۆی بەناو وێستگەکەدا دەکرد.

تاریکی داهات، گەلێك لە گەشتکارەکان جانتا و شت ومەکەکانیان بە کۆڵەوە بوو، لەسەر شۆستەکانیش جانتای گەورەتر چاوەڕێی هێنان بوون. هەموو گەشتکارەکان بێزار و لەش قورس بوون، هەڵدەلەرزین و تەماشای ئەو لایەیان دەکرد کە باکە لێی هەڵکردبوو. نیوە بازنەیەکی گەورەی تێر و هێور، ئەوە ئەو ئاسمانە بوو کە لە نێوان تۆڕ بەندی وێستگەکەوە دەمانبینی.

کەوتمە سەر شۆستەکەو هەڵمدەڕوانی، جار جارە تەماشای لای کچەکەم دەکرد بۆ ئەوەی دڵنیابم لە شوێنەکەیدایە. کە شەمەندەفەرەکە هاتە وێستگەکە هێشتا نەوەستا بوو کە کچەکە سەرکەوتە نێو فارگۆنێکەوە و ون بوو. لەو جەنجاڵی و بێنەو بەردەی گەشتکارەکان لەبەردەم دەرگاکاندا بۆ چەند دەقیقەیەك کچەکەم لەبەرچاو ون بوو. بەلآم زۆری نەبرد بە هۆی کلآوە زەردەکەیەوە دۆزیمەوە. سەرکەوتم و ڕێك بەرانبەری دانیشتم، ئەمەندە لێك نزیك بووین ئەژنۆمان بەر یەکدی دەکەوت. کە چاوە هێور و غەمبارەکانی هەڵبڕی بڕۆ پەیوەستەکانیم بینی. لە ڕوویا ئەوەم بۆ دەرکەوت کە زانیویەتی چۆن هەنگاو بە هەنگاو بە دوایەوەم، کە شەمەندەفەرەکە ڕێکەوت و شەو داکەوت، جارێکی دی چاوم تێبڕیەوە. نەمدەتوانی وتەیەکی لەگەڵدا بدوێم. کێڵگەکان تەواو تاریك و گوندەکانیش وردە وردە وایان لێ دەهات. هەستم کرد سەرما دەگاتە سەر ئێسکم، لە خۆم پرسی: ئەم شەو لە کوێ بنووم؟ لە کوێ بحەوێمەوە؟ ئاه! خۆزگا دەمتوانی

سەرم لە ناو قژە ڕەشەکەیدا ون بکەم، بێجگە لەوە هیچی ترم ناوێت.

جگەرەیەکم داگیرساند. تەماشایەکی خێرا و سەیری پاکەتەکەی کرد. جگەرەیەکم بۆ ڕاگرت، بە دەنگێکی گڕەوە فەرمووم لێ کرد، ئەمەندە هەستێکی سەیر دایگرتم لەوەدا بوو دڵم لە گەرومەوە بێتە دەرێ. بۆ ماوەیەکی زۆر کەم کچەکە دوو دڵ بوو. لەگەڵ ئەوەیشدا کە تاریك بوو دەم و چاوە سوور داگەڕاوەکەیم بینی، پاشان جگەرەکەی وەرگرت و زۆر بە لەزەتەوە کەوتە کێشانی، وتی:

—تۆ پیاوێکی باشیت.

دەنگی غەمگین و گڕ بوو، کە پشکنەرەکە هاتە نزیکمانەوە، وەك لە پێشدا ڕێك کەوتبین، لەسەر جێگاکان پاڵماندایەوە و مت بووین، هەریەکە و لە لای خۆیەوە خۆمان کرد بە نووستوو، بەڵام من لە ژێرەوە تەماشام دەکرد کە پێدەکەنی. پشکنەرەکە گڵۆپی لێ دەداو تەماشای بلیتەکانی دەکرد. لە پڕا ڕووی گڵۆپە کارەباییەکەی لە من کرد. لە جموجووڵی ڕووناکیەکەدا هەستم بە دوودڵی پشکنەرەکە کرد، پاشان ڕووی گڵۆپەکەی کردە کچەکە، ئاه.. چەندە تێکچووبوو، چەند ناوچاوانی غەم ئەنگێز بوو!

ژنێکی کەتەی زۆر بلێ کە لە پاڵما دانیشتبوو، قۆڵی پشکنەرەکەی گرت و شتێکی بە گوێیدا چرپاند، زانیم پێی وت: "ئەم دوانە بلیتیان نەبڕیوە، جگەرە، بازاڕی ڕەش" لەو کاتەدا پشکنەرەکە سیخورمەیەکی لە پەراسووم کوتا.

کە لەسەرخۆ پرسیاری ئەوەم لە کچەکە کرد بۆ کوێ دەچێت هەموو ئەملاولام بێدەنگ بوون، ناوی شارەکەی پێ وتم. پارەی هەردوو بلیتەکەو سزاکەیشم دا، کە پشکنەرەکە ڕۆشت، هەموو ئەوانەی لە فارگۆنەکەدا بوون زۆر بە بێدەنگییەکی ساردەوە کەوتنە تەماشاکردنمان، بەڵام کچەکە زۆر بە گەرمی و گاڵتە پێکردنێکی سەیرەوە لێی پرسیم: "تۆیش بۆ هەمان شار دەچیت؟"

پێم وت دەتوانم بچم، ناسیاوم لەوێ هەیە، ماڵێکی دیاریکراو نا، بەڵام... تەنیا "ئا"یەکی کرد و سەرلەنوێ پاڵیدایەوە.

لەو تاریکیەی دەوروبەرماندا نەمدەتوانی بە تەواوی ڕوخساری ببینم. ئەو کاتە نەبێت کە ستونێکی کارەبایی پاڵ هێڵی شەمەندەفەرەکە ڕووناکی دەڕژاندە ژوورەکەوە.

کە گەیشتینە وێستگەکە دنیا تەواو تاریك بوو، کە لێی ڕەت بووین شار لە خەوێکی قووڵدا بوو. لە ژێر گەڵای درەختە میهرەبانەکاندا، ماڵە بچووکەکان هەناسەی هێور و شادیان دەدا، بە کچەکەم وت: "دێم لەگەڵت، دنیا زۆر تاریکە" وەستا، لە ژێر ستوونێکی کارەبادا، زۆر لەسەرخۆ لێم ڕاما، پاشان بە بێزاریەوە دەمی کردەوە و وتی: "خۆزگا بمزانیایە بۆ کوێ دەچم؟"

کەمێك ڕەنگی ڕوخساری گۆڕا. ماچم نەکرد، وردە وردە لە شار دوورکەوتینەوە. پاشان بڕیارماندا خۆمان بخزێنینە ناو کۆمەڵێك کاوە، خۆمان لە ناو کاکەدا حەشاردا. لە ڕاستیا من کەسم لەو شارەدا نەدەناسی.

لە بەرەبەیاندا کە هەوا تەواو ساردی کرد، لێی نزیك کەوتمەوە، بەشێکی پاڵتاواکەی خۆی پێدادام. بەو جۆرە، هەردووکمان، بە هۆی هەناسە و خوێنمانەوە هەستمان بە گەرمی کرد. لەو کاتەوە، هەر لەو کاتەوە، ئیتر هەرگیز لە یەکدی جیانەبووینەوە.

## سەرچاوە

قصص عالمية. ترجمة حسونة المصباحي *1988* دار الشؤون الثقافية العامة.

# چیتر تەنیا نیم

## ئەحمەد شاملو

له فارسییەوە: فەرەیدون بێوار

کۆترێك بەسەر شانمەوەیە
کە لە زاری تۆیا ئاو دەخواتەوە
کۆترێك بەسەر شانمەوەیە
کە گەروی من پاراودەکا.
کۆترێك بەسەر شانمەوەیە
بەوەفا و ژیر کە لەگەڵ منا
باس لە ڕوناکی دەکا و لە مرۆڤ
کە –رب النوع–ی هەموو خواکانە
من لەگەڵ مرۆڤا لە ئەبەدیەتی
پڕ ئەستێرەوە هەنگاو دەنێم.
لە تاریکیا حەقیقەتێ بزوت
لە کۆڵانا پیاوێ کەوتە سەر خاك
لە ماڵا ژنێ گریا
لە بێشکەدا مناڵێ زەردەخەنەی کرد.
ئینسانەکان هاوتێکۆشانی حەقیقەتن
ئینسانەکان هاوزادی ئەبەدیەتن
من لەگەڵ ئەبەدیەتا نامۆ نیم.

ژیان لە ژێر بەردچینی دیواری
زیندانە نەفرەت لێکراوەکانا
سرود دەخوێنێ
لە چاوی بووکەڵە شێوێنراوەکاندا، شەو چرای جوانی،
دەدرەوشێتەوە

شارەکەم سەمای کۆڵانەکانی دەدۆزێتەوە.
هیچ جێگا، هیچ کات هاواری ژیان
بێ وەڵام نەماوەتەوە. گوێ لە دەنگە دورەکان دەگرم
لە دورەوە گوێ لە دەنگی من دەگرن
من زیندوم
هاواری من بێ وەڵام نیە، دڵی بەسۆزی تۆ
وەڵامی هاواری منە.

مەلی دەنگ زێڕینی من
لە لق و گەڵای ماڵی تۆدایە
نازەنین! بەرگە جوانەکانت بپۆشە
عەشق، ئێمەی خۆش دەوێ
من لەگەڵ تۆدا، لە بێداریدا، لە دوای خەونەکانم دەگەڕێم
من شیعر لە حەقیقەتی هەنیەی تۆدا دەدۆزمەوە
لەگەڵ منا باس لە ڕووناکی دەکەیت و لە مرۆڤ
کە خزمی هەموو خوداکانە.
لەگەڵ تۆدا من
ئیدی لە سیحری خەونەکانمدا
چیتر تەنیا نیم.

**سەرچاوە**

برگزیده اشعار احمد شاملو

# دووەم شۆك

## زەكیە بلكرامی

لە عەرەبییەوە: هەورامان وریا قانیع

مـن زۆربـاش دەمزانـی خـاوەنی جوانییـەكی بێوێنەم.. سپیكەلەیەكی تێكەڵ بە پەمەیی، لەش و لارێكی ڕێكوپێك كە قەشەنگی و بزێوی لێدەباری، قژێكی ڕەشـی قـەترانی شـۆڕەوەبوو، وەك ئـەوەی هـاوڕێ كچەكانم دەیانوت لەكاتی پێكەنیندا "زۆر جوان"م.

تاقانەی دایك و باوكم بووم، برایەكم هەبوو كەمەكێك لە خۆم گەورەتربوو، هەر هەمویان– باوكم دایكم براكەم– لە خزمەتمدا بون و خۆیان دەكرد بە قوربان و بەساقەم، ئەوان وایان دەبینی ئەركی سەرشانیانە هەموو داواكارییەكانم و گشت خولیاو حـــەزەكانم جێبـــەجێ بكـــەن و ملكـــەچی سەركێشییەكانم بن.. خانویەكی دڵگیرمان هەبوو، تێیدا بە خۆشی و بە ئاسودەیی دەژیاین، خودا هەموو شتێكی پێبەخشیبوین، من دەبوایە كڕنوشم بۆ یەزدان ببردایە و سوپاسم كردایە لەسەر ئەم نیعمەتەی، هەروەها دەبوایە ستایشم كردایە لەسەر ئەو خۆشگوزەرانییەی كە پێیبەخشیبوین، بەڵام هەڵسوكەوتم بە پێچەوانەوە بوو، خۆم زۆر بە لوتبەرز و لەخۆبایی دەزانی، لە لوتكەی هەستكردن بە شكۆداری و لوتبەرزیمدا گوێم بەقسەوباسی هیچ كەسێ نەدەدا، خۆم بە جوانییەكەمەوە هەڵدەكێشا، هەستم دەكرد لە هەموو ژنە قەشەنگەكانی جیهان جوانترم، تەنانەت كاتێ كە لە بەردەم ئاوێنەدا دادەنیشتم و لە سیمای خۆم ڕادەمام، خەیاڵم بۆ ئەوە دەڕۆی كەوا شازادەیەكی قۆزی ڕوخسار گەش لە وڵاتی پەرییەكانەوە دێت و لەگەڵ خۆی دەمباو پێكەوە دەفڕین، هەر ئەم هۆیەش بوو وایكرد هیچ كوڕێكی بنەماڵەكەمان سەرنجم ڕانەكێشێ یان وەك ئەوەی ئێمەی كچان دەیڵێین "هیچیان چاویان پڕنەدەكردم" لەوەش خراپتر ئەوە بوو من گاڵتەم بە هەمووان دەكرد، مامۆژن و خاڵۆژنەكانم هەمویان حەزیان دەكرد لە كوڕێكی خۆیان مارەم بكەن، بەڵام هەموو كاتێ– لەبەردەمی باوك و دایكم–دا گاڵتەم بە كوڕانی خزمانم دەهات، گاڵتەپێكردنێكی ئابڕوبەرانە: جا چییە با "ئەعجاز"ی كوڕی پورم ببێت بە دكتۆریش؟! ئەو باڵای بچوكە.. كورتە باڵایە، چۆن ڕازیدەبم ببێت بە مێردم؟ كوڕی

خاڵۆژنەکەشم "ئەسعەد" ئەندازییارە، بەڵام پێستی ڕەشە.. لاحول ولا قوە الا باللە.. گەر شوم پێکرد ئەوا هەردوکمان پێکەوە وەك ترخێنەی پڕ نیسکمان لێدێت، بەڵام کوڕی مامەکەم "وقار" کە ماستەری بەدەستهێناوە و ئیشێکی باشیشی هەیە، کەسێکی باشە، بەڵام قژی بەسەرەوە نەماوە، ئەو گەرچی شێوەی خراپ نییە، بەڵام "کەچەڵییەکەیم" بەدڵ نییە، ئابەم شێوە هەموو پەیوەستبونێکم بە کوڕە گەنجەکانی خزمەکانمەوە ڕەتکردەوە، دایکم زیاد لە جارێ هەوڵیدا تێمگەیەنێ:

"نائیلە! کچەکەم ئەمە شورەییە کە گاڵتە بە شێوە و ڕوخساری خەڵکانی دەوروبەرت دەکەیت و وایدادەنێیت ئەوان لە تۆ کەمترن، دەبێ تۆبە بکەی و لە خوا بپاڕێیتەوە تا بەهۆی ئەم لوتبەرزییەتەوە لێت تورەنەبێت"

بەڵام قسەکانی دایکم لەم گوێمەوە دەچووە ژورێ و لەوی دیکەیانەوە دەهاتە دەرێ. لە زانکۆ هاوڕێیەتیم لەگەڵ هەموو جۆرە کچێکدا هەبوو، بەڵام هەر هەمویان عەیبێکیان هەبوو، منیش بە هەر ڕێگایەك بوبێت عەیبەکانیانم دەردەخست و دەمدایەوە بەڕویاندا، هەر ئەمەش وایکرد کچەکان لە ناوەوەی خۆیاندا ڕقیان لێمبێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەر بە هاوڕێم دەمانەوە، چونکە زۆربەی زۆریان سود و قازانجیان لێم دەبینی.. بۆ نمونە من لەبەر ئەوەی وانەی تایبەتیم وەردەگرت، بۆیە وەڵامی پرسیارەکانم لابوو، ئەوانیش وەڵامەکانیان لەمنەوە بەدەستدەگەیشت، جگە لەمەش من پارەیەکی زۆرم لە کافێتریای کۆلیژ خەرجدەکرد و بەشی ئەوانیشم دەدا، لەبەرامبەر ئەمەدا ئەوان بەرگەی لوتبەرزیی و خۆهەڵکێشانەکانمیان دەگرت و تەنانەت بەرگەی ئەو سوکایەتی پێکردنەیان دەگرت کە لە بەرامبەریاندا دەمنواند.. ئیدی بەم شێوەیە ڕۆژێك لە ڕۆژان بڕوانامەی بەکالۆریۆسم بەدەستهێنا، ئەو دەمەی ڕامگەیاند کە چیتر لەم قۆناغەی خوێندن زیاتر بەردەوام نابم، باوکم بەم بۆنەیەوە خوانێکی گەورەی سازکرد، چی خزم و کەسوکار هەیە هەمویانی بانگکرد، دوای ئەوە ئیدی داوای شوکردن لە هەمو لایەکەوە بەسەرما دەباری، داوکارییەکان لە خزمان و لە بێگانەوەش بوو، بەڵام من وردو درشتی ئەم مەسەلەیەم ڕەتکردەوە و ڕازیشنەدەبوم گفتوگۆیی لەسەر بکەم.

ڕۆژان تێپەڕین و شونەکردنم دایکمی شپرزە کردبوو، ڕۆژێکیان سەرزەنشتی کردم و منیش بەرپەچم دایەوە و وتم:

"دایە بۆ لەبیرت دەچێ کەوا من کچێکی قەشەنگم و حەقی خۆمە شو بە پیاوێکی قۆز بکەم، مادام لەم دنیایەدا هەموو پیاوێ دەگەڕێ بەشوێن کچێکی جواندا، ئەی بۆ من حەقم نییە هەمان شت بکەم و بگەڕێم بەشوێن یەکێکدا کە سەرسام بم پێی؟ گەر کەسوکاری کوڕەکە ڕازینەبن کچێکی ناشرین لە کوڕەکەیان مارەبکەن و وایدەبینن حەقی خۆیانە کە نەهێڵن ئەو کچە ناشرینە بێنن، ئەدی بۆچی ئەمە بۆ ئەوان نابێت بە نەنگی و بە عەیبە؟ ئەی بۆچی بۆ من نابێت کە شوو بە کەچەڵێك یان بە کورتەباڵایەك یاخود ڕەشێك نەکەم؟ من گەر هیچ عەیبێکم تیانەبێت ئیدی بۆچی شوو بە یەکێك بکەم عەیبی هەبێت، پیاوێکی ڕەش سڵناکاتەوە داوای کچێکی جوان دەکات شووی پێبکات.. بەلایی لێدا.. نەفرەت لەو جۆرە پیاوانە بێت"

چی لە ناخی دڵمدا هەبوو هەڵمڕشت و جامی تورەبونی خۆم بەسەر ئەو جۆرە پیاوانەدا قڵپکردەوە، دایکم بە هیچ شێوەیەك نقەی نەهات و وەڵامی ئەو قسانەمی نەدایەوە کە دام بە گوێیدا، بە بێدەنگ ڕۆشت و بە جێیهێشتم..

ڕۆژێکیان کچێکیان بۆ براکەم هەڵبژارد.. براکەم چەند ساڵێك لەمن گەورەتر بوو، دایك و باوکم حەزیان دەکرد ژنهێنانی ئەو بکەوێتە دوای شوکردنی من، بەڵام دوای ڕازینەبونی من بە شوکردن، ئەوان ناچار بون بە جۆرێکی دی بیربکەنەوە، دایکم "نۆشین"ی بۆمارەکرد، کە کچی یەکێکە لە هاوڕێ کۆنەکانی، من نۆشینم بینی و زۆر سەرسام بووم پێی. ئەم دوو خێزانە لەبەر ئەوەی لە کۆنەوە یەکتریان دەناسی، بۆیە پێویستی نەکرد ئەم ژنهێنانە دوا بکەوێ، ئیدی هەروا بە خێرایی نۆشین بوو بە ژنی براکەم، هات تا پێکەوە لەگەڵماندا بژی، لە ماوەی چەند ڕۆژێکی کەمدا ژنی براکەم ڕاهات لەسەر ئەوەی لەگەڵ منو کەس‌وکاری ماڵەکەماندا خۆی ڕابێنێت، بەڵام من هەستم کرد ئەو بیروڕاکانی منی بەدڵ نییەو هەڵس‌وکەوتی منی لا پەسەند نییە. ڕۆژێکیان بێدودڵی پێی وتم: "نائیلە.. پێویستە بیر لە دواڕۆژت بکەیتەوەو بە خێرایی بڕیاری خۆت بدەیت، بۆئەوەی کات لەدەست نەچێ و شەمەندەفەری شوکردن جێت نەهێڵێ، چونکە ئەو شەمەندەفەرە زۆر چاوەڕوان نابێت، پیاویش بە دیمەنو ڕوخساری نییە بەڵکو بە هەڵس‌وکەوتەکەیەتی، گەر ڕەوشتی باش‌وبەرز بێت ناشیرینی ڕوخساری نابێت بە عەیب، بێگومان تەماشای پلەی خوێندنو بنەچەی بکە، واتە بنەماڵەکەی، من پێت ناڵێم شوو بە پیاوێکی ناپەسەند و بەد فەساڵ بکە.. بەڵام ئەو ڕێگایەی کە تۆ ئەوانەی داوات دەکەن و شوکردنی پێڕەتدەکەیتەوە ڕێگایەکی شیاو نییە" منیش پێم وت:

"براژن من نامەوێت ژیانێك بژیم پێچەوانەی خولیاو ئارەزوەکانم بێت و پێچەوانەی ئەوەبێت کە دەمەوێت، لەپاشان تۆ بۆ خەفەت دەخۆی، تۆ چ سودێك لەوە دەبینیت کە بیر لە حاڵی من بکەیتەوە.. جارێ دایك و باوکم هێشتا لە ژیاندان و سەلامەتن، واز لەم خەم وخەفەت و دڵەڕاوکێیەت بێنە و بۆ ئەوانی جێهێڵە، ئەوان لە تۆ لەپێشترن بۆ هەڵگرتنی"

وەڵامەکەم توڕەی کردو دڵی یەشاند و بێدەنگی لێکرد..

دوای ئەوە دانیشتنم لەماڵەوە وایدەخوازی کە ڕوخسارم بگۆڕم، هەربۆیە دەستمکرد بە ڕستن و دروستکردنی جلوبەرگەکانم لەسەر شێوە جۆراو جۆرەکانی "مۆدێل" و بەوپەڕی حەز و خۆشەویستییەوە لەبەرمدەکردن، هەمو کوڕانی گەنجی بنەماڵەکەمان کە پێشتر خۆیان ئامادەکردبوو بۆ ئەوەی من بهێنن، ژنیان هێنا، براکەشم بوو بە باوکی منداڵێکی بچکۆلە..

سێ ساڵ بەسەر وەرگرتنی بڕوانامەی بەکەلۆریۆسەکەم تێپەڕی، بەڵام من تا ئەو کاتەش هەر لە هەمان دوریانی ژیاندا ڕاوەستابوم.. تا ئەوکاتەش شازادەی خەونەکانم نەهات.. ئابەم شێوەیە وەخت دەڕۆیی و ڕۆژەکانیش تێدەپەڕین، ئەوەی جێی سەرسوڕمانە ئەوەبوو لوتبەرزیم تا دەهات زۆرتر و زۆرتر دەبوو، هەستی خۆبەزلزانینم بەسەر ئەوانی دیکەدا تادەهات زیادیدەکرد.. نەهاتنی زاوایەکی قۆز بۆ داواکردنم بووە هۆی ئەوەی جۆرێك لە توڕەبونم بەڕێگایەکی لاشعوری تیا دروستبێت.. گرنگ نییە تەمەنم چەندە؟ بیست وسێ ساڵ، ئەم مەسەلەیە نائومێدی نەدەکردم؛ من گومانم لەوە نەبوو کە ئەوەی دەمەوێ بەدەستی دەهێنم؛ گەنجێکی قۆز ڕۆژێك لە ڕۆژان دێت بۆلام، ئەو دەمی هەمو جیهان ئەوە دەبینێ و خەڵکیش دەڵێن:

ئەو ژن و مێردە لە مانگ و ڕۆژ دەچن..

ژیان لە لای من جوان و قەشەنگ بوو.. ڕوینەداوە ئازارم چەشتبێت یاخود توشی

هەستکردن بە پەژارەیی و ناسۆری هاتبم، نەمدەزانی خەم و پەژارە مانای چییە یان ئەم ناوە لە چ شتێك دەنرێ، بەلاّم ڕۆژێکیان لەناکاو هەمو شتێکی جوان لە ژیانمدا کۆتایی پێهات.

من و باوکم و دایکم لە سەردانێکی بچوکدا بوین بە ئۆتۆمۆبێل.. سەیارەیەکی بارهەڵگری گەورە خۆی لێدایـن..دایك و باوکم دەمودەست مردن، هەروەها شۆفێرەکەش گیانی لەدەستدا، لەم ڕوداوە دڵتەزێنەدا کەس ڕزگاری نەبوو تەنیا من نەبێت..

کاتێ لە خەستەخانە هاتمە دەرەوە و گەڕامەوە بۆماڵەوە، هەستمکرد قاچی ڕاستم بڕاوە و لە ژێر باڵی ڕاستمدا هەندێ تەقەڵ هەیە کە برینەکانمی پێدوراوەتەوە، ئیدی بەترس و لەرزەوە لە ئاوێنەدا لە خۆم ڕادەمام.. ئای دەموچاوم هیچی لێنەهاتبو.. هێشتا هەر وەکو خۆی جوان بوو، قژە ڕەشە درێژەکەشم هەر وەك خۆی بوو.. بەلاّم من چیتر وەك خۆم نەمابومەوە، بومە کچێکی هەتیوی کەمئەندام.

براو براژنەکەم هەوڵیاندەدا دڵخۆشیم بدەنەوە و نازم ڕاگرن.. بنەماڵەکەمان یەك یەك و دوو دوو دەهاتن بۆ ئەوەی سەرخۆشیم لێبکەن.. مەسەلەکە بەلای ئەوانەی دەوروبەرم کۆتایی پێهات، بەلاّم من دنیا بەڕومدا تاریك داهات.. دایکم کە هەرگیز بیرم لێنەدەکردەوە-بۆ چرکەیەکیش بێت- دوورکەوێتەوە لێم، کەچی ئەوەتا بۆ هەتاهەتایە بەجێیهێشتم.

لەدایکبونی منداڵێکی دیکەی براکەم؛ بووە هۆی زیاتر و زیاتر سەرقاڵبونی براژنەکەم؛ هەموو چەند ڕۆژ جارێك منداڵەکانی دەبرد بۆ ماڵی باوکی و منیش بەتەنیا دەمامەوە، بە دەوروخولی خۆمدا دەسوڕامەوە و کاتم بەسەردەبرد، کە زۆر لەسەرخۆ تێدەپەڕی، براژنەکەم جاران لەسەر ئەوە ڕاهاتبو کە بچێت بۆ ماڵی باوکی، بەلاّم ئەوسا لە کاتێکدا بوو کە دایکم و باوکم لەماڵەوە بوون، هەربۆیە ئەو دەمە هەستم بە تەنیایی نەدەکرد، بەلاّم ئێستا حاڵەتەکە جیاوازە، ئێستا تەنیایی بووەتە قەدەرم.

خۆم هێنابوەوە یەك، کچەکانی هاوڕێم چیتر سەردانیان نەدەکرم، هەمویان شویانکرد.. تەنیا هاوڕێیەکیش چییە نەمما.. لوتبەرزیم و خۆبەزلزانینە درۆزنەکانم بون بە ژێر خۆڵەوە، خەڵك کە تەماشایان دەکردم دەترسان و دەپەشۆکان و هاوسۆزی و قسەی خۆشیان بۆ دەکردم، ئەو قسانەی کە بەر دڵم دەکەوت وەك دڕکێکی خوێناوی وابوو.. پیرە زۆربڵێکانی بنەماڵەکەمان دەیانوت:

"گەر نائیلە شوی بە ئەندامێکی بنەماڵە بکردایە، ئێستا هەموان یارمەتیان دەدا، بەلاّم لەم حاڵەتەی ئێستایدا کێ بە تەنگییەوە دێ؟!"

گەنجانی بنەماڵەکەمان، ئەوانەیان کە پێشتر ڕەتمکردبونەوە هاوسۆزی خۆیان بۆ دەردەبڕیم، ئەوان ژیانی ئاسایی خۆیان دەگوزەران و لەگەڵ خاوخێزانی خۆیاندا بە دڵنەوایی و خۆشبەختی دەژیان، بەلاّم من دڵم خوێنی لێدەچۆڕا.. ڕۆژانی بەختەوەری بۆ کوێ چوون؟ کێ ئەو ساتانەی لێداماڵیم کە پڕبون لە شادی و کامەرانی؟ باوەڕم بەوەکرد کە براژنەکەم پێشتر پێی وتم.. کاتم بەسەرچو، شەمەندەفەرەکەش بەبێ ئەوەی چاوەڕانم بکات بەجێیهێشتم.. بەلاّم "گۆچانەکەم" براژنەکەمی بێزار کردبوو، کاتێ لێرە و لەوێ دەجولاّم. من هەرکاتێ بچومایە بۆلای سەلاجەکە تا ئاو بێنم، یان لە ژورێکەوە بڕۆشتمایە بۆ ژورێکی دیکە بۆ هێنانی هەرشتێ بێت، ئەوا دەنگی گۆچانەکەم کە بەر زەوییەکە دەکەوت، منداڵەکانی دەشڵەژان و لەخەوی هەڵدەساندن.. چەندین جار براژنەکەم پێی وتوم:

"نائیلە! داوای ئاو بکە تا بۆت بێنم.. منداڵەکان بەهۆی ئەم ژاوەژاوەوە خەبەریان دەبێتەوە

و ئیـدی سـەرلەنوێ خەولێخسـتنەوەیان کـارێکی دژوارە"

قسـەکانی تـیرێك بـوون جـەرگمیان دەبـڕی.. ڕاسـتی دەکـرد.. مـن پـەکم کـەوتبوو.. دەنگـی گۆچانەکەشم دەبووە هـۆی بـێزاری ئـەوانی دیکـە.. بـەڵام مـن چیـم لەدەسـتدەهات؟ لـەکوێ بگـرە چـۆن شوێنی قاچە بڕاوەکـەم بشـارمەوە؟ دەمزانـی دەبـێ ئەوەی ماومـە لـە ژیـان لـەم ماڵـەدا بیبەمەسـەر، ئـەم مەسەلەیە لای براژنەکەم هـەم بڕابووەوە و هـەم لێشـی تێگەشتبوو، لەبەر ئەوە بێدەنگ دەبوم و تەنانەت بە حـەرفێکیش چییـە وەڵامـی قسـەکانیم نەدەدایـەوە، ئیدی لەبیرم چوو بگرە وازم لـەو بیرکردنەوەیە هێنا کـە سـەبارەت بـە هـەموو حـەز و ئارەزوەکـانم بـوو، لەگەڵ ئەوەشدا براژنەکەم بەردەوام گلەیی لێدەکردم و، هـەندێ جـاریش کەمتەرخـەمی و هەڵـەکانی ڕابردومـی بیردەخسـتمەوە، ئەمـەش هێنـدەی دیکـە کەللەیی دەکردم و زیاتر توڕەیدەکردم، هـەر ئەمـەش بـوو وایکـرد تـا بێـت زیـاتر و زیـاتر شـپرزە ببـم، لەولاشەوە براکەم خوا منداڵێکی زۆری پێبەخشـی.. منداڵ لە دوای منداڵ، ئەمەش وایکرد براکەم زیاتر سـەرقاڵ بێت و هـەروەها هەڵچونـەکانی زۆرتـر بێـت، براژنەکەشـم دەیزانـی کـەوا براکـەم دەبـێ تـا مـاوم بـەرپرس بێت لێم، ئـەو ئامادەباشییەکی تـەواوی لـە زهنیدا نەبوو بۆ وەرگرتنی ئەم بیرۆکەیە..

ڕۆژێکیـان دوای ئـەوەی براژنەکـەم ڕۆشـت بـۆ ماڵی باوکی، بەهۆی گۆچانەکەمـەوە کـە خـۆم دابـو بەسـەریدا هاتمـە نێـو باخچـەی ماڵەکـەمان.. باخچەکـەمان گـەرچی ڕوبەرەکـەی تـەنگ بوو، لەگـەڵ ئەوەشـدا باخچەیـەکی جوانـە، پـڕە لـە گوڵـی هەمـەجۆری گەشـاوە، بـەڵام چـی ڕویـدا؟ گوڵـەکان لەبـەرچاومدا ڕەنگیـان زەرد هەڵگـەڕابون و بـۆن و بەرامەشـیان ئـەو کاریگەرییـە سـیحریە کۆنـەیان نەمابوو کە پێشتر ڕاهاتبوم لەسەری.. لەسەر یەکێ لە کورسیەکانی باخچەکە دانیشتم و بیرم لەو ڕۆژانە دەکردەوە کە بەسەرچون.. تۆ بڵێی بگەڕێنەوە؟!

لـە دوورەوە "جـەمال"م بینـی- یەکێکـە لـە خزمـەکانمان-دەهـات، جـەمال چـەند ساڵێك لـەمن گەورەترە و هێشتا ژنی نەهێنابوو.. بەڵام لە ئێستادا لە من منداڵتر دیارە..؟ ئێستا تەمەنم نزیکـەی سی سـاڵ دەبێـت، بـەڵام لەبـەر جوانییـە دڵڕفێنەکـەم زەحمـەت بـوو گـەورەیی تەمـەنم بـە ڕوخسـارمەوە دیـاربێت.. جـەمال بەگشـتی لـە لایـەنی شـێوە و ڕوخسـارییەوە مرۆڤێکـی ئاسـایی بـوو، ئـەو بـە خۆرسـك کەسـێکی بـاش و دڵسـۆزە و کوڕێکـی گوێڕایەڵی دایك و باوکی بوو، پێشان ڕۆنی لە قژی دەدا و جلوبەرگی گوڵگوڵی بریقەداری لەبەردەکرد و گوێی نە بە ئوتوکردنی دەدا و نەبە ڕێکخستنیان و لـێرە و لـەوێ دەهـات و دەچـوو. بـەڵام ئێسـتا جلوبـەرگێکی لەبەردایـە کـە ڕێکوپێکـی و کەشخەییەکی بە ڕواڵەتی بەخشیوە، هەروەها پێڵاوە بریقەدارەکـەی لـە پێدایـە، کـە هـەموو کاتـێ بـە "پۆلیـش" پـاکیدەکردەوە و دەبریسـکایەوە، جـاران بەشێوەیەکی گشتی هیچ قسە و باسێك لە نێوانمادا ڕوینـەدابوو، بەڵام دوای ماوەیـەکی درێـژ و، ئـا لـەم کاتەدا کە وام لێهاتوە و براژنەکـەشمی لێنییـە، بۆیـە بەناچاری پێشوازیم لێکرد..

جەمال لەسەر ئەو کورسییەی کە بەرامبەرم بوو دانیشت و وەك هەموو جارێ هەواڵی دایك و باوکیم لێپرسـی، دوای ماوەیـەك لـە قسـەکردن کـە زۆری نەخایاند، سەیردەکەم دەڵێ:

-نائیلە! دەمەوێ هەندێ قسەت لەگەڵدا بکەم..

+ باشـە! هیـچ شـتێك هەیـە، فـەرموو بیڵـێ؛ "ئەمـەم زۆر بەسـەنگینی و بـە لوتبەرزییـەوە پێوت"

—نـــا.. شـــتێکی دیـــاریکراو نییـــە، بـــەڵام پێشنیارێکم هەیە..

+ من هیچ تێناگـەم و هەقیقـەتی ئەوەشـی کـە وتت نازانم چییە.

— لەڕاستیدا من ئازار دەچێژم کە ئاوا بەتـەنیا دەتبینم و، زۆربەی کات لەپێناو تۆدا دڵەڕاوکەمە.

+ جـەمالی بـرام.. ئەمــە قەدەرێکــە نوســـراوە لەسەرمان.

—نائیلـە! حەزدەکـەم.. مەخسـەدم.. مەبەسـتم ئەوەیە داخوازیت بکەم و.. هیچ ناڕەزایەتییەکیشـم نییە لەسەر ئەو..

کە قسەکانی جەمالم گوێ لێبو، ئاگر بـەربووە لاشەم و بەدەمارەکانما هەڵگەڕا، ئەم زەلامـە جـاران تەنانـەت حـەزم نـەدەکرد یـەك وشـە چییـە لەگـەڵیدا بدوێـم.. کـەچی ئـەمڕۆ دێـت و.. بـەزەیی پێمـدا دێتـــەوە.. داوای خوازبێنیـــم دەکـــات، پێـــم وت و توڕەبونی خۆم لەناوەوەمدا شاردەوە:

+ ئاگات لەخۆته دەڵێی چی؟

—بـەڵێ، "تـابێت هـەڵدەچوو، درێـــژەی دایـــە و وتی:"

—هـــەموو کاتـــێ بـــیرم لـــە تـــۆ کردۆتـــەوە.. خۆشمویستویت، بەڵام هەرگیز نەموێراوە ئـەوەت بـۆ دەرخەم، خۆم وادادەنا کە شایەنی تۆ نیم، هـەروەها لە دوای ئەم ڕوداوەشەوە غیرەتی ئەوەم نەبوو قسەت لەگـەڵ بکـەم، چونکـە ئیشـــەکەم ئیشـێکی ســادە و هاکـەزایی بـوو، بـەڵام ئێسـتا بەرزکراومەتـەوە بـۆ پلەیەکی باشتر و بارودۆخی مادیم باشتر بووە، تۆش ئێستا تەنیایت، لەبەر ئەوە ئەمڕۆ هاتم و ئەو هیـوا و ئاواتانــەم هــەڵگرتوە کــە ســاڵانێکە لــە قوڵایــی نـاخمدا جێگـیربون، گـەر ڕازیبویـت و پێـت باشـە ئەوا لـەبارەی ئـەم مەسـەلەیەوە قسـە لەگـەڵ دایکـم دەکەم.

ئـای لـەو ڕۆژگـارەی تێیکـەوتوم.. مرۆڤێکـی بەســەزمانی مرومــوچ بــەزەیی پێمــدا دێتـــەوە و، هاتووەتـە داخوازیـم..نـەمدەزانی چـۆن توانیـم دان بـەخۆمدا بگـرم و جڵـەوی خـۆم لەدەسـت نـەدەم، لەسەرخۆ پێم وت:

+ بـرام جـەمال! نامـەوێ گوێـم لـەم قسـە پڕوپوچانە بێت؛ من سەرم سوڕدەمێنێ بگرە توشی حەپەسان بووم کە تۆ ئەم بوێرییەت لە کوێوە هێناوە تا ئەوە بڵێیت.. بۆ من باشـترە بڕۆیـت پێشـئەوەی براژنەکـەم بێتـــەوە، گـەرنا ئـەوەی لـە ناخمدایـە هەڵدەچێ و، ئیدی ناتوانم دان بەخۆمدا بگرم.

خۆم نەگرت و دەستم دایە گۆچانەکەم و بەرەو ژورەوە بەڕێکـــەوتم، توڕەبـــونم جـــەمالی خســـتە حاڵەتێکەوە دڵت پێیدەسوتا، جەمال کە سەیریکرد چیتر جوان نییە بە دانیشتویی بمێنێتـەوە، هەربۆیە هەڵساو چۆن هات هەرواش گەڕایەوە.

ئەو شـەوە فرمێسـکێکی زۆرم هەڵڕشـت، ئەمـە ئەو قەدەرەبوو کە بۆم نوسرابوو، دیاربوو بەشێك لە سزای لوتبەرزیم دەدایەوە، ژاراوێکی تاڵم دەنۆشـی، هـەرگیز بیرم لـە ڕووەکـەی تـری ژیـان نەکردۆتـەوە، بـەڵام ئـەم هـەموو شـتە چییـە ڕوبـەڕوم دەبێـتەوە، لەسـەر ئـەم زەوییـە پـان و بەرینـەدا هـەزاران مـرۆڤ هەیە بەشێوەیەك لە شێوەکان هەڵەدەکەن، کـەچی تا ئێسـتاش پـەتی بەختـەوەریان درێـژە، بـەڵام پـەتی بەختـەوەری مـن پچـڕا؛ ئیـدی لـە حـەوت تەبەقـەی ئاسمانەوە کەوتمە خوارەوە بۆ نێو قوڵایی زەوی.

مـن لـە کتێبـا خوێندومەتـەوە: "خـوا بەتـەنگ بـەندە باشـەکانییەوە دەچێـت و، دوای دەردوبـەڵا بەخشندەیی و ڕەحمەتی خۆی دەبەخشێ پێیان؛ تـۆ بڵێی من یـەکێك بم لـە بـەندە ساڵحەکانی؟! ئایـا مـن ئێستا لە قۆناغی تاقیکردنەوەی دەردوبەڵادام؟! ئـەی کـەی ڕەحمـــەتی پـــەروەردگار دەمگرێتـــەوە؟! ئـــەم

پرسیارانە لە مێشکمدا دەهاتن و دەچون، ئەمانە پرسیارگەلێك بون وەلامێکی گونجاویان لام نەبوو"

ڕۆژانێك ڕۆشت هەستم کرد لە نێوان براکەم و براژنەکەمدا قسەو باسێکی جدیی لەئارادایە کە بە دڵنیاییەوە لەبارەی منەوە بوو، چونکە هەر کە لێیان نزیك دەبومەوە ئەوان زنجیرەی قسەکردنەکەیان دەپچڕاند، حەزم نەدەکرد بزانم سەبارەت بە چ بابەتێ قسەیان دەکرد، من دەمزانی چیتر شازادەی خەونەکانم بۆ ئەبەد نایەت و، هەرگیز ئامادەش نەبوم- ئامادەبونێکی زهنی- کە بە کەسێکی وەك جەمال ڕازیبم.

هەربۆیە لە ناوەوەی خۆمدا بڕیارێکم دا کە هەرگیز پەشیمان بونەوەی بۆ نەبێت، بڕیاری ئەوەی بە تەنیا ژیان ببەمە سەر؛ هیچ پێویست بەوەناکات شووبکەم، کچانێکی زۆر هەن ئاوا بێ شوکردن ژیان دەگوزەرێنن؛ با منیش یەکێك بم لەوان.. بەڵام هەموو بیرکردنەوە و تێڕوانین و بڕیارەکانم پوکانەوە دوای ئەوەی براکەم داینیشاندم و ژنەکەشی لە نزیکیەوە ڕاوەستابوو، لەپاشان وتی:

"نائیلە لە پێناو دوارۆژێکی باشدا شتێکمان بۆ ڕێکخستویت، خوا لەم مەسەلەیەدا پشتوپەنا و یارمەتیدەرمان بوو- نەعیم- مرۆڤێکی باشە، ئایا ڕازی دەبیت بەوەی کە شووی پێبکەیت؟"

بێدەنگی دەورەی دام، قسەی براژنەکەم بێدەنگییەکەمی ڕەواندەوە کاتێ وتی:

"نەعیمی کوڕی مامم مرۆڤێکی نیەتپاك و بەڕێزە، ئەمە جگە لەوەی ئەو جارێك تۆی بینیوە"

چاوم بەرزکردەوە و تەماشایەکی براژنەکەمم کرد، لە تەماشاکردنەکەمدا کۆمەڵێ تەسائولاتی بێدەنگ شەپۆلی دەدا.. براژنەکەم هەستا و نزیکبوەوە و لە تەنیشتم دانیشت، لەپاشان دەستی هێنا بە پشتمدا و وتی:

"خەم مەخۆ نەعیم بە کارەساتەکەتی زانیووە، تۆ هێشتا سیماو ڕوخسارت جوانە.. ڕازیبە لەسەر ئەوەی بیبینی"

"بەڵام براژن.. دەبێ هۆیەك هەبێ وایلێکردوە ڕازیبێت کچێکی کەم ئەندامی وەك من بێنێ"

دەربڕینی وشەی کچ وایلێکردم تەتەڵە بکەم، ئیدی بێدەنگ بووم و پەرەگرافەکەم بۆ تەواو نەکرا، هەر بۆیە براژنەکەم پێشی لێگرتمەوە و وتی:

"خۆت سەغڵەت مەکە و بیر لە هیچ مەکەرەوە تەنیا ئەوە نەبێت کە بیبینی"

"نەخێر.. سەرەتا دەمەوێ بنج و بناوانی ئەم چیرۆکە بزانم.. چیتان پێوتوە؟"

براکەم و ژنەکەی دەستیان کرد بە تەماشاکردنی یەکتر، وەك ئەوەی بیانەوێ شتێکم لێبشارنەوە، شتێك کە نەیانەوێ ئاشکرای بکەن.. وتم:

"براژن.. دەبێ مەسەلەکە بە تەواوەتی ڕون وئاشکرا بێت، من هێندە لاوازنیم، لەپاشان شوکردن مەسەلەیەکی ئەوەندە پێویست نییە"

"نائیلە شوکردن کارێکی زۆر پێویستە.. تۆ ئاگادرای حاڵی براکەت نیت، لەبەر تۆ چەند شپرزەیە!؟"

"لەبەر ئەمە دەگەڕێن تا نمونەی وەك نەعیمم بۆ بدۆزنەوە.. بەڵام بە چ مەرجێ؟ گەر ڕاستیم پێنەڵێن ئەوا چیتر گوێتان لێناگرم" ئەمەم وت و گۆچانەکەمم هەڵگرت و دەستم کرد بە جێهێشتنی شوێنەکە، بەڵام براکەم ڕایگرتم و وتی:

"نائیلە دانیشە.. پێت دەڵێم.. ئەوەی پێت دەڵێم سەد دەر سەد ڕاستە.. نەعیم مرۆڤێکی نیەت پاکە و کۆگایەکی بازرگانی هەیە، دایکی و دوو خوشکی لەگەڵی دەژین، ئەو بەرپرسە لە بەخێوکردنیان، کۆگاکەی دزراوە و ئێستا توشی

بێپارەییەکی کوشندە هاتوە و جاریٚ ژنیشی نەهێناوە، دایکی بە شوێن کچێکدا دەگەڕا بۆی بێنیٚ، لەپاشان ئەوە ڕویدا کە گۆگاکەی تالآنکرا، بۆیە ڕاوەستان لەوەی بیر لە ژن هێنانی بکەنەوە، بەلآم گەر یارمەتییەکی مادی بدریٚ و حالّەتی بازرگانییەکەی و پارە و پولەکەی بەرەو باشی بڕوات، ئەوا هیچ ڕێگریێك نییە بۆ ئەوەی سەرلەنویٚ بیر لە مەسەلەی ژن هێنانی بکرێتەوە.. نائیلە ئەم مەسەلەیە نەشەرمی تێدایە و نە تەنگپێهەلّچنین، بە پارە یارمەتی دەدەین و ئیتر حالّەتی بازرگانیەکەی باشتر دەبێت، تۆش دەڕۆی لە مالّی پیاوێکی شەریفدا ژیان دەبەیتە سەر"

"مەسەلەکە ئاوایە.. منتان کردووەتە کالآیەك و لە بۆرسەیەکدا داتاننـاوم" لەناوەوەمدا شتەکان تێکشکان؛ هەولّمدا ئەوەی لە ناخمدا هەستی پێدەکەم بیشارمەوە و کپی بکەم، بۆیە وتم:

"بڕی ئەو پارەیە چەندە کە ڕێکەوتون لەسەری؟"

"دووسەد هەزاری دەدەینیٚ"

براژنەکەم بە خێرای وتی:

"ئەمە ئەو بڕە پارەیەیە کە لە حسابی باوکی خوالێخۆشبو بەجێماوە"

"براژن گوێگرە.. من ڕازینیم لەسەر ئەم شوکردنە"

"بەلآم بۆچی؟"

"ئێوە بە دووسەد هەزار دەمفرۆشن.. ئەمە نرخی خۆشەویستییەکەی ئێوەیە بۆ من؟ من کالآیەك نیم بە پارە بفرۆشرێم و، ڕێگەش نادەم ئاوابم، شوکردنم نابیٚ بەرامبەر هیچ بڕە پارەیەك بێت"

"نائیلە! مەسەلەکە ئاوا بەم حەساسییەتە گەورەیە وەرمەگرە" براکەم وای وت و هەولّیدا تێمگەیەنیٚ:

"نەعیم پیاوێکی نیەتپاکە و تەنیا خۆشگوزەرانی تۆی دەویٚ"

"براکەم تۆ تائەم ئاستە ڕقت لێم نییە؛ وامليٚمەکە تەنیا مردن لە بەردەمی خۆمدا ببینم"

چاوەکانم پڕبون لە فرمێسك، هەربۆیە هیچ دەرفەتێکم لە پێشدا نەما تەنیا بێدەنگ بوون نەبێت.. پاش ماوەیەك زانیم نەعیم بێوەژنێکی دەولّەمەندی هێناوە و، ئەوان ژیانێکی هێمن و بێگرفت دەگوزەرێنن، ئەم جۆرە هەوالآنە هیچ کاریگەرییەکی ئەوتۆیان لەسەر دەرونم جێنەدەهێشت شایانی باسکردن بێت، بەتایبەتی ئەو کاتانەی براژنەکەم بە ئەنقەست چیرۆکی ئەوانی لەبەردەمی مندا دەگێڕایەوە.

لەو ڕۆژگارەدا براکەم بۆ ماوەی سالّێك سەفەریکرد بۆ ئەلّمانیا، ژنەکەشی زۆربەی کاتی لە مالّی باوکی بەسەر دەبرد، لە مالّەکەی ئێمەدا و لە کونجێکی تایبەت بە دەستوپێوەندەکان، خێزانیك هات و نیشتەجیٚ بوو تێیدا، بەم هاتنە براژنەکەم دلّنیابوو لەوەی چیتر بەتەنیا نامێنمەوە.. بەلآم تەنیایی قەدەری نوسراوم بوو، هیچم نەبوو تەنیا یادگاری ڕۆژە بەسەرچوەکان نەبێت کە ناو ناوە دەمهێنان و دەمبردن.. من چی بووم؟ چۆن ئاوام لێهات؟ تاریکی دەوروبەری تەنیی بووم؟ لەنێو تاریکیەکی ئەنگوستەچاودا بەشوێن تیشکی ڕوناکیدا دەگەڕام.. کەچی نەم دەدۆزییەوە.. بەلآم.. لەناکاو.. هەستم کرد تیشکی ڕوناکی کۆدەبوەوە و هەوری تاریکی دەڕەوییەوە! لەو ڕۆژەدا وەك پیشەی هەموو جارێکی براژنەکەم مندالّەکانی برد بۆ مالّی باوکی.. منیش وەك پیشەی هەموو جارەم "گۆچانەکەم" هەلّگرت و ڕومکردە باخچەی مالّەکەمان، دەستم کرد بە پشکنینی ئەو گولآنەی کە بۆ من ژیان و شوێنی گرنگی پێدانم بوون.. کاتیٚ

سەرم بەرەو خانوەکەی بەرامبەرمان بەرزکردەوە.. پەنجەرەیەك لە قاتی سەرەوەی کرایەوە.. لە پشت پەنجەرەکەوە پیاوێك ڕاوەستابوو کە نامۆبوو بە گەڕەکەکەمان، ئەو پیاوە واهاتە بەرچاوم وەك ئەوەی لە ئاسماندا خەریکی فڕین بێت و هەورەکانیشم وابینی وەك ئەوەی ناوناوە ڕوخساری دادەپۆشن و جارجارەش ئاشکرای دەکەن.. من دەمزانی خەڵکانێك پێش چەند ڕۆژێك ئەو خانوەیان بەکرێ گرتووە، بەڵام هیچ شتێکم لە بارەیانەوە نەدەزانی..

بەڵێ ئەمە ئەو ڕوخساریە کە بەردەوام لە خەیاڵمدا دەهات و دەچوو و هەمیشەش خەونم پێوەدەبینی، ئەمە ڕوخساری ئەو شازادەیە بوو کە لە وڵاتی پەرییەکانەوە دێت، ئەو شازادەیەی بەردەوام خەونم دەبینی لەنێو ئاسمانی پان و بەریندا لەگەڵی دەفڕم.. توشی واقوڕمان و سەرسامی بووم. تۆ بڵێی لەم جیهانەدا خەیاڵ بگاتە ئەم پلەیە و ئەوەی لە خەیاڵمدا بوو ئاوا لەبەردەممدا و لەنێو پەنجەرەیەکدا ببینم؟!

بەڵام مەسەلەکان بە تێپەڕینی ڕۆژگارەکان گۆڕانیان بەسەردا دێت، من چیتر وەك ئەوەی پێشتر نەبووم.. لەوانەیە ئەویش لەمەدا نیازی خۆی دۆزیبێتەوە.. ئیدی لە دەریای واقوڕماندا نوقم بوم و درێژەم دا بە تەماشاکردنی، تا ئەو کاتەی ئەویش تەماشای کردم، کاتێ سەیریکردم من هەستابومەوە سەرپێ و خۆم دابوو بەسەر گۆچانەکەمدا و قژە درێژەکەشم بەناو شانمدا شۆڕبوبووەوە تاسەر سمتم، ڕوخسارە خەمبارەکەی نیشانەی شپرزەیی و واقوڕمانی پێوەدیاربوو، لەپاشان و لەناکاو بزەیەکی سەرنجڕاکێش لەسەر لێوەکانی دەرکەوت.. لە پەنجەرەکە چووە دواوە؛ منیش گەڕامەوە بۆ ژورەوە، هەوڵمدا شڵەژانی دڵم ڕاگرم کە ترپەترپەکەی زیادی کردبوو.

بۆماوەیەك بیرم لەم مەسەلە سەیروسەمەرەیە کردەوە، بەڵام بیروهۆشم شڵەژابوو.. چەند حەزمدەکرد شتێکی لەبارەوە بزانم. بۆ ڕۆژی دوایی جار لەدوای جار و بۆ ماوەی درێژ درێژ تەماشای پەنجەرەکەم دەکرد، بەڵام کەسم بەدینەدەکرد، ئەو دەمی گێلیەتی خۆم بۆدەرکەوت.. ئاخر لە ڕۆژدا چۆن دەردەکەوێت؟ بەڵام من وەك شێتێك بەرامبەر پەنجەرەکە هەڵکورمابووم، کاتێ ئێوارە داهات لە پشت پەنجەرەکەوە بینیمەوە.. چاوەکانی تەماشای هەوری ئاسمانیان نەدەکرد، بەڵکو تەماشای منیان دەکرد.. بەردەوام بوو لەسەر تەماشاکردنم.. لە تەماشاکردنەکەیدا تامەزرۆیی و شەیدایی دەبینرا.. واهاتە بەرچاوم لە خەڵکانی دیکە ناچێت.. ڕوخساری بەرائەتی پەرییەکانی پێوە دیاربوو، ترپەی لێدانی دڵم خێراتر بوو، هەر بۆیە نەمتوانی بۆ ماوەیەکی درێژ لە باخچەکەدا ڕاوەستم، دەستم گرت بە گۆچانەکەمەوە و هاتمە ژورەوە.

ئەم یاری "سەرەتاتکێیە" بە بێدەنگ لە بەینماندا دەستیپێکرد، هیچ شتێکم لەبارەیەوە نەدەزانی، لەو بڕوایەشدا بوم ئەویش هیچی لەبارەی منەوە نەدەزانی، لەگەڵ ئەمەشدا وام هەستدەکرد ساڵانێك لەمەوبەر ناسیومە.. لە نێو دڵمدا نیشتەجێ بوبوو، هەر ئەویش بوو کە لە خەونەکانمدا دەستنیشانم کردبوو، ئیدی دەستمکرد بە گرنگی دان بە جلوبەرگ و ڕواڵەتم، بەتایبەتی کاتێ ئێواران ئەو پۆشاکانەی کە لە "دۆڵابی" جلەکاندا بۆ ماوەیەکی درێژ هەڵمگرتبون، دەرمهێنان و دەمویست جەستەمی پێبڕازێنمەوە.. من هەستم دەکرد ئەو هەموو ئێوارەیەك چاوەڕوانم دەکات و، کاتێ دەچمە نێو باخچەکە.. گوڵەکانی خۆشبەختی لە ڕوخسارە خەمبارەکەیدا دەگەشانەوە.. بەڵام ئەم خەمە چییە کە هەموو کاتێ لەسەر ڕوخساریەتی؟

ئەم ئازارە چییە لەسەر ڕوخساری ئەم پیاوە قوّزە دەردەکەوێ؟ هەقیقەتی ئەمەم نەدەزانی، بەلاّم لەو ڕۆژگارەدا بەختەوەری ڕێگای خۆی دۆزییەوە تا بگاتە لام، ژیان لەبەرچاومدا جوان بوبوو، ئاسودەیی گەڕابووەوە بۆ ڕۆحم..

کاتێ براژنەکەم لەماڵی باوکی گەڕایەوە چیتر ئێواران نەدەچومە دەرەوە بۆ نێو باخچەکە، ئەمەشم لە ڕوانگەی ئاگاداربون و وریایەوە دەکرد. چەند ڕۆژێ تێپەڕین ئەوم نەبینی، نەمدەزانی داخۆ زۆر بەگەرمی چاوەڕوانی بینینم دەکات یان نا، بەلاّم من خۆم شلّەژابووم و هێجگار تامەزرۆی بینینی بووم.

چیتر لەگەڵ براژنەکەمدا قسەم نەدەکرد، زۆر بەدەگمەن نەبێت، بەتایبەتی دوای ئەوەی ڕازینەبوم شوو بە نەعیمی خزمی بکەم، ئەمە کاریگەری هەبوو لەسەری و برینێکی کردبووە دەرونییەوە کە پێدەچێ بە درێژایی تەمەنی بمێنێتەوە، هەرچۆنێك بێت لەو ڕۆژەدا کیژێکی شۆخ وشەنگ کە لە ماڵەکەی بەرامبەرمانەوە بەنیازی ئەوەی بماننناسێ هاتبوو، لە دەرگای دا، بۆیە براژنەکەشم لەگەڵماندا دانیشت، کچەکە ناوی "ڕوبی" بوو، ئەو کچێکی زۆر جوان بوو، تەمەنی بەزۆری بیست ساڵێك دەبوو، ڕوخساری ئەو ڕۆژانەی ڕابردومی بیردەخستمەوە کە لە تەمەنی ئەودا بووم، پێی وتین هەر ئێستا لە تاقیکردنەوەی بەکەلۆریۆس تەواو بووە و پشوی دەستی پێکردوە، هەر بۆیە بیریکردۆتەوە سەردانمان بکات تا بمانناسێت.. هەموو شتێکم سەبارەت بە دراوسێکەمان لە ڕۆبییەوە زانی، ئەو لەگەڵ "نەدیم"ی برا گەورەیدا دەژی، ژنی براکەی لەکاتی لەدایکبونی منداڵی دووەمیدا گیان لەدەست دەدات، ئەم ڕوداوە کاردانەوەیەکی خراپی لەسەر ڕوبی و نەدیم هەبووە، ئێستا تەمەنی "بلال" سێ ساڵە و کوڕەکەشی ساڵی یەکەمی تەواو کردووە.. هەروەها لە ڕوبییەوە زانیم کەوا نەدیمی برای هەرگیز نەیتوانیوە لەم خەم و خەفەتەی بێتەدەرەوە.. کە حاڵی ئەو خەڵکانەم بیست پەژارە دایگرتم؛ نهێنی ئەو خەم و ناسۆرییە ئاشکرایەی ڕوخساری نەدیمم بۆ دەرکەوت.. دوای ئەوەی براژنەکەم هەستا بە جێبەجێکردنی ئەرکی میوانداری بۆ ڕوبی، بۆ ماوەیەك پێکەوە دەستیان کرد بە قسەکردن، لە پاشان براژنەکەم جێیهێشتین و ڕۆشت، تەماشادەکەم ڕوبی دەڵێ:

"ئەی خوشك تۆ زۆرجوانیت، من لە پەنجەرەکەوە دەمبینیت، زۆر سەرسام بووم پێت، هەروەها براکەشم زۆر ستایشت دەکا.. ببورە لەوانەیە ئەویش لە پەنجەرەکەوە تۆی بینیبێ" کە قسەکانی ڕوبیم گوێلێبو، دڵە خورپە گرتمی و لێدانی دڵم خێراتر بوو، ڕوبی دەستیکرد بە گێڕانەوەی ئەوەی براکەی چەند سەرسامە پێم، جگە لەمە هیچی تری نەوت، پەیمانیشی دا دووبارە سەردانمان بکاتەوە.

بۆ جاری دووەم ڕوبی هاتەوە، ئەمجارەیان بلال و منداڵەکەی لەگەڵ بوو، هەردوکیان ماشەڵڵا چەند جوان بوون، منداڵەکەم هەڵگرت و نام بەسنگمەوە، ئەویش بەسۆزەوە باوەشی پیاکردم، بلال گەرچی تەمەنی سێ ساڵان بوو، بەلاّم قسەی کەم دەکرد؛ مردنی پێشوەختی دایکی وایلێکردبوو لەو منداڵانە بێت کە قسە زۆر ناکەن.. ئەو ڕۆژە ڕوبی دەستیکرد بە هێنانی بروبیانو تا ستایشی براکەی بکات: جوانیەکەی، زیرەکییەکەی.. قسەکردنی لەسەر ژیانی ئاسودە، لەپاشان وتی:

"خۆزگە یەکێك دەبێت دەستی بگرێ و خەم و خەفەتەکەی بگۆڕێ بە شادی"

پاش ڕۆشتنی ڕوبی، چەندین کاتژمێر بیرم لە نەدیم و بلال و منداڵەکە دەکردەوە.. ڕوبی تادەهات

سەردانەکانی زیاتر دەکردو، هەموو کاتێکیش بلال و منداڵەکەی لەگەڵ خۆی دەهێنا، هەندێ جار براژنەکەم لەگەڵمان دادەنیشت، لەپاشان هەڵدەستا دەڕۆشت و بەجێیدەهێشتین، ڕوبی بێئەوەی ئاگای لێبێ هەستا بە نزیک خستنەوەی من و نەدیم لە یەکتر، قسەیەکی زۆری لە بارەی نەدیمەوە بۆ دەکردم، بەڵام نەمدەزانی سەبارەت بەمن چی بۆ نەدیم دەگێڕێتەوە، ئەوە نەبێ پێی دەوتم ئەو باسی من بۆ براکەی دەکا.

ڕۆژێ لە ڕۆژان "ئەلبوم"ی وێنە تایبەتییەکانی خۆیانی هەڵگرتبوو، وەك پیشەی هەموو جارەی هات بۆ سەردانمان، براژنەکەم لەماڵەوە نەبوو، ئەو دەمی هەموو وێنەکانم بینی: وێنەی دایك و باوکی و وێنەیەکی زۆری ژنەکەی- خوای لێخۆش بێت- ژنەکەی ئافرەتێکی جوان بوو، بەڵام هێندەی من جوان نەبوو، وێنەیەکی زۆری نەدیمیشم بینی.. کەسێتییەکی سەرنج ڕاکێش.. ڕوخسار گەش.. چاوەکانی زیرەکیان لێدەباری.. نەدیم ئەو نمونەیە بوو کە لە خەونەکانمدا ئاواتم پێدەخواست، سیمای ئەو سیمایە بوو کە بەردەوام خەونم بە خاوەنەکەیەوە دەبینی.. خودا ئەوەی پێبەخشیم کە خەونم پێوەدەبینی.. مەرامی ڕوبی چاك تێگەشتم و ئامانجی قسەکانیشیم زانی کە لە گەڵمی دەکرد، دەیویست شوو بە براکەی بکەم و، خۆشەویستی و سۆزی خۆم بدەمە دوو منداڵەکەی، چونکە وادەی شووکردنی ڕوبیش دیاریکرابوو، دوای ڕۆشتنی چیتر کەس لەماڵەوە نابێت بلال و منداڵە بچوکەکە بەخێو بکات.. ئەم سەفقەیەم پەسەند کرد کە بە بێدەنگ و بێ ئاشکراکردن جێبەجێ کرا.. ڕازیبووم و لە دڵیشەوە زۆرم پێخۆش بوو، نەدیم هیچ گلەییەکی لەسەر ئەم گۆڕانەم نەبووە، منیش بۆچی سەرپەرشتی بەخێوکردنی منداڵەکانی نەگرمە ئەستۆی خۆم، نەدیم دەوڵەمەندە و پلەو پایەیەکیشی لەنێو گۆمەڵگادا هەیە، کارگەیەکی هەبوو خۆی دەیبرد بەڕێوە، سەبارەت بە کاروباری ژیان و پێداویستیەکانی هیچ ناتەواوییەکی نەبوو.. هەستمکرد ئەمەش لە بەخت باشی خۆمە، کەوا خۆشەویستی و سەروەت و سامان و جوانی دێنە ماڵەکەمەوە..

بەڵام من جێبەجێکردنی عەمەلیم دەویست بۆ هەموو ئەم بیروڕایانە، چونکە نەمدەتوانی ئەوەی لە ناوەوەمدایە ئاشکرایی بکەم.. کاتێ ڕوبی دڵنیابوو لەوەی من شوو بە براکەی دەکەم، لەگەڵ براژنەکەم قسەی کرد و وێنەیەکی نەدیمی بۆ هێنا. من نەمزانی ئەوان لە بەینی خۆیاندا چییان وتووە، بەڵام دوای ڕۆشتنی ڕوبی براژنەکەم هاتە لام و وتی:

"نائیلە! ئەمڕۆ ڕوبی وەڵامی براکەی بۆ هێناوین، ئەوان دەیانەوێ دەمودەست کارەکە تەواوبکرێت، بەڵام من وایبۆدەچم لە ئێستادا جارێ گونجاو نییە ؛ چونکە براکەت لێرە نییە و هەر ئەویش دەتوانێ بڕیاربدات"

"براژن من چیتر منداڵ نیم" ئاوا یەکسەر وەڵامم دایەوە و بگرە بەردەوام بووم لەسەر قسەکردن:

"من بۆخۆم دەتوانم بڕیارێك بدەم کە پەیوەندی بە خۆمەوە هەبێ"

براژنەکەم گوێی لە قسەکانم بوو، بە قەشمەری پێکردنەوە تەماشایی کردم و وتی:

"نائیلە! تۆ هەموو کاتێ واتزانیوە من دوژمنی تۆم، کەچی من- خوا شایەدە لەسەر ئەوەی دەیڵێم- بەتەنگ خۆشبەختی تۆوە بووم، شوکردنت بە نەعیم ئاسودەیی خۆتی تێدابوو، بەڵام نەتکرد، ئەو ئێستا لەگەڵ ژنەکەیدا ژیانێکی نمونەیی دەباتەسەر، هیچ نەبێت نەدیم پێشتر نە ژنی هەبووە و نە منداڵیش"

خوێن بەری چاوی گرتم:

"بێگومان ژنی نەهێناوە، بەڵام دەموچاوی زۆر دزێو بوو، تۆ ئەوەش دەزانی من لەم دنیایەدا هەرشتێ جوان بێت پەسەندی دەکەم"

"نائیلە ئەو دەموچاوی دزێو نەبوو" ئەم قسەیەی بە تورەبونێکی زۆرەوە دەربڕی..

"چی دەڵێی بیلێ.. بەدرەوشت و چاوچنۆکیش بوو.. دەیویست کەم ئەندامیم بەرامبەر دووسەد هەزار روپیە بکڕێ"

"نائیلە ئە ئاوا بیرت دەکردەوە.. هەرچۆنێك بێت من بە ئەرکی خۆم هەڵدەسم و.. هیچ شتێکیش دژی ئارەزوی براکەت ناڵێم.."

"براژن خوا روسورت کات.. ئەمە نەکەی.. شوکردنم بە نەدیم رەتنەکەیتەوە.. ئەو گەرچی منداڵی هەیە بەڵام روخسارێکی جوانی سەرنج راکێشی هەیە.. وێنەکەیت بینی- ئیدی پێم نەوت من چەند رۆژێکە دەیبینم-"

"کەواتە ئەمە مانای وایە تۆ بریاری خۆتت داوە"

"بەڵێ، مەسەلەکە واتێبگە"

"دەکەوایە خۆت برۆ کاروباری شوکردنەکەت تەوابکە، من دەست ناخەمە ناو ئەم مەسەلەیەوە"

ئەمەی وت و، هەستا لە تەنیشتم، منیش ماوەیەکی درێژ گریام، براژنەکەم کە چاوە سوربووەکانمی بینی وتی:

"هەوڵدە مەسەلەکە تێبگەی، ئەو باس لە شوکردنی خێرا دەکات، دەیەوێ شوکردنەکە لە میانەی هەفتەیەکدا تەواوببێت.. بێدەنگ و بێئاهەنگ گێران، ئیدی من چۆن بەرپرسیاری ئەمە دەگرمە ئەستۆی خۆم، لە کاتێکدا براکەت لێرە نییە؟"

"براژن ئەم بەرپرسیارییە هەرگیز مەگرە ئەستۆی خۆت.. من ئامادەم ئەم بەرپرسیارییە بگرمە ئەستۆی خۆم.. بەرپرسیاری هەر رووداوێکی خراپ گەر روبدات دەگرمە ئەستۆی خۆم.. تەنیا هیواخوازم بەزەیت پێمدابێتەوە و بە بەخشندەیی خۆت رازیبیت.. تەنیا یەك وشە.. باشە"

لەوانەیە براژنەکەم لە ئەنجامی جەختکردنی من پەشیمان بوبێتەوە، هەربۆیە بە روبی راگەیاند کەرازییە و رۆژی پێنج شەممەی داهاتو دەستنیشان کرا بۆ مارەبڕینەکە..

مەسەلەکە بۆ من سەیر دەهاتە بەرچاوم.. ئەو خەونەی بە درێژایی ژیانم دەمبینی دێتە دی.. دوای ئەوەی خەیاڵ بوو ئێستا وا دەبێ بە راستی و.. شازادەی وڵاتی پەریان دەبێ بە بەشی من.. شازادە سەرسام بووە پێم، گەرچی کەم ئەندامم و گۆچانم پێیە، لە پاشان منیش دەرگاکانی دڵم بۆ دوو منداڵەکەی کردەوە، بەرامبەریان هەستم بە خۆشەویستییەکی گەورە دەکرد، هەستم کرد هەردووکیان وەك کوری خۆمن، لەمن بوون، ئەوان چەندین کاتژمێر لە تەنیشتم دەمانەوە و باوەشم پیادەکردن و تینوێتی دڵم پێدەشکاندن.. لەو رۆژانەدا روبی سەرتاپای شادی و خۆشی بوو؛ چیرۆکی ئەو خۆشیانەی بۆ دەگێرامەوە کە نەدیمی برای داگرتبوو.. روبی قسەهێنەری نێوان هەردوکمان بوو..

نابێ لەمە زیاتر چاوەروان بم.. رۆژی پێنج شەممەی بەختەوەر هات.. لە مارەبڕینەکەدا هەندێ لە خزمان و هەندێ لە خەڵکی گەرەك بەشدارییان کرد.. بە راستی کردمیان بە بووك، وەك ئەوەی خەڵك دەیانوت جوانیم دڵرفێن بوو. بوونم بە بووك نمایشێك بوو بۆ جوانی پەرییان.. بۆ ماوەیەك لەناو "کەژاوەکەدا" دانیشتم، لە پاشان هاتمە دەرێ بۆئەوەی لەو کورسییەدا دانیشم کە لە پاڵ نەدیما و لەنێو چەپکە گوڵەکاندا ئامادە کرابوو. بۆ یادگاری

وێنەیەکی زۆریان گرتین، لەو کاتەدا ئەم دەستەواژایەم بیست "مانگ لەگەڵ ڕۆژ بەڵام".

فاتیحەم لەسەر "عەقڵ نزمی" ئەو خەڵکانە خوێند کە ناتوانن چۆن چاو لە پەککەوتەیی خەڵکانی دیکە بپۆشن.. جا چییە گەر قاچی ڕاستم لەدەست دابێت و چی تیایە نەدیم پێشتر ژنی هەبووە و خوا لێیی وەرگرتووەتەوە، چ قەیدیە با دوو منداڵیشی هەبێت، لە پاش ئەوە چوومەوە بۆ ژوورەکەم و خواردنەکەمم خوارد، ڕۆشتنم بۆ ماڵی زاوا هیچی وای نەدەویست، چونکە لە ماڵەکەی خۆمانەوە دەگوازرێمەوە بۆ ماڵەکەی بەرامبەرمان؛ لەبەرئەوە مەسەلەکە بەلای منەوە نەماندووی کردم و نە تووشی دڵەڕاوکەی کردبووم، ئیدی بە پێ لە ماڵەکەی خۆمانەوە لەگەڵ برژانەکەم و روبی بەرێکەوتین بۆ ماڵی نەدیم..

بە هەنگاوی لەسەرخۆ دەڕۆشتین، روبی و براژنەکەم دەستییان گرتبوو بە "کراسی شادییەوە" مەبەستم کراسی بووکێنییە.. لە پاشان براژنەکەم لە ژووری نەدیم جێیهێشتم و خۆی ڕۆشت، روبی بۆ ماوەیەك قسەی لەگەڵ کردم و لە پاشان دەرگاکەی داخست و ئەویش ڕۆشت، چاوم بەرز کردەوە و تەماشایەکی ئەو ژوورەم کرد کە تێیدا دانیشتبووم.. چەند دڵگیرە.. کورسییەکانی پان و پۆڕ بوون.. ئاه ئەم پەردانە چەند جوانن. چ ژوورێکی جوانە.. لە ناوەڕاستی ژوورەکەمدا فەرشێکی کشمیری زۆر جوان ڕاخرابوو، فەرشێك نەخشەکانی زۆر بە وردی چنرابوو، دیوارەکانی ژوورەکەش بە زەخرەفە ڕازابووەوە.. ساتێکی سیحرئامێز ژیام و، خۆشیم بە خۆم دەهات کەوا لەنێو ئەو شادی و بەختە باشەدام، نەدیم هات. دەموچاوم لەنێو ئەژنۆکانمدا شاردەوە..

بەڵام یەکسەر ڕووی خۆمم بەرزکردەوە. دەنگی تەقەتەقی دوو گۆچان کەوتە بەرگوێم، ئەوە تووشی سەرسوڕمانی کردم.. تەماشام کرد و بینیم نەدیم بە خۆیی و دوو گۆچان کە لەژێر هەردوو باڵیدا بوو، لە بەردەممدا بە دوو قاچی دەسکردەوە ڕاوەستاوە!!

بە دڵنیاییەوە شۆکی یەکەم شۆکێکی قورس بوو، تێیدا دایك و باوك و قاچی ڕاستم لەدەست دا..

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا توانیم بەرگەی ئەو شۆکە بگرم.. بەڵام ئەم شۆکەی دووەمیان هێندە قورسە ڕەنگە نەتوانم بەرگەی بگرم..

دەمزانی روبی چەند ڕۆژێکی دیکە شوو دەکا و دەڕوا، منیش ئەوەی ماومە لە ژیان لە ماڵی مرۆڤێکی ڕوخسارگەشی کەمئەندامدا دەبەمە سەر.. مرۆڤێك هەردوو قاچی نەماوە.. منداڵەکانی بەخێو دەکەم..

ئەو خۆشەویستییەی دڵمی پڕکردببو بۆ بلال و منداڵەکەی چی لێهات؟!

بۆچی چیتر هەست بە جوانی و گەشاوەیی ڕوخساری نەدیم ناکەم؟!

بۆچی لە پڕێکدا دنیا لەبەرچاوم ناشرین بوو؟!

ئەم پرسیارانە و چەندین پرسیاری دیکە لە مێشکمدا دەهاتن و دەچوون.. بەڵام وەڵامم بۆ هیچ کامیان دەستنەدەکەوت، عەقڵم شپرزە ببوو، تاریکی لە هەموو لایەکەوە دەورەی دابووم، وردە وردە لەنێو ڕوبارێکی پڕ لە زوڵمەتدا دەخنکام.

## سەرچاوە

من الادب الهندى الحديث والمعاصر *2001* ترجمة سمير عبدالحميد.

# وتەیەک بۆ فایلی گەنجان

مەحاڵە باس لە دیموکراتیزەکردنی فەزای سیاسی و تازەکردنەوەی کایە کۆمەلایەتی و ڕۆشنبیری و هونەریەکان بکەین، ئەگەر گەنج پێگەی پێویست و ڕاستەقینەی خۆی وەرنەگرێتەوە و لە بەرکارێکی پاسڤەوە نەبێتەوە بکەرێکی ئاکتڤ. بەڵام ئەم قسەیە دەربارەی بایەخی گەنج جورئەتێکی زۆری دەوێ، نەك لەبەرئەوەی کەس ناوێرێ باس لە بایەخی گەنج بکا، بەڵکو بە پێچەوانەوە لەبەرئەوەی باسکردنی ئەو بابەتە هێندە زیادەڕۆیی تێدا دەکرێ کە بۆتە جۆرێك لە موزایەدەی سیاسی بەرتەسك و هەموو هێز و لایەنێك لەم پەڕی چەپەوە بۆ ئەو پەڕی ڕاست بانگەشەی بۆ دەکا و دەیلێتەوە. هەر بۆیە قسەکردنی جدی دەربارەی گەنج و بزوتنەوەی گەنجان و خوێندکاران، بەر لە هەر شتێك پێویستی بە لەبەریەکهەڵوەشانەوەی ئەو گوتارە باوەی سیاسەت و حیزبایەتی هەیە لە دنیای ئێمەدا کە لە باشترین حاڵەتدا گەنج وەك پارچەیەك لە حەماسەت و جەستەیەکی خرۆشاو دەبینی کە ئامادەیی بەردەوامی خۆبەختکردنی تێدایە.

مەترسی ئەم گوتارە لەوێدایە کە دەیەوێ تەباییەك بسازێنێ لە نێوان گەنج و کۆمەڵگا، یان گەنج و کایەی سیاسی باودا، بە مەبەستی بەکارهێنانی گەنج وەك پاسەوانێکی خاوەن توانای جەستەیی و ماسولکەیی بۆ پاراستنی دامودەزگا و کایە تەقلیدیە کۆمەڵایەتی و سیاسیەکان. لە کاتێکدا بایەخی راستەقینەی گەنج لە نیگەرانی و هەستکردنی بە ناتەبایی لەگەڵ دەوروبەردا دەست پێدەکا نەك بە پێچەوانەوە. واتە گەنج بۆ ئەوەی لە بەرکارەوە ببێتە بکەر دەبێت لە بوونەوەرێکی ئارامەوە ببێتە بوونەوەرێکی نیگەران، لە گوێگرێکی نتمەوە ببێتە قسەکەرێکی پرسیارکەر، لە کەسێکی بێ کێشەوە ببێتە کەسێکی خاوەن کێشە؛ نەك وەك بەدنمەکیەك بەرامبەر نەوەی کۆن و کۆمەڵگا، نەك لەبەرئەوەی بەدوای فرسەتەکانی کودەتاگێڕیدا بگەڕێ، بەڵکو بۆ ئەوەی ببێتە بەشێك لە میکانیزمی گۆڕان و بچێتە پەیوەندییەکی دیالیکتیکی یەکتەواوکەرەوە لەگەڵ وزەکانی تردا. چونکە مەرجی پەیوەندی تەنها تەبایی و پێکەوە گونجان نییە بەڵکو خودی تەبایی و دیالۆگ بەرهەمی ململانێ و جیاوازییە.

مێژوو تەنها کاتێك ڕێ دەکا و جووڵە دەکا کە جیاوازی بەرهەم دێنی و ئەو نەوانە دێنێتە بوونەوە کە لە یەك ناچن، بەڵام ئەو کاتانەی کە نەوە کۆنەکان نەوە تازەکان ناچار دەکەن لەوان بچن و سوننەتی ژیانی ئەوان دووبارە بکەنەوە، ئەوە مێژوش لە جێی خۆی دەوەستێ و چیتر ڕێ ناکا، چونکە مێژو چییە جگە لە زنجیرەیەك ململانێ و ڕووداو و نەوەی جیاواز و لەیەکنەچوو؟ واتە ئەگەر سوننەتی مێژوی سروشت لەسەر ریتمی دووبارەبوونەوە دامەزرابێ، دووبارەبوونەوەی شەوو ڕۆژ و وەرزەکان و هەڵاتن و ئاوابوونی خۆر و...هتد، ئەوا مێژوی مرۆیی لەسەر بنەمای تێپەڕاندنی بەردەوامی

دوێنێ و بەرجەستەبوونی بەردەوامی ڕۆحی مرۆڤ لە فۆرم و ڕەمز و مانای نوێدا دامەزراوە.

بۆ ئەوەی بایەخی تەواوی گەنج بزانین، دەبێ گەنجێتی لە بازنەی تەمەنێکی دیاریکراو دەربازبکەین و وەك وزەیەك تەماشای بکەین کە لە هەموو کۆمەڵگایەکی کراوەو تەندروستدا ئامادەیی هەیە، نەك تەنها لە بزوتنەوەکانی خوێندکاران و فیدراسیۆنەکانی گەنجاندا، بەڵکو لە تەواوی پنتەکانی کۆمەڵگادا بەو شوێنانەشەوە کە گەنجان وەك خاوەن تەمەنێکی دیاریکراو ئامادەییان نییە، واتە دەکرێ گەنجێتی وەك کولتورێکی ژیاندۆست و ڕادیکاڵ لە کۆمەڵگادا ئامادەیی هەبێت بەسەرجەم تەمەنە جیاوازەکانەوە و بگرە بەساڵاچووەکانیشەوە... هەروەك چۆن دەکرێ، بە دیوەکەی تردا، پیرێتی وەك کولتورێکی موحافیزەکار و کۆنەپارێز لە کۆمەڵگا داخراوەکاندا ئامادەیی هەبێت تەنانەت لە ناو گەنجەکانیشدا.

واتە گەنجێتی، وەك کولتورێك و وزەیەك بۆ تازەبوونەوەو گۆڕان، بە تەواوی خانە و جومگەکانی کۆمەڵگادا بڵاو دەبێتەوە گەر ئاشتبوونەوەیەك بسازێنرێ لە نێوان حیکمەتی واقعیانەی پیر و خەونی ناواقعیانەی گەنجدا، چونکە حیکمەت چەندە قووڵ بێت توانای دەستکاریکردنی هاوکێشەکانی واقعی نییە ئەگەر لە ئامادەیی بێسنوری گەنج بۆ ڕەتکردنەوەی واقع مارەنەکرێ، چونکە ئەگەر هەمیشە پیر داوای ئەوەی لە گەنج کردبێ کە بەر لە هەنگاونان بیر بکاتەوە و بەر لە قسەکردن حساب بۆ قسەکانی بکا، ئەوا گەنج هەمیشە حەز دەکا بەر لە بیرکردنەوە هەنگاو بنێ و بەر لە جوینی قسەکانی خواستی دڵی بدرکێنێ، بە مانایەکی تر ئەگەر کامڵبوون فێری وریاییمان بکا ئەوا گەنجێتی فێری جورئەتمان دەکا، کە دواجار تەواوکەری یەکترین نەك دژی یەکتر.

کاتێ مرۆڤ دەبێتە بوونەوەرێکی کامڵ، شارەزاییەکی گەورە پەیدا دەکا لە لۆجیکی ژیاندا، بەڵام گەنج هێندەی خودی ژیانی مەبەستە لۆجیکەکەی پێ گرنگ نییە؛ ئەمەش هەمیشە تووشی کێشەی دەکاتەوە لەگەڵ کولتووری کامڵبووندا کە داوای لێدەکا لۆجیکێك بۆ ژیان بدۆزێتەوە لەبری ئەوەی بە دوای خودی ژیاندا بگەڕێ، هەر ئەمەشە زۆر جار دەبێتە هۆی بەدحاڵیبوونی نێوان نەوەکان.

بۆ نموونە ئەگەر (ئازادی) لە فەرهەنگی سیاسی و کۆمەڵایەتی باودا چەمکێك بێت پێویستی بە لەسەر وەستان و وردکردنەو شیکردنەوە بێت؛ ئەوا لە کولتوری گەنجدا بەهایەکە پێویستی بە پراکتیزەکردن و باوەش پیاکردن و تەرجەمەکردن هەیە بۆ سەرزەمینی واقع. یان ئەگەر ڕەخنەکردنی دیکتاتۆریەت لەسەر ئاستی فیکر پێویستی بە کەرەستەگەلێکی مەعریفی دەوڵەمەند بێت، ئەوا لە کولتوری گەنجدا پێویستی بە ڕووبەڕووبوونەوەی ڕاستەوخۆ هەیە لە چەند دروشمێکی خێرادا تەنانەت ئەگەر لە ڕووی لۆجیکی و ڕێزمانیشەوە هەڵە بێت.

زۆر جار لە دۆخی کۆمەڵایەتی و سیاسی زۆر ئارامدا تەقینەوەی خوێندکاران و گەنجان ڕوودەدا بەبێ ئەوەی پێشبینی بکرێ و تەنانەت بەبێ ئەوەی دوای ڕوودانیشی پاساوی تەواوی بۆ بدۆزرێتەوە. بەڵام ئەگەر بە وردی لەسەر هەر دیاردەیەك بوەستین دەبینین کوڕی ڕاستەقینەی سەردەمەکەی خۆیەتی و ڕوودانی لە ڕوونەدان و دواخستنی گەلێ پێویستتر و تەندروستترە، چونکە ئەگەر تەقینەوەی نارەزایی توێژەکانی تر بە مەبەستی دەستکاریکردنی هاوکێشە ماتریاڵەکان بێت؛ ئەوا تەقینەوەی نارەزایی گەنجان کە خاوەنی هیچ بەرژەوەندییەکی ماتریاڵ نین بە مەبەستی دەستکاریکردنی هاوکێشە مەعنەویەکان و سیستمی بەهاکانە.

نموونەیەکی زۆر سانا کە هێربێرت مارکیۆز لە دیدارێکدا لەگەڵ بریان ماگی ئاماژەی پێدەدا (بڕوانە: گۆڤاری سەردەم، ژ(*8*) ل *234*)؛ تەقینەوەی بزاوتی

خوێندكاران لە شەستەكانی سەدەی رابردوودا گوزارشتكردن بوو لە ناڕەزایی دژی فاشیزم و نازیزم كە هەرچەندە بەشێوەیەكی ماتریاڵ كۆتاییان پێهاتبوو بەڵام لە ڕووی كولتووری و سیستمی بەهاكان و پەیوەندییە كۆمەڵایەتیەكانەوە هێشتا كۆتاییان پێنەهاتبوو. واتە گەنجان بۆنی فاشییەتێكیان دەكرد لە ناو زانكۆكان و لە كۆی پەیوەندییە كۆمەڵایەتیەكان و بەها كولتوریەكاندا كە خاوەن تەمەنەكان نەیاندەبینی و هەستیان پێنەدەكرد، یان خۆیان بەشێك بوون لەو فاشیەتە و بێئاگابوون. هەمان حاڵەت بەسەر بزاوتی هیپییەكان و گەنجە سەرتاشراوەكاندا جێبەجێ دەبێ كە لە حەفتاكان و هەشتاكانی هەمان سەدەدا سەریان هەڵداو لە كاتی خۆیاندا بزاوتی سەیر و سەمەرە و بێ مانا بوون، بەڵام دواتر پاساوی لۆجیكییان بۆ دۆزرایەوە.

لێرەوە بایەخی ئەم فایلەی گۆڤاری سەردەم بەرجەستە دەبێ سەبارەت بە گەنجان و بزاوتی خوێندكاران، بە تایبەتی لە بارودۆخێكی هەستیار و مێژویی وەك ئەمڕۆماندا كە ناوچەكە و جیهان بە قۆناغی وەرچەرخانێكی زۆر گەورەدا تێدەپەڕن، زیادەڕۆیش ناكەین ئەگەر بڵێین كوردستانی خۆمان و عێراق گرنگترین دەروازەی كرانەوەیە بەرەو ئەو وەرچەرخانە و بۆ یەكەمین جارە لە مێژودا لە ناو هەناوی گۆڕانكاریەكاندایین نەك لە پەراوێزیاندا. بەڵام تەنها ئەو گۆڕانەی لە جیهاندا روودەدا و بەر ئێمە دەكەوێ بەس نییە بۆ دەستكاریكردنی هاوكێشەكانی دنیای خۆمان ئەگەر بكەرێكی كارا نەبین تیایدا. ڕاستتر كارلێك نەكردنی ئێمە لەگەڵ گۆڕانەكاندا و، لەسەر و هەمووشیانە بەشداری نەكردنی گەنجەكانمان لەو وەرچەرخانە گەورەیەی بەرێوەیە، گۆڕان لە رووكەشدا قەتیس دەكا، وەك ئەوەی لە چەند دەیەی رابردوودا لە وڵاتانی كەنداو روویدا و، زۆر جاریش دەرەنجامی سلبی و پێچەوانەی لێكەوتەوە.

ئێستا كە بتەكەی سەدام حسێن لە بەغدا كەوتووە، لەگەڵیشیدا دەزگاكانی بەعس و سوپا و پۆلیسی نهێنی هەرەسیان هێناوە.. كولتووری بەعسیزم هێشتا لە ناوماندا زیندووە كە رەنگە هێندە بە ئاسانی نەبینرێ، چونكە ئێمەی بە تەمەن و خاوەن بەرژەوەندی هێندەی چاوەڕێی چێژوەرگرتنین لە دەسكەوتەكانی پاش كەوتنی بتەكەی سەدام.. هێندە بە دوای بتە نهێنی و نەبینراوەكانی ناخی خۆماندا ناگەڕێین. ڕەنگە گەنجان گرنگترین توێژی كۆمەڵگا پێك بهێنن بۆ دەستنیشانكردن و ئاشكراكردنی ئەو بتە كولتووری و مەعنەویانەی كە پێویستە چی زووتره هەرەس بێنن، چونكە گەنجان چیتر رووبەڕووی سیخور و زیندان و تیمەكانی ئیعدامی ئاشكرا نابنەوە، بەڵكو رووبەرووی تیمە نهێنیەكانی تۆڕی مامۆستایان و پەروەردەكاران و پۆلیسەكانی ئەخلاق و حیكایەتخوانەكان، لە زانكۆكان و پەرەستگاكان و قوتابخانەكان و دەزگا ڕۆشنبیریە ساختەكان دەبنەوە، ئەو شوێنانەی كە بەچەندین تۆڕی سانسۆر و چاوی نهێنی تەنراون. بۆیە دەبێ لە ئێستاوە ئێمە خۆمان ئامادە بكەین بۆ ئەوەی گەنجان گاڵتەیان بەم ئازادییە رووكەشە بێت كە ئێمە شانازی پێوە دەكەین، چونكە زۆر ناوچەی تاریك هەیە، كە لێوان لێوە لە كەسانی كڵۆڵ و كچ و كوڕی یەخسیر و شەریعەتی كۆیلایەتی، كە ئێمە بە هۆی سەرقاڵیمانەوە بە چنینەوەی دەسكەوتەكانی ئازادی نایانبینین. واتە ئەگەر شەڕی نەوەی كۆن بۆ ئازادی ئێستا كۆتایی پێ هاتبێ ئەوا شەڕی نەوەی تازە ئێستا دەست پێدەكات.

—سەردەم—

# مەسەلەی توند و تیژی و یاخیبوونی رادیکال

**هربرت مارکۆز**

**له فارسییەوە: ڕێبین هەردی**

ئەمڕۆ دەکرێ یاخیبوونی رادیکال تەنها لە چوارچێوەیەکی جیهانیدا، لەبەرچاو بگرین. گەر بمانەوێت بە تەنها سەرنجی لێبدەین، هەر لە سەرەتاوە ماهییەتەکەیمان شێواندووە. من بە دیدێکی جیهانیەوە بەڵام بە سەرنجدانی تایبەتی لە ئەمەریکا، باس لەم مەسەلەیە دەکەم. دەزانن کە بە بڕوای من یاخیبوونی هەنوکەیی خوێندکاران، یەکێك لە هۆکارە سەرەکیەکانی گۆڕانکاریە: دیارە نەك هێزێکی شۆڕشگێڕی هەنوکەیی کە بە ڕاگەیاندنی، سەرزەنشتی منیان کردووە، بەڵکو وەك یەکێك لە بەهێزترین ئەو هۆکارانەی کە دەتوانن هێزە شۆڕشگێڕەکان دروستبکەن. لێرەوە یەکێك لە گرنگترین پێداویستیە ستراتیژیەکانی ئەم ساڵانە، ئەوەیە کە یاخیبوونی خوێندکاران لە جێگە جیاوازەکاندا، بەیەکەوە گرێبدەین. بە زەحمەت دەکرێ پەیوەندی نێوان یاخیبوونی خوێندکارانی ئەمەریکا و ئەڵمانیا بدۆزرێتەوە. یاخیبوونی خوێندکارانی ئەمەریکا تەنانەت ڕێکخستنێکی ناوەندی کاریگەری نییە، (بەڵام) دەبێت بۆ جێگیرکردنی پەیوەندیەکی لەم چەشنە هەوڵبدەین و گەر دەشبینن نمونەی ئەمەریکا دەهێنمەوە، تەنها لەبەر جێگیرکردنی پەیوەندیەکی لەم چەشنەیە. یاخیبوونی خوێندکاران لە ئەمەریکا خۆی بەشێکە لە یاخیبوونێکی گەورەتر کە زۆرجار پێی دەگوترێت "چەپی نوێ".

سەرەتا دەبێت جیاوازییە سەرەکیەکانی چەپی تازە و چەپی کۆن بە کورتی روون بکەینەوە. چەپی تازە بە هەندێك ئاوارتنەوە، زۆرتر نوێ مارکسین تا مارکسی ئاسایی، ئەم گروپە بە توندی لە ژێر کاریگەری مائویزم و بزوتنەوە شۆڕشگێڕەکانی جیهانی سێهەمدان. جگە لەمە لە ناو ئەم چەپە تازانەدا مەیلی ئانارشیستی نوێ هەیە و بەبێ باوەڕی قوڵیان بە حیزبەکانی چەپی کۆن و ئایدیۆلۆژیەکانی، دیاری دەکرێن. چەپە تازەکان،

دیسان بە هەندێك ئاوارتنەوە، تەنها چینی کرێکار بە هۆکاری شۆڕشگێڕ ناناسن. ناکرێ چەپە تازەکان بە شێوەی باو پۆلێن بکرێن و لە ناو گروپە ڕۆشنبیرەکان، گروپە لایەنگرەکانی بزوتنەوەکانی مافی مەدەنی، لاوان و بە تایبەتی رادیکالترین رەگەزەکانی لاوان و کەسانێك کە لە سەیرکردنی یەکەمدا سیاسی نایەنە پێشچاو: واتە هیپیەکان، دابنێین. دواتر باسی هیپیەکان دەکەم. خاڵی سەرنجڕاکێشەر ئەوەیە کە قسەکەرانی ئەم بزوتنەوەیە کەسانی گومانلێکراوی وەك شاعیرەکان، نوسەران و ڕۆشنبیران پێکی دەهێنن، نەك سیاسەتمەدارە تەقلیدیەکان.

ئەگەر تەماشای ئەو نەخشەیە بکەن کە بۆم وێنەکردن، دەیسەلمێنن کە ئەم هەلومەرجە بۆ مارکسیە کۆنەکان وەك کابوسێك وایە. ئێوە لێرەدا یاخیبوونێك دەبینن کە هیچ پەیوەندی بە هێزە شۆڕشگێڕە "کلاسیکیە"کانەوە نییە: بەلام کابوسێکە کە لە واقعەوە دێت. بە بڕوای من ئەم یاخیبوونە نائاساییانە، رەنگدانەوەی واقعی کۆمەڵگایەکی دیموکراسی ئۆتۆریتەری "لە حاڵەتی هەوڵداندایە" و رەنگدانەوەی ئەو شتەیە کە من ناوم ناوە "کۆمەڵگای تاك رەهەند" کە خەسڵەتی سەرەکی بریتیە لەوەی چینێکی بالا دەست، لەسەر بناغەی نیازە کۆنترۆلکراو و تێرکراوەکان کە خۆیان ئینحساری کاپیتالیسمی دروست دەکەن - ویژدانێکی کۆنترۆڵکراو و سەرکوتکراو - بەسەر کۆی کەرەسە و بناغە واقعیەکانی کۆمەڵگادا، دەسەلات پەیدا دەکەن. دەرئەنجامی ئەم یاخیبوونانە ئەوەیە کە لە کۆمەڵگایەکدا کە هۆکارە بابەتیەکانی بەم رادەیە ئاشکران، بۆ دروستکردنی گۆڕانکاری، هۆکاری زیهنی، ئیلزامی نین. ئا لەم هەلومەرجەشدا یاخیبوون لە لایەن کەسانێکەوە کە لە دەرەوەی سیستەمی جێگیرن، ئەنجام دەدرێت. یەکەم گروپ، کۆمەڵێکی مەحرومن کە تەنانەت کاپیتالیزمی پێشکەوتووش ناتوانێت و نایەوێت پێداویستیە زیندوەکانیان، جێبەجێ بکات. دوهەم گروپ جەمسەرەکەی تری کۆمەڵگا پێکدەهێنن، واتە چینێکی خۆشگوزەران کە ویژدان و غەریزەی کۆمەڵایەتیان لە کۆنترۆڵی کۆمەڵگا دەچێتە دەرێ. مەبەستم ئەو گروپە لە چینە کۆمەڵایەتیەکانە کە بە هۆی پێگە و خوێندنیان، هەقیقەتەکان و بونیادی هەمەکی هەقیقەتەکان دەناسن و، ئەم ناسینەش بە زەحمەت بەدەست دێت. ئەم چینانە هوشیارن بەرامبەر ناکۆکیە روو لە زیادەکانی ئەم کۆمەڵگا بە روکەش دەوڵەمەندە و هەروەها بەو باجەی کە ئەم کۆمەڵگا بە روکەش دەوڵەمەندە، لە قوربانیانی وەردەگرێ. بە کورتی لە هەردوو ئەم جەمسەرەی کۆمەڵگادا، یاخیبوون هەیە و دەمەوێت لێرەدا بە کورتی رونیان بکەمەوە:

چینی مەحروم: لە ویلایەتە یەکگرتوەکاندا ئەم چینە مەحرومە بە گشتی لە کەمایەتیە نەتەوەیی و نەژادیەکان پێکدێت کە رێکخستنێکی سیاسی دروستیان نییە و زۆر جاریش ناکۆکی لە نێوان خۆیاندا هەیە (بۆ نمونە لە شارە گەورەکاندا پێکدادانێکی زۆر لە نێوان رەشەکان و پۆرتوریکۆیەکاندا هەیە). ئەم گروپە زۆر جار جێگەیەکیان لە دیاردەی بەرهەمهێناندا نییە، لێرەوە لە روانگەی تیۆرەی مارکسەوە ناکرێت بە چێنگەلێکی بە زەبر شۆڕشگێڕ بزانرێ - لایەنی کەم بێ یارمەتی کەسانی دی. بەلام بە دیدێکی جیهانییەوە چینی مەحرومی واقعی کە باری ئەم سیستەمەی بەسەر شانەوەیە، لە راستیدا خەباتگێڕی رێگەی ئازادین، دژی کۆلۆنیالی نوێ لە جیهانی سێهەمدا و دژی کۆلۆنیالیکردنن لە ویلاتە

یەکگرتووەکاندا. لێرەشدا هیچ جۆرە وابەستەیی و پەیوەندییەك لە نێوان کەمایەتییە نەژادی و نەتەوەییەکان لە ناوەندە گەورەکانی کۆمەڵگای سەرمایەداریدا و جەماوەری نوێی کۆلۆنیالیکراو کە دژی ئەم کۆمەڵگایە خەبات دەکەن، نییە. دەکرێ ناوی ئەم گروپە بنێین پرۆلیتاریای نوێ کە ئەمرۆکە بە مەترسیەکی واقعی بۆ کۆمەڵگای سەرمایەداری، دەژمێرێت. ئەوەی کە تا چەند دەکرێ چینی کرێکاری ئەوروپا لەناو ئەم گروپە مەحرومەدا دابنێین، خۆی مەسەلەیەکە کە دەبێت بە جیا لێی بکۆڵینەوە و لێرەدا ناتوانم لێی بکۆڵمەوە و تەنها ئاماژە بۆ پرنسیپە گشتیەکانی دەکەم. لە بارەی چینی کرێکاری ویلایەتە یەکگرتووەکانەوە دەبێ بگوترێت کە زوربەیان لە سیستەمی سەرمایەداریدا جێگەیەکیان هەیە، لەبەرئەوە ئارەزووی گۆڕانکاریەکی بنەڕەتی ناکەن، بەڵام هێشتا رەنگە نەتوانرێت لەبارەی چینی کرێکاری ئەوروپاوە هیچ بگوترێت.

چینی خۆشگوزەران: من چینی دوهەم کە دەستیانکردووە بە دژایەتی سیستەمی سەرمایەداری پێشکەوتوو، لە دوو بەشدا تاوتوێ دەکەم. رێگەم بدەن سەرەتا لە گروپێکەوە دەست پێبکەین کە پێیان دەگوترێت کرێکارانی تازە و تەکنیکیەکان، ئەندازیاران، پسپۆرەکان، زانایان و کەسانی دی دەگرێتەوە و دەستیان لە پرۆسەی بەرهەمهێناندا هەیە، ئەگەرچی ئەم گروپە جێگەیەکی تایبەتیان هەیە. لەلایەکەوە بە هۆی ئەو پێگە تایبەتیەوە کە ئەم گروپە هەیانە، ناوکی هێزێکی شۆڕشگێرانەی بابەتی پێکدەهێنن و لە لایەکی دیەوە بۆ سیستەم وەك منداڵێکی نازدارن کە لە ناوەڕۆکدا ویژدانی سیستەمەکە پێکدەهێنن. لێرەوە زاراوەی "چینی کرێکاری تازە" زاراوەیەکی نەگونجاوە.

بەشی دووهەم کە ئەمرۆ بە تایبەتی دەمەوێت قسەی لەبارەوە بکەم یاخیبوونی خوێندکارانە بە مانای فراوانی وشە کە دەرکراوەکانیش دەگرێتەوە. تا ئەو جێگەیەی کە دەتوانم هەڵیسەنگێنم، جیاوازیەکی سەرەکی لە نێوان بزوتنەوەی خوێندکارانی ئەڵمانیا و ویلایەتە یەکگرتووەکان، هەر لەم دەرکراوانەدایە. لە ئەمەریکادا زۆرێك لە خوێندکاران کە یاخیبووی چالاکن، وازیان لە خوێندکاری هێناوە، بۆئەوەی هەموو کاتی خۆیان بۆ رێکخستنی ئەم یاخی بوونانە تەرخان بکەن. ئەم بابەتە ترسناکە، بەڵام لە ناوەڕۆکدا قازانجیشی هەیە. من یاخیبوونی خوێندکاران، لە ژێر سێ ناونیشاندا تاوتوێ دەکەم. یەکەم ئەوەی کە یاخیبوون دژی چییە، دوهەم ئەوەی کە بە چ شێوەیەکە و سێهەم ئەوەی کە ئاسۆی ئەم یاخیبوونە چیە؟

سەرەتا ئامانجی یاخیبوون چیە؟ ئەم پرسیارە دەبێ بە جدی وەربگیرێ، چونکە روبەڕوی یاخیبونێك وەستاوین کە لە بەرامبەر کۆمەڵگایەکی دیموکراتی چالاك و بە بەرهەمدا راوەستاوە کە لایەنی کەم لە هەلومەرجی ئێستادا تیرۆری تێدا نییە. جگە لەمەش ئەو خاڵەی کە لە ویلایەتە یەکگرتووەکاندا روون و ئاشکرایە ئەوەیە کە ئەم یاخیبوونە دژی زۆرینەی کۆمەڵگا و لەوانەش چینی کرێکار، ئەنجام دەدرێ. ئەمە یاخیبوونێکە دژی فشاری بەردەوام و هەمەلایەنەی ئەم سیستەمە.. فشارێك کە بە هۆی دەسەڵاتی سەرکوتکەر و وێرانکاریەوە، هەموو شتەکانی بەشێوەیەکی نامرۆڤانە، سڕیوەتەوە و کردوونی بە شتگەلێك کە کڕین و فرۆشتنیان گوزەران و ناوەڕۆکی ژیان

پێکدەهێنێ، یاخیبوونێکە دژی ئەخلاقیات و "بەها" درۆزنەکانی ئەم سیستەمە و دژی تیرۆرەکانی دەرەوەی شارە گەورەکان. ئەم یاخیبوونانە سەرەتا وەك بزوتنەوەی مافی مەدەنی و پاشان وەك جەنگی ڤێتنام دەرکەوتن. لە بزوتنەوەی مافی مەدەنیدا خوێندکاران لە باکورەوە بۆ باشور ڕۆیشتن، تاکو یارمەتی رەشەکان بدەن مافی خۆیان وەربگرن. ئا لێرەدا بوو کە خوێندکاران سیمای ڕاستەقینەی ئەم سیستەمە دیموکراتەیان بینی، بینیان کە "شەریف"ەکان چی دەکەن، بینیان کە چۆن کوشتن و کوشتاری رەشەکان بێ سزادان دەبێت، لە کاتێکدا کە بکوژ بە تەواوی ناسراوە. ئەمە ئەزموونێکی ڕاچڵەکێنەر بوو کە چالاکی سیاسی خوێندکاران و ڕۆشنبیرانی بەرێخست. لە چرکەی دوهەمدا ئەم یاخیبوونە لەگەڵ جەنگی ڤێتنامدا توندتر بوو. جەنگ بۆ خوێندکاران خودی واقعی کۆمەڵگای جێگیری ئاشکرا دەکرد: پێویستی پەرەسەندن خوازی و دەستدرێژی کە لە خودی ئەم سیستەمەدا هەیە و ئەو وەحشیەتگەریەی لە دژی بزوتنەوەی ئازادیخوازەکان، لە خۆی پیشاندەدات.

بەداخەوە هەلی ئەوە نییە کە لێرەدا تاوتوێی جەنگی ڤێتنام بکەم و ببینین کە جەنگی ئیمپریالیانەیە یان نا. لێرەدا تەنها ئاماژەیەکی کورت دەکەم، چونکە ئەمە مەسەلەیەکە کە هەمیشە بەرەو رومان دەبێتەوە. ئەگەر ئیمپریالیزم بە مانا کۆنەکەی وەربگرین، ئەوا ئەم جەنگە ئیمپریالیانە نییە، لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەم مەسەلەیە سەرلەنوێ بووە بە مەسەلەیەکی توند. لە گۆڤاری نیوزویك لە ژمارە حەوتی جولای *1867*دا دەخوێنینەوە کە ڤێتنام سەرمایەیەکی بیست ملیۆن دۆلاری پێکدەهێنێ و ئەم ژمارەیەش ڕۆژ بە ڕۆژ زیاد دەکات: لەگەڵ ئەمەشدا پێویست بەوە ناکات لێرەدا پێناسێکی تازە بۆ ئیمپریالیزم تاوتوێ بکەین، چونکە قسەکەرانی دەوڵەتی ئەمەریکا خۆیان ئەم کارەیان کردووە. ئامانجی ئەمەریکا لە ڤێتنامدا ئەوەیە ڕێگە نەدات یەکێك لە گرنگترین ناوچە ستراتیژی و ئابوریەکانی جیهان بکەوێتە دەست کۆمۆنیستەکان. گرنگی جەنگی ڤێتنام بۆ هەموو خەباتە نەتەوەییەکانی سەرتاسەری زەوی بەهای خۆی هەیە، لەو ڕووەوە کە سەرکەوتنی ڤێتنامیەکان لە بەدەستهێنانی ئازادیدا، بزوتنەوە ئازادیخوازەکانی تری دنیا و ئەو شوێنانەی کە سەرمایەگوزاری گەورەی تیاکراوە، چالاك دەکات. ئەگەر ڤێتنام تەنها ڕەنگدانەوەی سیاسەتی دەرەوەی ئەمەریکا نەبێت، بەڵکو پەیوەندی بە خودی سیستەمەکەوە هەبێت، ڕەنگە خاڵی وەرچەرخانێك بێت لەم سیستەمەدا و ڕەنگە سەرەتای مردنی لەناو خۆیدا هەڵگرتبێت. چونکە لێرەدا ئاشکرا بووە کە ئیرادە و جەستەی مرۆیی بە فەقیرترین چەکەکانەوە، دەتوانێت دەرەقەتی گەورەترین سیستەمی وێرانکەری هەموو سەدە و سەردەمەکان بێت، ئەمە لە مێژوودا شتێکی تازەیە.

ئێستا با بگەڕێمەوە بۆ پرسیاری دوهەمی خۆم و شێوەکانی ئەم یاخیبوونە، تاوتوێ بکەم. ئێمە قسە لەبارەی یاخیبوونی خوێندکارانەوە دەکەین، بەڵام دەبێ لە سەرەتادا بڵێم کە مەسەلەکە بەسیاسیبوونی زانکۆکان نییە، چونکە زانکۆکان لە پێشەوە سیاسیبوون. تەنها دەبێ ببینین بۆ نموونە زانستە سروشتیەکان و تەنانەت زانستی وەك ماتماتیك، تا چ ئەندازەیەك جێگەیان لە دیاردەی بەرهەمهێنان و ستراتیژی سەربازیدا هەیە. تەنها دەبێ ببینین زانستە سروشتیەکان و تەنانەت کۆمەڵناسی و دەرونناسی، لە ڕووی مادیەوە تا چەند پشتیان بە دەوڵەت و دەزگا گەورەکان بەستووە و ببینین، دەستێوەردانی دەوڵەت و دەزگا

ئازادیخوازێکی راستەقینە زانیووە کە لە بەرزترین پلەی پراکتیکیشدا بوو[8] ئەو دەستپێکەری بزووتنەوەکە بوو لە زانکۆی نانتی فەرەنسیدا، کە بە خێرایی بەسەر زانکۆکانی تر و وڵاتەکانی تریشدا تەنیەوە. گاورین لە بەرگریکردن لەودا دەنوسێت کە بێگومان بۆرژوازیەکان و ستالینیستەکان هەرگیز نایبەخشن[9]. بندیت وەك زیخێك لە پێلاوی دیسپۆتیزمدا، چ لە جۆری کۆمۆنیستیەکەی یان لە جۆری رۆژئاواییەکەی، رێگر بوو لە جوڵەیان. پاش دەرکردنی ئەو، گروپی جیاواز کە تەنانەت ئەو کرێکارانەشی تێدا بوو کە پێیان دەگوترا یەخە رەشەکان *Black Jachets* و هەروەها گروپە نیمچە ئانارشیستیەکان، ئەو رەشانەی کە بەدوای مافی خۆیاندا دەگەڕان، لایەنگرانی بزوتنەوەی مەدەنی *Civil Rights* و بزوتنەوەی ئاشتی، دەستیان کرد بە شۆڕش[10].

بزوتنەوەی خوێندکاری لە زەمانی خۆیدا، هاوکاتی دوو تەوژم بوو، یەکێکیان رەگێکیان نیمچە مارکسی بوو کە بە سودوەرگرتن لە مارکسیزم ئایدیالیزمی و حیزبی کۆمۆنیست لەبەر دواکەوتووی لە جوڵە بەرەو پێشەوە، خۆیان بە قەرزاری مارکسیزم دەزانی، رەگی دوهەمیش ئارەزوویەکی زۆری بۆ رێکنەخستن و هەروەها وێرانکردن هەبوو.. هەر لەبەر ئەمەش بزووتنەوەکە، رەخنەگرتنی کەسانێکی وروژاندووە[11].

تری ئیگڵتۆن لە ئاماژەیەکی سوکایەتی پێکەردا بۆ ئەم بزووتنەوەیە، دەنوسێ: "لە ساڵی *1968* دا بزوتنەوەی خوێندکاری سەرتاسەری ئەوروپای گرتەوە. پۆلیس و جەیش لە شەقامەکاندا کەوتنە دژایەتی خوێندکارانێك کە بۆ مسۆگەر کردنی یەکێتی لەگەڵ چینی کرێکاردا، تێدەکۆشان. بزووتنەوەی خوێندکاری بێ توانا لە دەستەبەرکردنی رابەرێکی سیاسی گونجاو، لە بگرەو بێنە گومراهکەرەکانی سۆشیالیزم، ئەنارشیزم و زویربوون و ئاشتی مناڵانەدا غەرق بوو، تا لە دەرئەنجامدا ناچار بە پاشەکشێ کردن بوو. لەبەرئەوە پاش بونیادگەری *Post sturcturomism* بەرهەمی تێکەڵبوونی سەرخۆشی و سەرگەردانی، رزگاری و پەرت بوون، شادمانی گشتی و وێرانی، واتە بەرهەمی *1968* بوو، پاش بونیادگەری کە توانای تێکشکاندنی بونیادەکانی دەسەڵاتی دەوڵەتی نەبوو، لەبری ئەمە ژێر و ژورکردنی بونیادەکانی زمانی کرد بە شتێکی مومکین[12].

هەرچەندە پێدەچێت دیدی ئیگڵتۆن بەشێك لە هەقیقەتی تێدا بێت، لەو رووەوە کە بزوتنەوەکە لە روو وەرگێڕان لە قسەکەر یان رابەرێکی بەرجەستە، جۆرێك لە شکستی خێرای قبوڵکرد و بیری *68* نەیتوانی بەو شێوەیەی کە پێویستە گرنگی خۆی دەربخات، بەڵام لە بنەڕەتدا ئەو بەڵگەیەی کە لێرەدا دەهێنرێتەوە ئەوەیە کە بزووتنەوەی ناوبراو خۆی لە رابەران و قسەکەرانی گەورە کە وەك حەکایەتی گەورە، *Metanarrative* بانگەشەی زانینی هەقیقەتیان دەکرد، دوردەکەوتەوە[13]. خوێندکارانی ناڕازی لەگەڵ ئەوەشدا کە هەموو بەرهەمەکانی باکۆنین و مارکس و ئنگلزیان خوێندبوەوە، بەڵام وا بیریان دەکردەوە کە جێبەجێکردنی تەماعەکان بەشێوەیەك کە لە دیدی رۆشنبیرانی مولتەزیمەوە کەوتۆتەوە، دەرئەنجامێکی جگە لە دەسەڵات و سەرکوتکردنی بەردەوام نابێت. کەوابوو دەکرێ مەزەنەی ئەوە بکەین کە بزووتنەوەکە هەر لە سەرەتاوە بەشێوەیەکی سوریالیستی مەرگی خۆی قبوڵکردبوو، هەر لەبەرئەمەش بە توندی شەیدای دیدی هونەری و سیاسی سوریالیزم بوو. خوێندکاران بە روو وەرگێڕان لە قبوڵکردنی

"قسەکەر"ێك پیشانیاندەدا کە هەنوکە مرۆڤەکان نین کە دەسەڵات دەگرنە دەست، یان حیزبەکان نین کە جنگ دەکەن بە دەسەڵاتدا، تەنانەت خوێندکارانیش نین، بەڵکو ئەوە خەیاڵە کە دەست بە کارێکی وا دەکات. بێگومان ئەمە تاکە دەستبەسەراگرتنێکی دەسەڵاتە کە دەتوانێ رووبدا، بێ ئەوەی فەسادێکی بەدوادا بێت. هەر لەبەر ئەمەش تەنانەت مارکۆزە کە دەورێکی دیاری لەم بزوتنەوەیەدا وەك رابەرێك هەبوو، ئیدیعای رابەرێتی رەد دەکاتەوە. ئەو لە چاوپێکەوتنێکدا لەگەڵ برایان ماگی لەم بارەیەوە گوتویێتی: "من مورشید و پێشەوای خوێندکاران لە چالاکیەکانی شەستەکان و سەرەتای حەفتاکاندا نەبووم. من تەنها هەندێك بیرو بۆچوونم کە لەو سەردەمەدا لە فەزادا پەرش و بڵاو بووبوونەوە، شکڵبەندی کرد و دەرمبڕی. نەوەی خوێندکاران کە لەو ساڵانەدا دەستیان بە چالاکی کرد، بۆ دەربڕینی ناڕەزایی بەرامبەر بە کۆمەڵگایەك کە هەر رۆژەی نایەکسانی و ستەم و دڵڕەقی و وێرانکەری گشتی دەردەخست، پێویستیان بەوە نەبوو کە دوای سیمایەکی شێوە باوکانە یان شێوە باپیرانە بکەن، خۆیان ئەم شتانەیان ئەزموون دەکرد و لە پێش چاویاندا دەیانبینی"[14].

دیدی مارکۆزە بەشێك لە بیری 68 ئاشکرا دەکات. لە لایەکەوە بێزاری گشتی لە پرۆسەی کەڵەکەکردنی مادی و نەبوونی ئیمان و ئیلتیزامی سیاسی لە دەیەی 1950دا و لە لایەکی دیشەوە ئاماژە سەرەتاییەکانی ناسەقامگیری ئابوری لە سەرمایەداری رۆژئاواشدا، هۆ و هۆکاری هاوبەشی نائارامیەکانی خوێندکارانی فراوانی، پێکدەهێنا. لەبەرئەمە دەرئەنجامی ئەم بزوتنەوانە، وەك لەلایەن یەکێك لە خوێندکارە توندڕەوەکانەوە پێشکەش کرابوو، "بانگەشەکردن بوو بۆ لەناوبردنی فەزای بۆرژوازی پەروەردە"[15]. بەشێکی تری هەقیقەتەکەش لەلایەن هابرماسەوە لەو ڕوانگەیەوە خراوەتە ڕوو کە خوێندکارانی 68 یەکێك لە ڕەوتە گرنگەکانی نەریتی رۆشنگەری سیاسی بوون. ئەگەرچی هابرماس لە درێژەی رێگەدا وازی لە هاوڕێیەتی بزووتنەوەکە هێنا[16]. بە بڕوای هابرماس خوێندکاران و ناڕازیبوونی ئەم نەوەیە، بە پێچەوانەی تێگەیشتنی هەڵەوە کە هەندێك نوسەر پێیان لەسەر داگرتووە، قڵپکەرەوەی میراتی رۆشنگەری نەبووە[17]. بەڵکو دەکرێ لە ژێر کاریگەری دیدی هابرماسدا بگوترێ، ئەم گروپانە بە دوای گەڕانەوەی ئەو ئازادی و فەزیلەتە لە دەست چووانەدا بوون کە لە ئەنجامی سەقامگیربوونی سیستەمی تاك ڕەهەندی، ئازادی وەك یەکەم قوربانی، لە کۆمەڵگا کردبووە دەرێ[18].

شۆڕشی خوێندکاری 68 ناوبانگێکی بۆ بزوتنەوەکە پەیدا کرد. "شۆڕشەکە بە شکات کردن لە سنورداریێتی ئازادی رادەربڕین لە فەزای زانکۆدا دەستی پێکرد، بەڵام زۆر زوو راکێشرا بۆ مەسەلەی گەورەتر: ماهیەتی زانکۆی نوێ و پەیوەندی بە کۆمەڵگاوە و جێگەی خوێندکاران لە زانکۆدا"[19]. دیارە لە نێو ئەم مەسەلانەدا، جۆرێك لە رەخنەش لە مۆدێرنە و کلتورە چونیەك کردنەکەی هەبوو کە بە دروشمی "قەدەغەکردن، قەدەغەیە"[20] خوێندکاران لە کرداری قەدەغەکردنەکانی کلتوری زۆرداری سەرمایەداری دەوڵەتی و تایبەتیدا لەیەك کاتدا رەخنەی دەگرت. ناوەرۆکی یەکێك لە دروشمەکانیان، واتە "هەلومەرجی کارەساتاوی خوێندکاری"[21] بەدوای ژیانێکی نوێدا دەگەڕا کە لە هەلومەرجی سەرکوتکەرانەی سەرمایەداری دەوڵەتی و ئازاددا، بەدەست نەدەهات.

بزووتنـــــەوەی نیمچـــــە شۆڕشـــــگێرانەی خوێندکاران، هێرشکردن بوو بۆ ئەو وێنایەی زانکۆ کە پێیـان دەگـووت بـە کارخانـەی زانـین ســازی Knowledge Factory ، ئیروینگ هاو لە بارەی زانکۆوە گوتبووی: "یاسایەك بۆ پەروەردەی بێ عەرەزانە.. کە گەرم دەبێت بە شەوق و ئارەزووی وتوێژێك کە بە بڕوای ئەوانەی زانکۆیی نین، بێ سودە و قابیلی تێگەیشتن نیە.. پەنای بیروڕاکان، جێگەیەك کە تیایدا دەتوانرێ کەسانێك ببینین کە وەك نمونەی دیسپلینی فکری و عەشق بۆ زانین، چالاکی تیا دەکەن". بە بڕوای خوێندکاران زانکۆکان لەو کاتەدا ڕێك لەبەرئەوەی ئاڕاستەیەکی وای وەرنەگرتووە کە هاو گوتوێتی، ڕووی لە لاوازی کردووە. کەوابوو ئەم جێگایەی دووبارەکردنەوەی وتاربێژیە بێ نرخەکان، دەبوو بە توندی رەخنە بکرێت، لە پێشچاوی ئەواندا زانکۆ دەزگایەکی بیرۆکراتی بوو کە بە تەواوی لە ژێر دەسەڵاتی بەهاکانی کارخانە بازرگانیەکان و نوخبە کەمەکانی دەسەڵاتدایە. هیچ کەس نکوڵی لەوە ناکات کە زانکۆ نابێت لە ژیانی کۆمەڵگای دەرەوە دوور بێت و وەك حەمامی عەقڵ، لە فەزای خۆی جیا بێت. بەڵام خوێندکاران و دواجار زۆرێك لە مامۆستایان دەڵێن بەهاکانی زانکۆ دەبێت راستەوخۆ لە بەهاکانی جیهانی بازرگانی، پارە و سیاسەت و هاوشێوەکانی جیا بێت و ئەگەر بڕیارە پێکدادانێك لە ڕووی فکری و ئاینیەوە لە نێوان ئەم جیهانانەدا ڕوویدات، لەم حاڵەتەدا دەبێت زانکۆ بتوانێت وەك لیژنەیەکی سەربەخۆ و ئەندامێکی یەکسان، بەشداری لەم وتوێژەدا بکات.

دیارە هەندێك کەس لەمە زیاتریش دەڕۆن و فەزیلەتی جۆرێك لە "دەیر" بۆ زانکۆ قایلن و دەڵێن لە جیهانێکدا کە هەر ڕۆژێك زیاتر، دەچێتە ژێر دەسەڵاتی بەها کاسبکاری و نیزامیەکانەوە، دەبێت بە تایبەتی ئومێدێکی زۆری پێ ببەسترێ، چونکە جێگەی پەروەردەکردنی بیروڕای جیاواز و گەشانەوەی زیاترە.

بزوتنەوەی خوێندکاری بەهەر شێوەیەك بووە لەو سەردەمەدا چەندان مەسەلەی گرنگ و هێشتا چارەسەر نەکراوی خوێندنی باڵای لە کۆمەڵگا پیشەسازی و دیموکراتیە تازەکاندا، هێنایە ناو بواری گشتییەوە، بۆ ئەوەی چارەسەرێکی بۆ بدۆزێتەوە. بەڵام بە هۆی بەدبینیەکەوە کە دەرئەنجامی میراتی رابردوو بوو، بە ئەندازەیەك جوڵەکەیان توند بوو کە بە توندی هێرشیان دەکردە سەر هەموو جۆرە وێنایەکی کونزەرڤاتیڤانە. لەم ڕووەوە بەشێك لەم بزوتنەوە خوێندکاریانە کەسانێك لە جدیترین نەوەکانیان، هیچ بۆ فەیلەسوفانی فرانکفۆرت، وەك هۆرکهایمەر و ئادرنۆ دانەدەنا تەنانەت بڕوایان وابوو کە ئەوانیش دەبێت وەك دەزگایەکی پاشماوەی ڕوداوی سەرمایەداری، لەناوبچن.

ئەوان لەم چوارچێوەیەدا، هاوڕێ لەگەڵ رەخنەکانی مارکۆزە تیمۆتی لیری *Timuthu Leary* دەیانویست دەسەڵاتی سیستەمی سەرمایەداری کە وەك مارێکی نۆ سەر (*Hydra*) لە هەموو شوێنێکدا ئامادەیە و چاودێرە، لەناو ببەن. سوزان سونتاگ کە لە بارەی ڤالتەر بنیامینەوە کە یەکێکە لە رەخنەگرەکانی سەرمایەداری، گوتبووی کار و بەرهەمەکانی ڤاڵتەر بنیامین دۆزینەوەی ستاتیکای شکستە، دەتوانێ ئێمە لەو ڕاستیە ناسکە نزیك بکاتەوە کە هۆی دۆزینەوە و سەرلەنوێ خوێندنەوەی بەرهەمەکانی بنیامین لە پاش شکستی بزووتنەوەی پێشڕەوی خوێندکاری *68*، جۆرێك ستاتیکای شکست و لاواندنەوەیەك بوو بۆ ئەم بزوتنەوەیە.

ناڕازیبوونی خوێندکاران بەشێوەی جیاواز، بەتەمای لەناوبردنی مۆنۆلۆگی[22] ڕەسمی و تاك ڕەهەندانەی دەسەڵاتداریێتی حوکمەکەرانی کۆمەڵگا بوو، ئەوەی کە دەبوو لە بری ئەمەش دابنرێ جۆرێك خود بەڕێوەبردنە (*Self - Management*) لە بەشە جیاوازەکاندا. بەڵام بزوتنەوەکە هیچ کاتێك بنەمای خۆ بەڕێوەبردنیان لە تیۆریەوە نەکرد بە شتێکی پراکتیکی، بەڵام ئەم بیرۆکەیە وەك ئیلهامێکی هەمیشەیی، لەلایەن زیهنەکانەوە پێشوازی لێدەکرێت و هێشتاش دەتوانێ لایەنگرانی راستەقینەی خۆی بدۆزێتەوە.

میراتی بەجێماو لە بزوتنەوەی خوێندکاری، لەژێر ناونیشانی "بیری *68*"دا لایەنی کەم لە هەلومەرجی پۆست مۆدێرندا، بەباشی قابیلی تێگەیشتن و دەرك کردنە. ئەم بزوتنەوەیە خاڵی دەرچونێکە بۆ وێنەی مرۆڤێك کە بە هێرش کردن بۆ بنیادە سەپێنراوەکان بەسەریدا، بەرگری "فرەیی گوتار" دەکات. خوێندنەوەی بیری *68*، لە قۆناغی ئێستادا خاڵی ناسك ئاشکرا دەکات کە ڕەنگە ببێتە هۆی لەناوچوونی بڕێك لەو بەدحاڵیبوونانەی کە بزوتنەوەکە بۆتە هۆی. بێگومان وێرانکردن و لێکبوردنی سیاسی کۆتایەکانی شەستەکان کە هاوکات بوو لەگەڵ بزوتنەوەی رەخنەگرانە لە زۆربەی وڵاتەکاندا، هەنوکە دەتوانێ لەپاڵ نکوڵیکردن لە دروشمی گەورە و بونیادشکێنانە، لە پاڵ نەیارێتی لەگەڵ چەمکە گەورەکان و ناوهێنانی "کۆتایی" بەسەر هەموو حەکایەتە هەقیقەت نماکاندا، جێگەیەك بکاتەوە تا گوتاری فرە و جیاواز، دەربکەوێت، بێ ئەوەی بیەوێت نەخشە یان پرۆژەیەکی کۆتایی بۆ پێشکەش بکات. ڕەنگە لەم ڕووەوە فردریك جیمسۆن راست بکات کە لە دۆزینەوەی پەیوەندی نێوان بزوتنەوەی *68* و پۆستمۆدێرنیزمدا، پۆستمۆدێرنیزم وەك میراتی هەمان بزوتنەوە، وەك "ئەنارشیزمی نوێ"[23] ناوی دەهێنێ. ئەم ئەنارشیزمە تازەیە رایدەگەیێنێت کە هەقیقەت لە هەموو شوێنێکدا هەیەو لە هیچ شوێنێکیشدا نییە. ئەم کردارخوازیە تەنها لە ڕووی لوژیکی دەرونییەوە قابیلی تێگەیشتنە.

لە کۆتاییدا و لە کۆی ئەو شتانەی لێرەدا بە کورتی باسکرا، دیسان دەگەڕێمەوە بۆ رستەکەی مارکس کە لە سەرەتای ئەم وتارەدا هێنامەوە، کە هەنوکە لە سەردەمی ئێمەدا، ئەویش نەك لەبەردەم جەستەی کوژراوی کۆمۆنەی پاریسدا، بەڵکو لەبەردەم جەستەی کوژراوی بزوتنەوەی *68*دا، بیرۆکەگەلێك کۆبونەتەوە کە بەشێوەیەکی بە زەبر و بەهێز، بیرێکی بەهێزیان لە کردارخوازی و جوڵەی کۆمەلایەتیان لەگەڵدایە. ئەم میراتە پاش شەستەکان، لە زۆرێك لە بزوتنەوەکان و بزوتنەوە خوێندکاری و ناخوێندکاریەکانی وڵاتانی دیدا، کارتێکردن و کاریگەری خۆی پیشان دا[24].

## پەراوێزەکان

*1-Marx, Engels and Linin. Anarchism and Anarcho Sandicalism, (Moscow: progress, 1974) p.56-57.*

*2*-سی. و. ای. بیگزی: دادا و سوریالیزم، وەرگێڕانی حسین ئەفشار، (تاران، نشر مرکز، *1375*) ص*59*.

*3*-دێڤید هیلد لەم بارەیەوە بە ئاماژەکردن بۆ قەیرانەکانی پاش *15* ساڵ سەقامگیری دوای جەنگی جیهانی دووهەم، ئاماژە بۆ کۆمەڵێ بەرهەمی سیاسی و فەلسەفی دەکات کە لە بەرامبەر ئەو کۆمەڵە شیکەرەوە سیاسیانەی دەیەی پەنجادا و تەنانەت سەرەتای دەیەی شەست بوو کە بە گشتی هاوکاتی خۆشبینیەکی زۆر لە بارەی یەکپارچەیی، ڕێکەوتن، سەقامگیری سیاسی و لەم

بابەتە شتانە بوو. ئەو بیرانەی کە لە بەرهەمەکانی ئاگادارە سیاسییەکانی کۆتاییەکانی دەیەی شەست و سەرەتاکانی حەفتاکاندا دەردەکەوت، کۆمەڵێ چەمك بوون کە بە گشتی نەیاری بیرەکانی پێشوو بوون. بەرهەمی زانایانی زانستی سیاسی و کۆمەڵناسی سیاسی و فەیلەسوفەکان لە ژێر کاریگەری قەیرانەکانی سەردەمدا، سەرقاڵی شتگەلی وەك هۆکانی تێکشکانی ڕێکەوتن و گونجان، لاوازی بونیادی دیموکراسی سەرمایەداری و لەناوچوونی ئابوری کلتوریەکەی بوو بوو.

دیڤید هێڵد، مۆدێلەکانی دیموکراسی، ت + عباس مخبر (تاران، ڕۆشنگران، *1369*) ص*347-345*.

*4*-بۆ ئاگاداری زیاتر لە بارەی دوو کەس لە بیریارانی قوتابخانەی فرانکفۆرت واتە هۆرکهایمەر و ئادرنۆ و پەیوەندی بیرکردنەوەیان بە بزوتنەوەی خوێندکاریەوە بگەڕێوە بۆ: بابك احمدی، خاطرات ظلمت. (تهران، نشر مرکز، *1376*).

*5*-ریمۆن ئارۆنی گەورە بیریاری سیاسی هاوچەرخ، لە بەرگی دوهەمی یادەوەریە سیاسیەکاندا، لەو فەسڵەدا کە باسی ئایدۆلۆژیەکان دەکات، بۆ بەرگریکردن لە بزوتنەوەی خوێندکاری و ڕەخنەگرتن لەوەی کە ژمارەیەك لە ئاگاداران، بزوتنەوەی خوێندکاریان بە شێوەیەك لە بونیادگەری ئاڵتۆسێری داناوە، بڕوای بە تێکەڵکردنی مارکسیزم و فرۆیدیزمە کە لە نمایشەکانی شەقامەکاندا بە ئاشکرا دەردەکەوت، بە جۆرێك کە بە بڕوای ئەو وەك چاودێرێك، هەر کاتێك خوێندکاران دەهاتنە ناو شەقامەکان، ئاڵتۆسێریەکان لەوسەریەوە ڕایان دەکرد. لۆسیان گۆڵدمانیش ئاماژە بۆ دروشمێکی خوێندکاران دژی بونیادگەری دەکات، کە لە پۆلێکدا لەسەر تەختە ڕەشەکە نوسرا بوو "گەمژەیینە! خۆ بونیادەکان ناڕژێنە ناو شەقامەکانەوە"، بگەڕێوە بۆ: لۆسیان گولدمان و دیگران. لوسیان گولدمان، گزیدە و ترجمە محمد جعفر پوینده، (تهران نشر چشمە، *1376*).

*6*-هۆرکهایمەر بە سەرنجدان لەو ڕوداوانەی کە بە هۆی خوێندکارە ناڕازیەکانەوە ئەنجام دەدرا، زمانی ڕەخنەی کردەوە و گوتی: کاتێك من نمونەی ڕەخنەگرانەم دروستکرد، هیچ بیرم لەوە نەدەکردەوە کە ڕۆژێك بیانەوێت بە کۆکتێل مۆلۆتۆف بیهێنە دی. هۆرکهایمەر لەم دەیەدا چەندان جار دژی خوێندکاران ڕاوەستا، بۆ ئەوەی لایەنەکانی بەناو هەڵخەڵەتێنەرە زێدەڕەویەکانیان ئاشکرا بکات و پیشانی بدات کە دژ بە ئەمریکایی بوونیان، بە مانای لایەنگری تۆتالیتاریزمە. لە یەکێك لەم وتارانەدا یەکێك لە خوێندکاران هاوار دەکات: "هۆرکهایمەر تۆ و تیۆرە ڕەخنەگرانەکەت بەیەکەوە مردوون". لە پاڵ هۆرکهایمەردا، سیمایەکی بەناوبانگی تری قوتابخانەی فرانکفۆرت، واتە هربرت مارکۆزە، بەرگری لە مافی سروشتی نەیارێتی، یاسای ناڕازیبوون و بیری مەزن دەکرد. هەروەها هابرماس کە تا ماوەیەکی زۆر لایەنگری ئەم بزوتنەوەیە بوو، لە کۆبونەوەیەکی خوێندکاران لە ژوینی *1967*دا بەشداریەکی چالاکی کرد و لەگەڵیاندا لە بارەی ژێر و ژورکردنی سیستەمی پەروەردە و خواستە رادیکاڵیەکانی تریاندا تەبا بوو. ئەم کۆبوونەوەیە لە پاش کوشتنی بنواهە سۆرگ، ئەو خوێندکارە لاوەی کە لە خۆپیشاندانەکەی دژی سەفەری شای ئێران بۆ ئەڵمانیا، بە گولە کوژرا بوو، ئەنجام درا و لە هەمانکاتدا گەورەترین کۆبوونەوەی خوێندکاری ئەڵمانیا و دەستپێکی بزوتنەوەی پێشڕەوی خوێندکاری بوو.

تەماشای ئەم سەرچاوەیە بکەن: ستیوارت هیوز، هجرت اندیشه انتقادی، ترجمه عزت الله فولادوند (تهران، گرح نو، *1376*) ص *195* بە دواوە.

*7*-تام. بۆتۆمر: منتقدان جامعه. ترجمە: محمد جواهر کلام (تهران، نشر سفیر، *1369*) ص*101*.

*8-Daniel Guerin, Anarchism, (New York & London: Monthly Review, 1970), pp. 158-159.*

*9-I bid, p.159.*

*10*-شۆڕشی خوێندکاران لە شەستەکاندا ڕێکەوتی وەرچەرخانێکیش بوو لە هونەری مۆسیقای ڕۆژئاوادا کە بوو بووە هاوڕێی بزوتنەوە ڕەخنەگرەکان. لەم ڕووەوە دەکرێت ئاماژە بۆ گروپی بیتلەکان (*Beatles*) و لینگ ستۆنەر بکەین کە بەرهەمەکانیان لەلایەکەوە ڕەنگدانەوەی هەست بوو، لەلایەکی دیشەوە یەکێك لە هۆکارە کاریگەرەکان بوو لە گۆڕانی فەزای فکری و سۆزدارێتی بەشێك لە لاوان کە لە شەستەکاندا بە شۆڕشەکەی خۆیان، ڕابەرێتی یەکێتی شورەویان لە بەرەی چەپدا ڕەتکردەوە، سیاسەتی ئەمریکایان لە ڤێتنامدا ریسوا کرد و کلتوری قەلندەری و بێهودەییان بەرامبەر بە دیانەتەکان و قوتابخانە فەلسەفیەکانی ڕۆژهەلات و بەکارهێنانی مادە بێهۆشکەرەکانیان، بە هێرشکردن بۆ مادیگەری ڕۆژئاوا، پەرەپێدا.

*11*-لە پاڵ چەند ڕەخنەگرێکدا کە ناوی یەکێکیان لە وتارەکەدا هاتووە، دەبێ ئاماژە بۆ گلن تیندەریش بکرێت کە سەرەڕای هاوڕێیەتی لەگەڵ ئەم ڕەخنە روکەشانەدا، خوێندکاران و بزوتنەوەکەیان تاوانبار دەکات. بە بڕوای ئەو زۆرێك لە خوێندکاران و ڕەشەکان بە دەستێوەردان لە هەقانیەتی دەوڵەتدا، فێری وانەی مەکیاڤیلیەت بوو بوون. چونکە ئەوان لە پێناوی ئاشتیدا هەلومەرجی ئارامیان دەشێوان و بە مەبەستی بەدەستهێنانی عیزەت بۆ هەمووان، سوکایەتیان بە کەسانێك دەکرد کە لەسەر کورسی دەسەلات بوون. تیندەر بە ئاماژە کردن بۆ ڕەخنەی خوێندکارانی ناڕازی لە ئەمریکادا، کە ڕەخنەیان لە شێوازی جێبەجێکردنی دەستوری ئەمەریکی دەگرت، دەنوسێ: شێوازی توتالیتاری و دیموکراتی دوورە لە ڕۆح و بونیادی دەستوری ئەمریکاوە، بەلام بینینی ئاماژەکانی لە هەستی خوێندکارانی خەباتگێڕ و ڕەشەکاندا، شتێکی ئەستەم نییە. بەهۆی شۆڕشە زانکۆییەکانەوە، چالاکی ئاسایی زانکۆکان شێواو دەنگی نەیارە کپ کراوەکان و ئەو داواکاریانەی کە قابیلی جێبەجێکردن نین، هاتنە ئاراوە. کاری لەم شێوانە بە مانای قبوڵنەکردنی کێشەی جێگیری سنورداریێتیەکان و دەرکی ماهیەتی نەبوونی ڕێکەوتنەکان و بڕیاردانەکانە. خوێندکارانی یاخی بانگەشەی ئەوەیان دەکرد کە ئەم شێوەیەی هەڕەشەکردن بە مەبەستی پاراستنی دۆخی باو و کۆی ئەو نادادپەروەری و نایەکسانیەی کە تێیدایە، هاتۆتە ئاراوە.

تەماشای ئەم سەرچاوەیە بکەن: گلن تیندەر: تفکر سیاسی، ترجمە محمود صبری (تهران: علمی و فرهنگی، *1373*) ص *74-76*.

*12*-تری ئیگلتۆن ئەم دیدە سەلبیە لە کتێبی "مقدمە بر نقد ادبی" ترجمە عەباس موخبر، دەهێنێتە ئارا و لێرەوە بەو دەرئەنجامە دەگات کە گێژاوی ناو پۆستمۆدێرنیش لە شکستی سیاسی ئەم بزوتنەوەیە بووە (واتە بزوتنەوەی *68*). ئەو لە یەکێك لە جیدیترین بەرهەمەکانی خۆیدا بە شێوەیەکی جێی سەرنج، پاشەکشێی کرد و مۆری سەلماندنی بە بەشێك لە ڕەخنەکانی شەستەکاندا، لایەنی کەم لە ڕووی هونەریەوە نا.

تەماشای ئەم سەرچاوەیە بکەن: (*Terry Eagleton, the Ideology of the Arthetic "London: Basill Blackwell,1944"*).

*13*-بە بڕوای نوسەرێك ئەوەی کە خوێندکارانی ناڕازی، لە ڕابەرە مەزنەکان بە ناوی ڕۆشنبیران، دوردەکەوتەوە، خۆی لە خۆیدا هەقیقەتێکی دی ئاشکرا دەکات. ساڵی *1968*، بە بڕوای ئەو ساڵی کۆتایی ڕۆشنبیرانی گەورەیە و خوێندکاران ئەوانیان تا ئاستی قوتابیەك هێنایە خوارەوە. چیدی هیچ ڕۆشنبیرێك نەیدەتوانی بانگەشەی هەقیقەت زانین بۆ جەماوەر بکات.

تەماشای ئەم سەرچاوەیەی خوارەوە بکەن:

-*David L. Schalk, "Are intellectuals a dying species?", in Intellectuals in politics, edited By, Jeremy Jennings ed, (London: Rouledge, 1997), pp 271-289.*

*14*–برایان ماگی، اشنایی با فلسفه غرب، ترجمه عزت الله فولادوند، (تهران، خوارزمی، *1371*)، ص *97*.

*15*–تام، باتامور، هـ. س. پ. ص*109*.

*16*–رتانه هالوب: هابرماس (نقد در حوزه عمومی) ترجمه حسین بشیریه، (تهران، نشر نی *1375*)

*17-Raymond Talid, Enemies of Hope, (London: Macmilan press, 1997), pp51-67.*

*18-Hervert Marcuse, Negations Essays in Critical Theory, (Allen and the pengun press, 1969) in introduction.*

*19*–تام، ب. باتامور، هـ. س. پ. ص*104*.

*20* –رامین جهانبگلو، نقل عقل مدرن، (تهران: نشر فرزان، *1376*)، ص *331*.

*21-Barbara Goodwin, Using political ideas (New York: John Wiley press, 1992). P.142.*

*22*–تەماشای ئەم سەرچاوەیەی خوارەوە بکەن:
محمد تقی قزلسفی، "در برابر تك گویی" روزنامه ایران، *19* خرداد *1377*.

*23*– فردریك جیمسۆن: "مارکسیزم و پست مدرنیسم" ترجمه احمد تدین، در پسامدرنیسم در بوته نقد، (تهران: نشر اگه، *1375*) ص*70*–*44*.

*24*–ئاگنس هلر، لە پێشەکی کتێبی "هەلومەرجی پۆستمۆدێرن"دا، هاوکات لەگەڵ ئاماژەکردن بۆ ئەو مەسەلەیەی کە هەلومەرجی سیاسی پۆستمۆدێرن لە ژێر کاریگەری روداوەکانی شەستەکاندایە، باسی لێکچوونی بزوتنەوەی خوێندکاری *1968* لەگەڵ جوڵەی خوێندکارانی ساڵەکانی *1979*–*1978*ی ئێران دەکات و بە دەربرینێکی تر جۆرێك لێکچوون لە هەڵوەشاندنی سیستەمی دەسەڵاتدا لە نێوان ئەم دوانەدا دەبینێ.

تەماشای ئەم سەرچاوەیە بکەن:
*Agens Heller, The postmodern political condition, (canbridge: plity press bas. 1 Black well, 1988).*

## تێبینی

وەرگێڕانی بەشێکە لە فەسڵی یەکەمی کتێبی"محمد تقی قزلسفی: بازخوانی اندیشه *68*. تهران. فرهنگ و اندیشه. *1377*".

# شۆڕشگێڕێکی توندڕەو بە بیرۆکەی "شۆڕشدا" دەچێتەوەو لێی پەشیمانە.

جۆرج تەڕابیشی

لە عەرەبییەوە: ڕەووف بێگەرد

"دانیال کوهین باندیت"، بێ چەند و چوون لەسەرکردن، دیارترین کەسی شۆڕشی قوتابیانی ساڵی *1968*ی فەرەنسایە، ئەو شۆڕشەی لە کاتی خۆیدا لە زانکۆی نانتەوە دەستی پێ کرد، ئەگەر لە دوا ساتدا ژەنەراڵ "دیگۆڵ" فریانەکەوتایە و جارێکی تر جڵەوەکەی لەدەست نەگرتایەتەوە، هەڕەشەیەك بوو لە کۆماری پێنجەمی فەرەنسا کە وابەستەی بۆشاییەکی سیاسی ڕاستەقینەیە.

شۆڕشەکە لە سەرەتادا وەك شۆڕشێکی کتومت قوتابیان دەستی پێ کرد، بەڵام کاتێك سەندیکا کرێکاریەکان چوونە ژێر ئاڵاکەیەوەو لە زیاد لە شارێکی ئەو وڵاتەدا دەستیان بەسەر کارگەکاندا گرت و جاڕی خۆبەڕێوەبردنیاندا، ئیتر بەرەو وەرچەرخانێکی پڕ لە مەترسی هەنگاوی نا.

شۆڕشی ساڵی *1968* شۆڕشێکی چەپی توندڕەو بوو، شۆڕشێك تەواو دژ بە بۆرژوازیەت و دەسەڵاتی سیاسی ڕاستڕەو. بەڵام شۆڕشێکیش بوو دژی چەپی ئارتودوکسی و نوێنەرە ڕەسمیەکەی کە پارتی کۆمۆنیستی فەرەنسا بوو. لێرەوە هەڵوێستی دژ بە یەك لەسەر کەسایەتی "دانیال کوهین باندیت" هاتە گۆڕێ. لە لایەك هەڵوێستی "جان پول سارتەر"ی سەرمەشقی ڕووناکبیرانی چەپی فەرەنسا کە پیرۆزبایی لەو خوێنە شۆڕشگێڕیە کرد کە قوتابیان نوێیان کردەوە، لە کاتێکدا ئارتودوکسیە کۆمۆنیستەکان ئەو خوێنەیان وشك کردبووەوە، لەگەڵ هەڵوێستی "جۆرج ماشیە"ی پێشەوای پارتی کۆمۆنیستی فەرەنسا. "ماشیە" لەو کاتەدا نەفرەتی لە "کوهین"ی ئانارشیستی کرد و داوای کرد لە فەرەنسا دەری بکەن.

له راستیشدا "کۆهین – باندیت" لەدایکبووی ئەڵمانیا بوو (له خێزانێکی جوولەکه که له کاتی سەرهەڵدانی نازیەکاندا له ئەڵمانیا ساڵی *1933* پەنایان هێنابوه فەرەنسا)، "کوهین" له فەرەنسادا پێگەیشتبوو، ئەندامی کۆمەڵەیەکی ئانارشیستی بچووك بوو به ناوی (رەش و سوور)ەوە. خەونی ئەم کۆمەڵەیه ئەوه بوو خوێنی تازه بکاتەوه ناو ئەو دەماره وشکەڵ هاتوانەی بیرۆکەی شۆڕش که بیروکراتیەتی ستالینی و باباویەت ناپاکیان لەگەڵدا کردبوو، که ئەو کاته پارته کۆمۆنیسته تەقلیدیەکان بەسەر چینی کرێکار و هێزه چەپەکاندا به گشتی پراکتیزەیان دەکرد.

شۆرشی پەتی، شۆڕش له پێناوی شۆڕشدا، شۆڕش له ناو شۆڕش و بەسەرشۆڕشدا: ئەمه ئەو رۆحی سەرکێشیەی قوتابیان بوو که له مەدرەجی زانکۆی نانتەوه دەستی پێ کرد و پاشان به هەموو فەرەنسا و ئەڵمانیا و هەندێك وڵاتی تری ئەوروپادا بڵاوبوەوه. زیاتر له "ئاگر بەربوونەوەیەکی شۆڕشگێڕی" دەچوو که بێ ئامانج و بێ بەرنامه بێت و بێجگه له داگیرساندنی خۆی چ مەبەستێکی تری نەبێت، بۆ بەکاربردنی ئەو هێزه شۆڕشگێڕییه خەفەکراوەی لای ئەو توێژه و لەو تەمەنەدا هەیه و، ئاسایی بۆ ئەوه دەست دەدات که ببێته سووتەمەنی بۆ هەموو سەرکێشیەکی شۆڕشگێڕی:واتا لاوان.

"کوهین باندیت" که له بزووتنەوەی ئایاری *1968*دا لاو بوو، ئێستا تەمەنی پەنجا و چوار ساڵه. جێگای ئەو شۆڕشگێڕییەی ئەوسای بەخشی به بزوتنەوەی ژینگه پارێزانی ئەوروپای سەوز. له بری "هەوەسی شۆڕش" که لەگەڵ دنیادا به زاراوەی خەون و ئیراده دەدوێت دەستی دایه (هەوەسی سیاسەت) که خۆی به دیالەکتیکی واقیع و مومکینەوه دەبەستێتەوه. "کوهین – باندیت" که بۆ ماوەی هەشت ساڵ جێگری سەرۆکی شارەوانی شاری فرانکفورت بوو لەبری سەوزەکانی ئەڵمانی و ئێستا، له ساڵی *1994*ەوه ئەندامه له پەرلەمانی ئەوروپیدا. ئایا ئێستا رابووردووی خۆی چۆن دەبینێت؟ چۆن دادگایی پێش سی ساڵی خۆی دەکات که شۆڕشی پەتی دەپەرست؟

با "کوهین" خۆی بدوێت: شۆڕش وەهمێکه له خەیاڵدانی ئەو کۆمەڵگایانەدا یاری دەکات که له راستیدا له گۆڕان زیاتر پێویستی به شتی تر نەبێت، ئەوەی له ئایاری *1968*دا روویدا شۆڕش نەبوو تا ئێمه پاڵەوانی بین، هیچ پرۆژەیەکی دیاریکراومان نەبوو، ئەوه نەبێت ئێمه له پڕا رووبەرووی کۆمەڵێك رووداو بووینەوه و خۆمان دایه دەست شەپۆلەکانی و مەستی سەرکەوتنیشی بووین. له راستیدا ئێمه شۆڕشگێڕ نەبووین، بەڵکو بیرۆکەی شۆڕش لێیدابووین، وامان دەزانی چەپڕەوایەتی ڕیشەیی هەتوانی نەخۆشیی پیریەتی کۆمۆنیستیه. هەر ئەمەیش بوو به ناونیشانی ئەو کتێبەی لەگەڵ براکەمدا له کۆتایی ساڵی *1968*دا دەرم کرد، ڕاسته. به هەرحاڵ، ئێمه وەهمی شۆڕشگێڕیی لێی دابووین، بەڵام له رووخاندنی شەرعیەتی کۆمۆنیسته چەق بەستوەکەدا دەورمان هەبوو. نه تروتیسکیی بووین نه ماوی، مارکسییەکی شیاو بووین، له فەلسەفەی مارکسیدا جارێکی تر هەندێ ئازادیمان دۆزیەوه. بۆیه هاوسۆزی بزوتنەوەی بەرهەڵستکاری شیوعیەکانی پولونیا و چیکوسلوفاکیا بووین، لەگەڵ بزوتنەوەی سۆڤیەتیەکانیشدا بووین که جیابببوونەوه. بەڵام له کاتێکدا رەخنەی ئێمه روو له پارتی کۆمۆنیست بوو بەوەی وازی له شۆڕش هێناوه، هەر له سەرەتای حەفتاکانەوه دەوری ئێمەیش گەیشت تا ماڵئاوایی له شۆڕش بکەین.

ئەمە بۆ؟ چۆن ئەم وەرچەرخانە روویدا؟ رەنگە بە نیسبەت منەوە، گەیشتن بێت بەو راستیەی سیاسەت لە ژیاندا هەموو شتێك نییە، مرۆڤیش ناتوانێت بیست و چوار سەعات بە سیاسەت و بۆ سیاسەت بژی، بێگومان شۆڕشگێڕ ئەو مرۆڤەیە هەموو ژیان و بوونی بۆ سیاسەت تەرخان ئەکات و بێجگە لە سیاسەت هیچ بۆ ژیانی خۆی ناهێڵێتەوە. مرۆڤی وایش مەحاڵە، مرۆڤێکی بێ مرۆڤایەتیە. زۆربەی خەڵکیش نایەوێت بەردەوام سیاسەت بکات، ئەو پێی خۆشە نوێنەری هەبێت و هەڵبژێرێت، کەمێکیش سانسۆر لەسەر نوێنەر و هەڵبژاردەکەی دابنێت. لێرەدا گرنگی سیاسەت دەردەکەوێت، هەر ئەمەیش رەوایەتی بە بیرۆکەی دیموکراتیەتی پارلەمانی دەبەخشێت.

ئەم هەقیقەتە سادە و روونە، لە خەونە قووڵ و وەهمە گەورەکانماندا تووشی هێدمەی کردین: خۆ بەڕێوەبردن. ئێمە وەك مارکسیەکی تەواو لەگەڵ خۆبەڕێوەبردن و ئەنجومەنەکانی کرێکاراندا بووین، بە پێچەوانەی کۆمۆنیستە ئەرتودۆکسی و مارکسییە سەرکوتکەرەکانەوە کە بروایان بە پلان دانان هەبوو. ئێمە وامان دەدایە قەڵەم پلان دانان جۆرێکی قێزەونە لە توتالیتاریەت، چونکە پێویستیەکانی کۆمەڵگا لەسەرەوەرا دیاری دەکات و، بێ ئەوەی گوێ بە بێ سەرەو بەرەیی بازاڕ بدات جۆری بەرهەم و چەندەکەی بەسەر بەرهەمهێنەراندا دەسەپێنێت. وەلێ ئاخۆ، خۆبەڕێوەبردن لە پلان دانان عاقڵانەترە؟ ئایا ئەویش سەرناکێشێتە ئەوەی بەرهەمهێنەرەکان وازبهێنن و دەستبەرداری دەسەڵاتی بڕیار بن بۆ ئەو بەڕێوەبەرانەی کە دایان دەنێن و، ئایا ئەوانیش نابنە بیروکراتی یان سەرمایەدار کە وابەستەی یاسای کێ بڕکێ و بازاڕی بن؟

ئایا ئەمە گەڕانەوە نییە بۆ سەرەتا؟

ئەمە بەو مانایە نییە کە هیچ رێگایەك بۆ سیاسەتی چەپگەرایی نەماوەتەوە، بەڵام کاتێك سیاسەت ئەو پێناسەیەی هەبێت کە شیمانەیەکە بۆ گۆڕینی ژیان بەرەو چاکتر، کەواتە پڕۆژەی چەپگەرایی دەبێت گونجاو بێت لەگەڵ واقیعدا و لەگەڵ ئەو توانایەی لە واقیعەکەدایە بۆ گۆڕینی ناوەوەی خۆی، بێ ئەوەی دابرینێکی (قطیعة) شۆڕشگێڕی هەبێت بە ناچاری لە تەوەرێکی بۆشدا بسووڕێتەوە... کەواتە دەبێت چەپ لە یەك کاتدا هەم چاکساز بێت و هەم واقیعی، مەبەستم چەپە نەك چەپی توندڕەو، چونکە تا ئێستا چەپی توندڕەو لەسەر ئەفسانەی پاکۆدانی سەرمایەداری و قڵپ کردنەوەی شێوازی بەرهەمهێنان دەژی. ئەو تا ئێستایش، وەك سەردەمی "مارکس"، لەو بیرۆکەیەوە دەست پێ دەکات کە سەرمایەداری پێویستیەکانی مرۆڤ دابین ناکات و، لە ژێر سیستمێکدا کە جیاوازیی کۆمەڵایەتی تیا بێت ریفۆرم مەحاڵە و هەرگیز پاساوی بۆ نادرێتەوە. کەواتە کورتترین رێگا و خێراتریان بۆ گەیشتن بە بەختەوەری مرۆڤ و یەکسانیان لەناوبردنی سەرمایەداریە، ئەم ئەفسانەی لەناوبردنە وەهمێکی گەورەیە لە وەهمەکان. یەکەم لەبەرئەوەی سەرمایەداری هەمان سەرمایەداری سەردەمی "مارکس" نییە، چونکە لە ژێر فشاری خەباتی چینایەتیدا سەرمایەداری ناچار بوو خۆی لە خۆیدا چاك بکات، بەم جۆرە بیرۆکەی شۆڕش توانا و رەوایەتی خۆی پێکەوە لەدەستدا، دووەمیش لەبەرئەوەی کە شۆڕشەکان هەڵناگیرسێن و پاساوی هەڵگیرسانیشیان نییە تەنیا لە کاتێکدا نەبێت کە دۆخەکان گەیشتبنە بنبەست و لە سایەی ئەو سیستمە سیاسیانەدا کە هەموو شتێك کۆنترۆڵ

بکات و هەموو تواناکانی کۆمەڵگا لە پێشخستنی شێوەی ژیان و شێوەی بەرهەمهێنانیدا بە هەندێك کاری لاوەکی و سست چارەسەر بکات. لەم حاڵەتانەدا هیچ ئەلتەرناتیڤێك نییە بۆ سەرهەڵدانەوەی مەنجەڵەکە تا توانا لە کوڵ هاتوەکان ئازادبن. لە کاتێکدا، لە کۆمەڵگا سەرمایەداریە پێشکەوتوەکاندا، دۆخی بنبەست نەماوە، لە زۆربەی ئەو کۆمەڵگایانەدا دەسەلات هاوبەشە لە نێوان راستڕەو و چەپڕەوەکاندا، ئەمەیش جۆرێك لە میکانیکیەتی دیالەکتێکی لە نێوان بنەمای ئابوری بازاڕی ئازاد و ئەوانەدا دروست دەکات کە داوای یەکسانیی کۆمەلایەتی دەکەن.

ئایا ئەمە بەو مانایەیە کە ئایدیولۆژیای چەپی شۆڕشگێڕ بە تەواویی کاریگەریی نەماوە؟ لە ڕاستیدا هێشتا هەندێك لە بەهاکانی ماوە، لە هەندێك ناوەندیشدا وەك ئەفسانەیەکی خۆتەیارکردن، وەلێ مەرج نییە ئەفسانە بگۆڕێت بە واقیع، ئەگەر ئەو گۆڕانە روویدا، تەنیا کاریگەریەکی وێرانکاریی دەبێت و هیچی دی. ئەوەی ئەمڕۆ پێویستە زیادکردنی دیموکراتیەتە، نەك دابڕانی شۆڕشگێڕی، بێگومان گوێزانەوە لە دەسەلاتێکەوە بۆ دەسەلاتێکی تر پرۆسەی دیموکراتی بە هەڵواسراوەیی دەهێڵێتەوە، تەنانەت ئەگەر شۆڕشگێڕەکان بە رێگای دیموکراتی دەسەلاتیان گرتە دەست، لۆژیکە ڕەگ ئاژوەکەیان وایان لێ دەکات بە رێگای دیموکراتی دەستی لێ هەڵنەگرن. شۆڕش لای ئەوان فریشتەیەکە، بە گۆچانە سیحریەکەی هەموو بارودۆخەکان سەرەو ژێر دەکات، خەڵکان بیانەوێت یان نا بەختەوەریان بۆ دەرەخسێنێت، ئەمە ئەو تۆوە توتالیتاریەیە کە لە هەموو ئایدیولۆژیا شۆڕشگێریەکاندا هەیە. تاقە وانەیەکیش کە دەبێت لە توتالیتاریەکانی سەدەی بیستەوە فێری ببین ئەوەیە، دەرگای دیموکراتیەتی راستەقینە، ئەگەر زۆریش تەسك بێت نابێت بە ناوی هیچ خەونێکی شۆڕشگێڕییەوە جارێکی تر دابخرێتەوە.

## سەرچاوە

الحیاة – تیارات– ژمارە *13350* ساڵی *1999*.

# مایسی 68

# مانگی شۆڕش له فه‌ره‌نسا

**ئیبیان گه‌ن**

له ئینگلیزییه‌وه‌: ئاوات ئه‌حمه‌د

رۆژی هه‌ینی 3ی مایس بانگه‌شه‌ی کۆبوونه‌وه‌یه‌ك له زانکۆی سۆربۆنی[1] پاریس *کرا*، بۆ ناڕه‌زایی ده‌ربڕین دژی داخستنی زانکۆی نانتێر[2] که رۆژی پێشوو داخرابوو. ئه‌مه‌ش دوای هه‌فته‌یه‌ك *له* به‌یه‌کدا هه‌ڵپرژانی راستڕه‌وه تونده‌کان و گروپی ئه‌و خوێندکارانه‌دا که هه‌ڵمه‌تی دژ به جه‌نگی ڤێتنامیان[3] به‌رپا کردبوو. نزیکه‌ی سێسه‌د که‌س له هه‌ڵسوڕاوانی ناو خوێندکاران ئاماده‌ی کۆبوونه‌وه‌که بوون. لای ئێواره له سه‌راپای بۆلیڤارد سانت میشیلدا[4] شه‌ڕو ئاڵۆزی هه‌ڵگیرسا، له کۆتاییه‌که‌یدا 72 پۆلیس و ژماره‌یه‌کی رانه‌گه‌یه‌ندراوی لاوان بریندار بوون، 600 که‌س گیران و له‌مه‌شه‌وه ئه‌و رووداوانه ده‌ستیان پێکرد که ئێستا له مێژووی فه‌ره‌نسادا به رووداوه‌کانی مایس ده‌ناسرێت.

به‌رپرسانی زانکۆ به بیانوی ئه‌وه‌ی که گوایه راستڕه‌وه‌کان هێرش ده‌که‌نه سه‌ر کۆبوونه‌وه‌ی خوێندکاران، بانگی پۆلیسیان کرد. پۆلیسیش سه‌ره‌تا گه‌مارۆی سۆربۆنیان دا، پاشان دوای دانوستان رێگایان دا به خوێندکاره‌کان بۆ ئه‌وه‌ی به گرووپی بیست و پێنج که‌س و نێرو مێ به جیاجیا *بڕۆن*. بوار درا ئافره‌ته‌کان بڕۆن، به‌ڵام کاتێك یه‌که‌مین گروپی پیاوان هاته ده‌ره‌وه، یه‌کسه‌ر ده‌ستبه‌سه‌ر کران و به زۆر خرانه ناو ئه‌و ڤانه‌نه‌ی پۆلیسه‌وه که له‌وێ چاوه‌ڕێیان ده‌کرد. قه‌ره‌باڵه‌غییه‌که په‌ره‌ی سه‌ند و به توڕه‌یی چووه پێشه‌وه. کاتێك یه‌که‌مین ڤان ویستی شوێنه‌که جێبهێڵێت و به‌ره‌و بۆلیڤارد سانت میشێل بڕوات، له‌وێ رێگاکه له لایه‌نی ئاپۆرای خوێندکارانه‌وه گیرابوو که سات له دوای سات ژماره‌یان زیادی ده‌کرد.

سه‌ره‌نجام پۆلیس گازی فرمێسك ڕێژیان به‌کارهێناو به‌مه‌ش یه‌که‌مین جه‌نگی سه‌رشه‌قامی

مایس دەستی پێکرد. خەڵکانێك بە قرخەقرخ و کۆکەکۆك و چاوی چووزاوەی فرمێسك تێزاوەوە بە خوارو ژوری بۆلیڤاردا بڵاوبوونەوە. بەڵام هەر زوو دیسان کۆبوونەوەو هاتنەوە بۆ ئەوەی ڤانەکان رابوەستێنن. لاوانی زیاترو زیاتر لە چاپخانەکان و کتێبخانەو کۆلێژ و قوتابخانەکانەوە هەڵقوڵان و پەیوەندییان بە گەڕەلاوژێکەوە *کرد*. پۆلیس و *CRS* (*پۆلیسی* دامرکاندنەوەی پشێویی فەرەنسیی) ناچار بوون فیشەك لە دوای فیشەك فرمێسك ڕێژەکان بتەقێنن، بەڵام هەموو جارێك خوێندکارەکان بەگژیاندا دەهاتنەوە.

رۆژی دوایی رۆژنامەو میدیاکان پڕبوون *لە* بەدواداچوونی کاردانەوە چاوەڕواننەکراوەکەی خوێندکاران. سەرسوڕمان و تێنەگەیشتنێکی تەواو بەرامبەری روداوەکان هەبوو. لە کاتێکدا *دەوڵەت* وەکو خووی خۆی لۆمەی گرووپە بچووکە گێرەشێوێنەکانی کرد، شتێك تا دەهات لە میانەی رۆژان و هەفتەکاندا زیاتر روون دەبۆوە، ئەویش بریتیە لە تورەیی و بێزارییەکی زۆر لە سەراپای کۆمەڵگای فەرەنسییدا، نەك بە تەنیا لە کۆلێژ و زانکۆکاندا، بەڵکو لە کارگەو شوێنەکانی کارکردنیشدا، هەموویان لەسەر لێواری تەقینەوە بوون.

لە چەند هەفتەی دواتردا، کۆمیتەکانی داکۆکیی و کۆمیتەکانی چالاکیی هۆڵەکانی خوێندنی کۆلێژ و قوتابخانەکانیان پڕ کرد، بۆ داواکردنی ئازادکردنی هەموو خوێندکارە زیندانیکراوەکان و سەرلەنوێ کردنەوەی سۆربۆن. وەزیرێکی حکومەت بە گاڵتەجارییەوە باسی ئەو کێشەو ناخۆشیانەی کرد کە ئەو گروپانە بەرپایان کردبوو.

رۆژی دووشەممە، شەشی مایس، ئاپۆرایەکی *20000* کەسی لەبەردەمی کۆشکی (*Denfert-Rocherau.*) کۆبوونەوە، دەستیان کرد *بە هوتاف کێشان، ئێمە گێرەشێوێن* نین ، نا بۆ سەرکوتکردن، هاوڕێیانمان ئازاد بکەن. رێپێوانەکە بە هێمنی رووی کردە سۆربۆن، دەوریشیان بە پۆلیسی *رێگرتن لە ئاژاوە* گیرابوو. لەپڕ پۆلیس لیسەکانیان راوەشاند. بەڵام رێپێوانەکە هەر لە سەر شەقامەکە لەسەر پێشڕەویەکەی بەردەوام بوو، بەڵام شوێن نەبوو پێشەنگەکەیان بۆی بچێت، پۆلیس میلیان راکێشا.

ئاپۆراکەی سەر بۆلیڤارد شیش و بەردو کەرسەکی شەقامەکەیان شکاندو دەستیان کرد بە هاویشتنیان بەرەو پۆلیسەکان بۆ ئەوەی جێگەیان پێ چۆڵ بکەن، ئەوانیش دەستیان کرد بە تەقاندنی گازی فرمێسك رێژ.

## کرێکارە لاوەکان:

رۆژی دواتر *خۆپیشاندەران چەند هێندەی دوێنێ* بوون، ئەمجارەیان بە تەنیا هەر خوێندکاران نەبوون. هەزاران کرێکاری لاو، قوتابی قوتابخانەکان، مامۆستاو موحازیرەکانیش لەوێ بوون. بۆ ئەوەی خۆیان لە پێکدادانی زیاتر لابدەن، پێشەنگەکانی خۆپیشاندەران لە ژووررووی کۆشکی ئەلیزێوە لە روباری سین پەڕینەوە، بۆ ئەوەی لەژێر کەوانەی دی ترومفدا سرودی ئینتەرناسیونال بڵێنەوە. توندوتیژی رووی نەدا. بەڵام راستڕەوەکان بەتەواویی کەللەیی ببوون.

رۆژی دواتر پڕوپاگەندەیەك بڵاوبۆوە کە دەسەڵاتداران خەریکن سەرلەنوێ نانتێر و سۆربۆن دەکەنەوە. سەرلەبەیانی رۆژی پێنجشەممە بانگەشەیەك راگەیەندرا، بەڵام کاتێك خوێندکاران

دەستیان کرد بە گەڕانەوە بۆ وانەکانیان، بینیان هێشتا هەر پۆلیس لەوێیە. وەزیری پەروەردە کردنەوەی زانکۆی راگەیاندو وتی گێرەشێوێنەکان خەریکن دەگیرێن. ئێستا لەسەر شەقام مقۆمقۆی ئەوەیە: دەبێت ئێستا چی بکرێت؟

ئێوارەی هەینی ئاپۆرایەکی گەورەتر لە بەری چەپی روبارەکە کۆبوونەوە. دیسانەوە هەوڵیان دا بپەڕنەوە، ئەمجارەیان پۆلیسی ئاژاوە هەموو پردەکانیان گرتبوو، ئاپۆراکە خۆی لە گەڕەکی لاتیندا بینییەوە، چونکە بەشێوەیەکی نارێك لە سەراپای بۆلیڤارد سانت میشێل و شەقامەکانی تری دەوروبەری سۆربۆندا قۆرت و رێگر ئامادە کرابوو. نیوەشەو تێپەڕیبوو کە توانرا وەفدێك بنێررێت بۆ سۆربۆن و داواکارییەکان رابگەیەنێت: کشانەوەی پۆلیس لە ناوچەکە، کردنەوەی سۆربۆن و ئازادکردنی زیندانیکراوەکان.

لە کاتێکدا ئاپۆراکە چاوەڕێی وەڵامی دەکرد، خەڵکانی سەر بەچینی ناوەڕاستی روو لە گەشەکردن، کە لە دامێنی بۆلیڤارددا دەژیان، خۆراك و خواردنەوەیان بۆ هێنان، ئەمەش پیشانی دا کە لە ماوەی چەند هەفتەی رابردوودا رای گشتی گەیشتۆتە چ ئاستێك.

بانگەشەیەك راگەیەندرا، ناتوانرێت هیچ گەرەنتییەك بدرێت بۆ ئازادکردنی زیندانیکراوەکان. زۆریشی پێناچێت کە پۆلیس شەقامەکان پاك دەکاتەوە.

سەعات دوو و چارەکی بەیانی پۆلیس جووڵا. توندوتیژی گەیشتە لوتکەو سەدان کەس لە هەردوولا پێوە بوون، بەڵام وەکو پەرجوویەك وەهابوو کە مردنی لێنەکەوتەوە.

رۆژی دوایی ملیۆنان کەس گوێ یان لە رادیۆ گرت و سەیری تەلەفزیۆنیان کردو ئەو وێرانکارییەیان بینی کە لەپاش روداوەکە جێمابوو: ئوتۆمبیلی سوتاو، تێکشکانی قۆرت و *تاس*ەکان، هەڵکەنرانی خشت و بەردی شەقامەکە، شوشەی شکاو، قەوانی گازی فرمێسك رێژ بەو ناوەدا بڵاوببوونەوە.

حکومەتیش بە راشکاویی زۆر پێی لێ راکێشابوو. یەکێتییە پیشەییەکان بانگەشەی رۆژێك مانگرتنی گشتییان کرد، لەگەڵ خۆپیشاندانێکی زۆر فراوان بۆ رۆژی دوو شەممە.

مانگرتن و خۆپیشاندان لە سەرانسەری وڵاتدا رێکخران و فشار خرایە سەر حکومەت بۆ ئەوەی پاشەکشە بکات. خودی سەرەك وەزیران ئازادکردنی زیندانییەکان و کردنەوەی سۆربۆنی راگەیاند، بەڵام ئەوە بەس نەبوو بۆ هێورکردنەوەی جوڵانەوەکە.

رۆژی دووشەممە لە پاریس زیاتر لە یەك ملیۆن کەس رێپێوانێکیان ساز کردو پۆلیسیش خۆی دوورەپەرێز گرت. رابەرانی یەکێتییە پیشەییەکان خۆشحاڵ بوون: کارێکیان کرد دەنگیان بیستراو بێت، حکومەت کشایە دواوەو دەبوو ژیانی ئاسایی دەستپێبکاتەوە. بەڵام وا دەرنەچوو.

سۆربۆن کرایەوە، پڕبوّوە لە خوێندکارو ئەنجومەنێکی بڕیاردان پێکهێنرا، لە سەراپای وڵاتەوە راپۆرت هات کە کرێکاران دەستیان کردووە بە چالاکی و نەخشەی مانگرتنی زیاتر داڕێژراوە، کارگەکان داگیرکران، دەوروبەری *16* ی مانگ زیاتر لە پەنجا کارگە داگیر کراو رۆژی *17* ی مانگ *200000* کەس مانیان گرت. لە *18* ی مانگدا زەبەللاحیی جوڵانەوەکە دەرکەوت، سەرۆکەکانی یەکێتی بازرگانی چالاکیەکەیان بەستەوە بە هەڵمەتی زیادکردنی کرێ و گوزەرانی باشترەوە. ئێوارەکەی دوو ملیۆن مانگرتوو هەبوو، لەماوەی پێنج رۆژدا ئەو ژمارەیە بەرزبۆوە بۆ دە ملیۆن کەس،

فەرەنسا یەکی خراو جووڵەی لێبڕا، فەرمانڕەوایی حکومەت و نوێنەرانی چین رووبەڕووی وێرانبوون بوونەتەوە.

سەرلەبەیانی هەموو سێشەممانێك، کارگەرە لاوەکانی هێڵی ئاسمانی ساد بۆ ماوەی پازدە خولەك ئامێرەکانیان دادەنا، بۆ بەردەوامبوون لە مشتومڕە دوورودرێژەکەیان لەگەڵ بەڕێوەبەرایەتیدا. رۆژی سێشەممە، *14* ی مایس، واتە رۆژی دوای بیست و چوار سەعات مانگرتنی گشتی، شتەکان زۆر جیاواز بوون. کارگەرەکان بڕیاریان دا چالاکییەکانی خۆیان فراوان بکەنەوە بۆ هەموو بەشەکان. بیست بەڕێوەبەریان لە ناو ئۆفیسەکانی خۆیاندا بەند کرد، کۆمیتەیەکی چالاکیان پێکهێناو بڕیاریان دا چالاکییەکەیان فراوان بکەنەوە.

رۆژی دواتر مانگرتن و داگیرکردنی شوێنەکان فراوانتر بوو، هەر لە کارەباوە بۆ کۆمپانیای رینۆ، کەشتی و بەندەرەکان، نەخۆشخانەکان. لە رۆژی شازدەی مانگدا، هەر هەموو شەست هەزار کارگەرەکەی کۆمپانیای رینۆ هاتنە دەرەوە و شەش بەشە سەرەکییەکەشی داگیر کران. کرێکارانی کارگەی سیتیرۆن کەوتنە جووڵەو بەندەرە سەرەکییەکانی هارڤەرو مارسیل داخران. لە هەموو شوێنێکەوە کارگەران دەستیان دایە چالاکی. ئیتر رەوشەکە بە تەواویی تەقییەوە.

لە هەژدەی مانگدا، زیاتر لە دوو ملیۆن کەس مانیان گرتبوو، بیرۆکراسیەتی یەکێتی بازرگانی بینیان کە جوڵانەوەکە لە کۆنترۆڵدا نەماوە، ناچاربوون هەوڵبدەن بۆ ئەوەی بیخەنەوە ژێر کۆنترۆڵی خۆیان. ئینجا هەموویان بانگەشەیان بۆ مانگرتنی گشتی و داواکاریی کرێی باشتر و گوزەرانی باشتریان بەرزکردەوە. وەڵامی بەرپرسان بە تەواوی جێگەی نائومێدی بوو. رۆژی چوارشەممە دە ملیۆن کەس هاتنە دەرەوە.

هەرچۆنێك بێت، بە نیسبەتی جەماوەری کرێکاران و خوێندکارانەوە، مانگرتنەکە تەنیا دەربارەی کرێ و گوزەران نەبوو، بەڵکو دەربارەی دەسەڵات بوو. بە داواکاریی دەستکێشانەوەی حکومەت و دیگۆڵی سەرکۆمار دەستیان پێکرد، بۆیە مانگرتنەکە تەنیا مانگرتنێکی ئابوری نەبوو، بەڵکو زۆر سیاسی بوو. سەرکردەکانی یەکێتیی پیشەوەران بە هەوڵدانیان بۆ کورتکردنەوەی مانگرتنەکە بۆ چەند داواکارییەکی ئابوریی، هەوڵیان دەدا مانگرتنەکە لە رەوتی خۆی لابدەن، ئەویش بە نکولیکردن لەو مەودا فراوانەی هەیبوو. *1968* جوڵانەوەیەکی کۆمەڵایەتی بوو، شۆڕش بوو.

کارکردن راوەستابوو، کارگەکان داگیر کرابوون، تەلەفزیۆن لەکار کەوتبوو، مشتومڕ لەوپەڕیدا بوو. خەڵك لەماوەی چەند سەعاتێك یان چەند رۆژێکی کەمدا ئەوەندە گۆڕانی بەسەردا هاتبوو، کە هەرگیز شتی وای بەخۆیەوە نەبینیبوو. *ئەو خەڵکانەی دوێنێ* خۆیان بە پارێزگار دادەنا، ئەمڕۆ باسی شۆڕشیان دەکرد.

لە رۆژی 24 ی مایسدا، دیگۆڵ لە تەلەفزیۆنەوە بۆ خەڵك دوا. تەنانەت ئەویش دانی بە نوشوستیهێناندا نا. ئەو پیاوێکی پیر بوو کە لێپرسراو بوو لە جیهانێکی کۆن. هەمان رۆژ دانیاڵ کۆهن بێندیت، کە سەرکردەیەکی خوێندکاریی بوو، رێگەی پێنەدرا بێتەوە بۆ وڵات، دوای ئەوەی لە گەشتەکەی هەندەرانی گەڕایەوە. پاریس شەوێکی تریشی لەناو مەتەرێزدا بەسەر بردو خوێندکارو کرێکارەکان ناڕەزاییان دەربڕی. ئەو شەوە پیاوێکی تەمەن بیست و شەش ساڵان بە پارچەی *نارنجۆك* کوژرا، ئەوەش یەکەمین مردووی روداوەکان بوو. لە

لوتکەی نارەزاییدا، ئاپۆرا وروژاوەکە ئاگریان بەردایە بۆرس، کە بینای پارە گۆڕینەوە بوو.

## شۆڕش:

دوای ئەوە شۆڕش بە راستی بەرپا بوو. ئیتر خۆپیشاندانی گەورە بوو بە شتێکی رۆژانە، کۆمیتەکانی مانگرتن تا دەهات زیاتر سەرپەرشتی جولانەوە مەدەنییەکانیان دەکرد، هەموویان یەکیان گرت و گەمارۆی حکومەتیان دا بۆ دابین کردنی سیستمێکی نوێی حکومەت. ئیتر دەسەلات بوو بە دوو بەشەوە.

لە رۆژی *29* ی مانگدا، خۆپیشاندانێکی زۆر گەورە پاریسی داگرتەوە، رەوشەکە لەدەست دەرچووبوو. دواتر بەرپرسانی حکومەت دانیان بەوەدا نا، کە گەیشتبوونە ئەو باوەڕەی چیتر ناتوانن چەند سەعاتێکی تر خۆیان رابگرن. خودی خۆپیشاندانەکە بە سەرکردایەتییەکی لەبارەوە دەیتوانی دەست بەسەر کۆشکی ئەلیزێدا *بگرێت* و دەسەلات بگرێتە دەست. بەلام بەدبەختانە ئەو چەشنە سەرکردایەتییە لە ئارادا نەبوو.

سەرکردەکانی یەکێتی پیشەوەران کەوتنە دانوساندن لەگەڵ حکومەتدا. لە وەزارەتی کاروباری کۆمەلایەتی دوو شەو و دوو رۆژ مشتومڕیان کرد.

بەپێی سەندەی تایمز، هەر گەمژەیەك بوایە دەیتوانی لەو رەوشەدا پێ لەسەر کۆمەڵێك ئیمتیازی گەورە دابگرێت. چینی فەرمانڕەوا رووبەڕووی رمان ببۆوە، دواتر سەرکردەکانی کرێکاران بە بزەوە دەرکەوتن و لیستی ئەو ئیمتیازاتانەیان پێبوو کە بەدەستیان هێنابوو: ئەمساڵ رێژەی *7٪* ی کرێ زیاد دەکات، نزمترین ئاستی کرێ سێیەك زیاد دەکات، مانگرتووەکان نیو مووچەی ماوەی مانگرتنەکەیان وەردەگرن.

جۆرجێس سێگووی سەرکردەی (*CGT*) بە فیزێکەوە رووی کردە کۆمپانیای رینۆ لە بیلانکۆرت. بەلام یەکسەر هووهای لێکێشرا و سەغڵەت کرا. لە راستیدا هەموو بەشەکانی کۆمپانیای رینۆ رێکەوتنەکەیان رەتکردەوەو کرێکارانیش بۆ خەباتێکی درێژتر دامەزران.

سەرکردەکانی یەکێتی پیشەوەران دوو ساڵیان پێچوو بۆ ئەوەی بتوانن لەگەڵ حکومەتدا بچنە سەر مێزی گفتوگۆ. گەیشتبوونە رێکەوتنێك کە یەك مانگ لەوەوبەر هەر بە خەیاڵیشدا گوزەری نەدەکرد. بەلام کرێکارەکان رەتیان کردەوە، ئەوان *گەیشتبوونە ئەم مەودا دوورەو تازە بە کەم رازی* نابن.

یەکێك لە سرودەکانی ناو کۆمپانیای رینۆ بریتی بوو لە حکومەتی گەل. ئەوانە شتێکی لە کرێی باشتر یان قسەکردن دەربارەی مافە سەندیکاییەکان زیاتریان دەویست. ئیتر سەرکردەکان، بە تایبەتی (*PCF*) چ ئاماژەیەکی لەوە زیاتریان پێویست بوو. ئەوانە ژیانی خۆیان بۆ جەنگان لەپێناوی چیدا سەرف کردووە؟ ئەگەر یەك پەنجەی تر بچونایەتە پێشەوە، ئەوا گسکیان لە دیگۆڵ[5] و سەرمایەداریتی دەداو دەیانخستنە لاوە. بەلام لە ساتی یەکلاییکردنەوەدا نوشوستیان هێنا، سەرکردایەتی هەموو شتێکی دەکرد سەرکردایەتیکردن نەبێت، جولانەوەکە بەرەو هەرەسێکی *ناچاری* برا.

لەم کاتەدا دیگۆڵ ولاتی جێهێشتبوو بۆ ئەوەی وتووێژێکی نهێنی لەگەڵ جەنەراڵ ماسوادا ئەنجام بدات، کە سەرکردەی هێزە چەکدارەکانی فەرەنسایە کە لە ئەڵمانیا جێگیر ببوون، بە مەبەستی لێ تۆژینەوەی فریاکەوتنێکی سەربازییانە دژی راپەڕیوان.

کاتێك گەڕایەوە، جارێکی تریش لە تەلەفیزیۆنەوە وتارێکی دا، وتی: وڵات لە لایەن دیکتاتۆریەتی کۆمۆنیزمەوە هەڕەشەی لێدەکرێت. بۆیە رایگەیاند کە ئەنجومەن هەڵوەشاوەتەوەو لە مانگی حوزەیرانی داهاتوودا هەڵبژاردنێکی گشتی ئەنجام دەدرێت. پێویستە کار بەشێوەیەکی ئاسایی بەڕێوە بچێت، ئەگینا حاڵەتی نائاسایی رادەگەیەنرێت و یاسای عورفی جێبەجێ دەکرێت.

هەر هەمان پاش نیوەڕۆ، کاردانەوەی یەك ملیۆن فەرەنسی بریتی بوو لەوەی برژێنە سەر شەقامەکان. دەوری پاریسیش بە هێزی سەربازی گیرابوو، تانك و دەبابە لەسەر رێگای بازنەیی دامەزرابوون. فەرمانی بڵاوە پێکردن درا بە سەرکردەکانی یەکێتی پیشەیی، هەروەها بەشێوەیەکی تایبەتیش بە سەرکردایەتی پارتی کۆمۆنیست، بەمەش ساتە شۆڕشگێریەکە بەرەو خاوبوونەوە کەوتەڕێ.

پارتی کۆمۆنیست بە سەرکردایەتیکردنی جوڵانەوەیەکی ئاوا گەورەی چینی کرێکاران، دەیتوانی بە ئاسانی دەسەڵات بگرێتە دەست، دەشبوو دەسەڵات بگرنە دەست. بەڵام کاتێك دیگۆڵ دەسپێشخەری کرد، ئەوان هیچ وەڵامدانەوەیەکیان نەبوو. کاتێك دیگۆڵ رایگەیاند کە هێشتاکە دەوڵەت ماوە، کۆمۆنیستەکان هەستیان بە خۆشحاڵی کرد (ئابوری زان، *1* ی حوزەیرانی *1968*).

## رەخسانی هەل:

(*PCF*) چووە ناو هەڵمەتی هەڵبژاردنەوە، پێشوازیی لێکرد بەوەی هەلێکە بۆ ئەوەی گەل رای خۆی *بڵێت*. *ناتوانین بزانین* تا ئەو ساتەش چۆن بیریان دەکردەوە لەوەی کە کرێکارەکانی فەرەنسا چی دەکەن. داوایان لە کرێکاران کرد دانوساندن بکەن لەسەر باشترین رێکەوتنی شیاوو بگەڕێنەوە بۆ سەر کارەکانی خۆیان.

رۆژانی دواتر، دوای ئەوەی کرێکاران هەندێك ئیمتیازی ئابوریان دەسکەوت، وردە وردە کار لە سێنتەرە گشتییەکاندا دەستی پێکردەوەو پۆلیس بە شێوەیەکی رێکوپێك دەستیکرد بە دەرکردنی داگیرکەرانی بینا رەسمییەکان. هەندێك بەرەنگارییان کردو بەمە رازیی نەبوون، بەڵام سەرکردەکانی یەکێتی پیشەیی پێشوازیان لە چوونەوە ژێر فەرمان کرد. (*PCF*) پیشوازیی کرد لە تەحەدای هەڵبژاردنییەکەی دیگۆڵ، چیتر نەیویست بگلێتە هەڵوێستی توندترەوە.

*دوای 7ی* حوزەیران، ئەوانەی هێشتا هەر بەرگریان دەکرد، هەر هەموویان پەرت و بڵاو کرانەوە، کەوتنە بەر سەرکوتکردنێکی توندوتیژانە. لە دوایین رووبەڕووبوونەوەی کارگەرانی رینۆ لە ناوچەی فلینس، قوتابیەك لە روباری سیندا خنکا، هەروەها لەکارگەی بیجۆش ساچۆك، دوو کرێکار بە گوللە کوژران.

رۆژی *12* ی مانگ حکومەت شەش حەوت رێکخراوی خوێندکاران و هەندێك گروپی چەپڕەوی قەدەغە کرد. یەکێتی نەتەوەیی خوێندکاران بانگەشەی کۆتایهێنان بە چالاکییەکانی سەر شەقامی بڵاو کردەوە بۆ ئەوەی خۆیان لە پێکدادانی زیاتر بەدوور بگرن. جوڵانەوەکە چەند بەخێرایی گەشەی سەندبوو، ئاواش دەستی کردبوو بە دامرکانەوە. ئینجا رۆژی *16* ی مانگ، سەرلەنوێ دوای سوکایەتی پێکردنێکی زۆر لە لایەنی پۆلیسەوە، سەرلەنوێ سۆربۆن گیرایەوە. لە گەڕەکی لاتینیش هەندێك پێکدا هەڵپرژان روویدا، بەڵام لەمپەرێك دانەنرا. سەرەنجام جوڵانەوەکە گەیشتە کۆتایی.

له كۆتایی حوزەیراندا گاڵەكان هەرەسیان هێنا بە تەحەداكەی پارتی كۆمۆنیست و لە هەڵبژاردندا دەنگێكی باشیان هێنا. سەرلەنوێ سیستمی سەرمایەداری كەوتەوە گەڕ.

لەبەرئەوەی لە شێنەكانەوە هەندێك مانگرتن روویاندابوو. ساڵانە كرێ بەرێژەی *5٪* زیادی كرد. پێشبینییەكان زیاتر لە هەڵكشاندا بوون. لەماوەی دە ساڵی رابردوودا، ژمارەی ئەوانەی ئوتومبیلیان هەیە ببوو بە دوو ئەوەندە، سەلاجە ببوو بە سێ ئەوەندە، تەلەفیزیۆنیش پێنج ئەوەندە.

هەرچۆنێك بێت، ئەوە هەژاری و رمانی ئابووریی نەبوو كە پەرەی دا بە شۆڕشەكە. فەرەنسە بەخێرایی مۆدێرنە دەبوو، كرێكاران و خوێندكارانیش هەندێك سوودیان بۆ پێ دەبڕا، لەگەڵیشدا خەم و پەژارەیەكی زۆر.

ئابوری ئاسان هێڵی بەرهەمهێنانی كۆمپانیای رینۆیان وەكو ئامادەیەك لە دۆزەخەوە دادەنا، كرێكارانیش لە ئاوازێكی تر دەیانخوێند. فەرەنسا لە ساڵی *1968* دا، وەك بەریتانیای ئەمڕۆ، باروتێكی ئامادە بوو بۆ تەقینەوە، ئاوازی كرژی هێڵی بەرهەمهێنان، فشار، رەنج و تەقەللا و زەحمەت. كۆمەڵگایەك بوو كە زۆری پێشكەش كرد، بەڵام لە كۆتاییدا كەمی بەركەوت.

كاتێك كرێكاران مانیان گرت، زیاتر دەربارەی مەسەلەی نان و كەرە بوو. دەربارەی هەموو ئەو خراپیانە بوو كە لە كۆمەڵگادا هەبوون، دەربارەی ئەو كلتوری بەڕێوەبردنە بوو كە هەبوو. دەربارەی سەندنەوە بوو بۆ ئەو هەموو پێداویستییە خێرایانەو ئەو هەموو ستەمكارییە. ئەمەیە هۆی ئەوەی بۆچی جوڵانەوەكە پەرەی سەند بەرەو شۆڕش.

تاكە شتێك كە پێویستی پێی بوو، بریتی بوو لە سەركردایەتیكردن، بەڵام سەركردەكانی كرێكارانیش رێك وەكو دیگۆڵییەكان لەناو رابردوودا شارابوونەوە. مانگرتنەكەی ساڵی *1968* گەورەترین مانگرتن بوو لە مێژوودا. كرێكارەكان بە نەبەزیوی گەڕانەوە بۆ سەر كارەكانیان و چەند ئیمتیازی مەزنیان بەدەستهێناو سەردەمی نوێیان ئاوەڵا كرد. بەڵام دەتوانرا زۆر جیاوازتر بێت. پێویستە كرێكاران سرووش لەم جوڵانەوەیە وەربگرن. تا ئەو رۆژە ئەكادیمییەكان، گاڵتەجاڕان، بیرۆكراسیان دەربارەی چینی كرێكاران نوسیبویان و بە هێزێكی جەنگاوەر دایان نەنابوو، بەڵكو وەكو چینێك و هیچی تر. بەڵام جوڵانەوەكە گسكی لە هەموو ئەو ئایدیایانە دا. لەو رۆژەدا شتێك زۆر روونكرایەوە، كاتێ: چینی كرێكارانی ناو كۆمەڵگایەكی سەرمایەداریی دەكەوێتە چالاكی، ئەوا لە بەزین نایەت.

## پەراوێزەكان

(*1*)سۆربۆن *Sorbonne,* ناوی یەكێك لەبیناكانی زانكۆی پاریسە، بەشێكی میللی بەكارهێنراوە بۆئەوەی گوزارشت لە تەواوی زانكۆكە بكات. ناوەكە لەناوی كۆلێجێكی ئاینییەوە خواستراوەتەوە كە لە دەوروبەری ساڵی *1257*دا، لەلایەنی رۆبەرت سۆربۆنەوە دامەزرێنراوە.

(*2*)نانتێر *Nanterre* شارێكە لە باكوری فەرەنسا، پایتەختی هەرێمی هۆتاس دی ساینە لەسەر روباری سین. شارێكی پیشەسازییەو لە پاریسەوە نزیكە، كارگەكانی ئۆتۆمبیل و كیمیاوییات و كەلوپەلی كارەبایی و پێویستییەكانی هێڵی ئاسنینی لێیەو خواردەمەنیش بەرهەم دەهێنێت. شارەكە لە دامێنی چیای ڤالێریاندایە. زانكۆی دەیەمی پاریس لەم شارەدایە. ئەم زانكۆیە لەكاتی رووداوەكانی ساڵی *1968* دا، یەكێك بوو لەسێنتەرە سەرەكییەكانی ناڕەزایی و بانگەشەی ریفۆرمی پەروەردەیی و ئابوریی

دەکــــرد. لەســــاڵی *1999* دا، دانیشــــتوانەکەی *84.281* کەس بووە.

(*3*)جەنگی ڤێتنام *Vietnam War* بریتیە لە ململانێیەکی سەربازیی لە ڤێتنام لە ماوەی نێوان ساڵانی (*1959 – 1975*)، کە ڤێتنامی باکور و بەرەی رزگاریی نەتەوەیی، لەگەڵ ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاو سوپای باشوری ڤێتنامدا درێژەی کێشا. لەساڵی *1946* ەوە هەتا *1954*، ڤێتنامییەکان خەباتی سەربەخۆییان کردووە دژی فەرەنسا. لەدوای جەنگی یەکەمی جیهانیی ڤێتنام بەشێوەیەکی کاتی دابەش کرا بۆ ڤێتنامی باکورو باشور. باکور کەوتە ژێر کۆنترۆڵی کۆمۆنیستەکانی ڤێتنامەوە. باشور کەوتە ژێر دەسەڵاتی ئەو ڤێتنامیانەوە کە هاوکاری فەرەنسایان دەکرد. ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا گەیشتە ئەو باوەڕەی لە دژی کۆمۆنیستەکان دەست وەربداتە ناو وڵاتەکەوە، لەترسی ئەوەی نەك هەموو وڵاتەکە بخەنە ژێر رکێفی خۆیانەوە، کۆمۆنیزمیش لەگەشەدا بوو، خەریك بوو باشوری ئاسیاو دوورتریشی دەگرتەوە. ئەم بۆچوونەی ئەمریکا بە ناوی "تیوریی دۆمینە" وە ناسرا. ئیتر ئەمریکا کەوتە پشتیوانیکردنی ڤێتنامی باشور. سیاسەتی سەرکوتکەرانەی ئەم حکومەتەش بووە هۆی هەڵگیرسانی شۆڕش لە باشورو بەرەی رزگاریی نەتەوەیی دروستکرا بۆ ئەوەی دژایەتی ئەو گروپانە بکات کە لەگەڵ باکوردا کۆکن و پەیوەندیی پتەویان هەیە.

لەساڵی *1965* دا، ئەمریکا هێزی سەربازیی نارد بۆ ئەوەی نەهێڵێت حکومەتی ڤێتنامی باشور هەرەس بهێنێت. بەڵام سەرەنجام مەبەستەکەی بۆ نەهاتە دی و لە ساڵی *1975* دا، ڤێتنام لە ژێر فەرمانڕەوایی کۆمۆنیستەکاندا یەکی گرتەوەو لەساڵی *1976* دا ناوی وڵاتەکە بوو بە کۆماری سوسیالیستی ڤێتنام. لەماوەی ئەو جەنگەدا نزیکەی سێ ملیۆن ڤێتنامی لە هەردوو بەشەکە کوژران، لەپاڵ نزیکەی دوو ملیۆن لاوس و کەمبۆدیشدا کە لەشەڕەکەوە گلێنرابوون. لە ئەمریکییەکانیش زیاتر لە *58.000* کەس کوژران.

(*4*)بۆلیڤارد سانت میشیل ***Boulevard Saint-Michel*** بریتیە لە شەقامی سەرەکیی گەڕەکی لاتینی.

(*5*)دیگۆڵ، چارلس ئەندرێ جۆزیف ماریا ***De Gaulle, Charles André Joseph Marie (1890-1970),*** ژەنراڵێکی فەرەنسی و پیاوی دەوڵەت بوو. ئەندازیاری کۆماری پێنجەمی فەرەنساو یەکەمین سەرکۆماریشێتی (*1969 . 1959*)

**سەرچاوە:** لەئەنتەرنێتەوە

# "هێربەرت مارکۆزە" و شۆڕش

د. فواد زەکەریا

لە عەرەبییەوە: سەردەم

**بەرایی:**

"مـارکۆزە" یەکێکـە لـە بیرمـەندە دیـار و مەزنەکانی سەدەی بیستەم.. ئەم پیاوە کۆی پڕۆژە فیکـری و فەلسـەفیەکەی خـۆی تـەرخانکرد بـۆ ڕەخنـەکردنی سسـتمی سـەرمایەداری و کۆمەڵگـەی بـەرخۆری و دەسـەڵاتی ئەقڵانیـەتی تـەکنۆلۆژی.. خوێندنـەوەی ئـەو بـۆ واقعـی تـازەی سسـتمی سـەرمایەداری، وای لێکـرد بـە جۆرێکـی دی بـیر لـە شـۆڕش و گـۆڕان و ڕووبەڕووبونـەوەی دەسـەڵات بکاتـەوە، جیـاواز لـەو تـێز و تیـۆرە باوانـەی بەرهـەمی فیکـری بیرمـەندانی سـەدەی نۆزدەهـەم بـوون، بەتایبـەتیش تـێز و تیۆرەکـانی بیرمـەندێکی گـەورەی وەك "کـارل مارکس".

"مارکۆزە" جیاواز لە تێڕوانینەکانی "مارکس" پێی وانەبوو کە هێزی گۆڕانخواز و شۆڕشگێر لە ناو سسـتمی سـەرمایەداریدا چینـی پڕۆلیتاریـا بێـت، لەبەرئەوەی پاش ئەو گۆڕانکاریە خێرایانـەی بەسەر کـۆی ئـەو سسـتەمەدا هـات، چینـی پڕۆلیتاریـا لـە هێزێکی شۆڕشگێڕەوە گۆڕدراوە بە هێزێکی پاسیڤ و کۆنسێرڤاتیڤ و بووەتە هەوێنی ئارامی و ڕاگرتنی پەلانسی سستمی سـەرمایەداری. بۆیـە هەنوکـە بـۆ دەرچون لەم واقعە پێویستە ستراتیژیەتێکی نوێ بۆ شـۆڕش و گۆڕانـی هەلومەرجەکە دابڕێژیـن و لـەودیو چینـی پرۆلیتاریـاوە بـیر لـە هـێز و توێـژی دیکـە بکەینـەوە کـە دەتوانـن ببنـە داینـامۆی شـۆڕش و هـەوێنی گۆڕان. لەو هێزە ڕادیکال و کاریگەرانـەش کە "مارکۆزە" چاوی لە سەریان بوو بۆ هەستان بە کـارێکی وەهـا، گـەنجان و خوێندکـاران و بزوتنـەوە ڕزگاریخوازەکـانی جیـهانی سـێهەم و تـەواوی ئـەو گروپانە بوو کە لە پەراوێزی کۆمەڵگەدا دەژیان و لە هـەموو ڕیزبـەندی و دیسـپلینێکی کۆمەڵایـەتیش بـە دوور بوون.

**"مارکۆزە" و گەنجان:**

پـاش ئـەوەی "مـارکۆزە" دڵنیـا بـوو لـەوەی ناکرێت ئومێدی گۆڕان و شۆڕشـکردن بـە هـێزێکی

کلاسیکی وەك پرۆلیتاریاوە گرێ بدات، بۆ گۆڕین و ژێرە و ژورکردنی واقعی کۆمەڵگەی سەرمایەداری، کەوتە سۆراخکردنی هێزگەلێکی دیکە کە توانای ئەنجامدانی ئەو کارەیان هەبێت و بتوانن ببنە ئامرازێکی عەمەلی و ئەو پرۆسەی گۆڕانە ئەنجام بدەن کە داوای دەکرد. "مارکۆزە" بەرنامەیەکی ڕون و دیاریکراوی نەبوو تا ئەو هێزانە بتوانن پشتی پێ ببەستن، بۆ گۆڕینی واقعی حاڵی کۆمەڵگەی سەرمایەداری لە وڵاتانی خۆرئاوادا.

لە شەستەکاندا و کاتێك خوێندکاران و لاوان وەك هێزێکی شۆڕشگێری نوێ هاتنە ئارا، "مارکۆزە" گرنگی زیاتری پێدان و لە پرۆژە فەلسەفی و ڕەخنەییەکەیدا شوێنگەیەکی تایبەتی پێ بەخشین. ئاوڕدانەوەی ئەم بیریارە لە گەنجان و قسەکردن لەسەریان نێوبانگێکی زۆری بۆ پەیدا کرد و گەنجانیش بە گەرمییەوە پێشوازیان لێکرد، لەبەرئەوەی دەستی هەبوو لەوەدا کە ڕۆڵێکی دیار و بەرچاوی بەخشی پێیان لە ئاڕاستەکردنی ڕووداوەکانی جیهاندا. ئەمە لە کاتێکدا بوو کە بیریارانی دی ئەم هێزەیان فەرامۆشکردبوو یاخود ڕۆڵێکی لاوەکیان پێدابوون.

"مارکۆزە" پێی وابوو شۆڕشی گەنجان زۆر بە توندی تەئکید لەو بیروبۆچونانەی دەکەنەوە کە پێشتر لە نوسینەکانیدا باسی لێکردبوو. لەو نوسینانەیدا "مارکۆزە" ڕایگەیاندبوو کە (هێزە شۆڕشگێرە تەقلیدیەکانی وەك پرۆلیتاریا بە هۆی ئاوێتە بوونی بە کۆمەڵگەی سەرمایەداری و دیسپلینکردنی لە لایەن ئەو سستەمەوە، تەواوی توانا شۆڕشگێریەکانی خۆی لەدەست داوەو تەنانەت بۆتە هێزێکی وا کە لە خەمی پاراستنی بارودۆخەکەدایە و دژی هەموو گۆڕانێکە).

"مارکۆزە" لە دوابەشی کتێبی (مرۆڤی تاك ڕەهەند)دا باس لەوە دەکات کە (ڕزگاربونی کۆمەڵگە لەسەردەستی هیچ یەك لەو گروپانەوە نابێت کە لەلایەن سستمی سەرمایەداریەوە دیسپلین کراون، بەڵکو کارێکی وا لە ڕێی گروپە پەراوێزخراوەکان و چەوساوەو ئەو هێزانەوە ئەنجام دەدرێت کە لە دەرەوەی بازنەی پرۆسەی بەرهەمهێناندان).

زۆرێك لە نوسەران ئەم بۆچونانەی "مارکۆزە" یان وەها لێکدایەوە کە تەعبیرە لە دەستەوستانی و نائومێدیەکی قوڵ دەرهەق بە ئەنجامدانی گۆڕانکاریەکی ڕاستەقینە لە هەناوی کۆمەڵگەی سەرمایەداریدا، بەڵام گەنجان پێشوازیان لێکرد و وایان لێکدایەوە ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەوان بونەتە میراتگری ڕاستەقینەی ڕۆحی شۆڕش لەسەرتاسەری جیهاندا.

ئاساییە کە بۆچونێکی وا لەناو گەنجانی دنیادا و بە تایبەتیش لە ناو وڵاتە پیشەسازیە پێشکەوتووەکانی وەك وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و ئەوروپادا ڕەواج پەیدا بکات، چونکە گەنج لەو وڵاتانەدا لە ڕووی دەرونیەوە ئامادەی ئەوەی تێدایە ئەو بۆچونە قبوڵ بکات کە (ئەو کائنێکی نەخواستراو و تەریك کراوە و گەورەکانیش گوێی بۆ ڕاناگرن و هیچ ڕۆڵێکیشی نادەنێ لە دیارکردنی ڕەوتی ڕووداوەکاندا).

ڕەنگە یەکێك لە کێشە سەرەکیەکانی هەرزەکاران لەو وڵاتانەدا ئەوە بێت کە گەورەکان گوێیان لێناگرن و خەمساردن بەرامبەریان، لەبەرئەوەی گەورەکان تەواوی تواناکانی خۆیان لە پرۆسەی بەرهەمهێناندا بە خەرج دەدەن و ئەمەش دەرفەتی ئەوەیان بۆ ناهێڵێتەوە تا لەگەڵ نەوەکانیاندا کۆببنەوەو چارەسەری کێشەکانیان بۆ بکەن. لێرەوە کاتێك بیریارێکی وەکی "مارکۆزە"

وەرگرتووە. تەنانەت ئەگەر قبوڵی ئەوە بکەین کە هابرماس بە دروستی بنەما سایکۆلۆجیەکانی نارەزایی خوێندکارانی دەرك کردووە، وەك کلاوس ئۆفە دەڵێت، ئەمە بە مانای ئەوە نییە کە ئەو دەرئەنجامانەی کە هابرماس لەم باسەوە سەبارەت بە تواناکانی بزوتنەوەکە وەریدەگرێت، بە ناچار دروست بێت[14].

بە کورتی ئۆفە بەڵگە دێنێتەوە کە کاریگەری بزوتنەوەکە پێویست ناکات کورت بکرێتەوە بۆ رۆشنگەری هەمەکی و یان سیاسیکردنی بواری گشتی، بەڵکو ئەم کاریگەرییە پەیوەندی بە شیکردنەوەکانی خوێندکارانەوە هەیە بۆ هەلومەرج و چۆنێتی بەرخوردی بەشەکانی تری خەڵکی لەگەڵ خواست و کاردانەوەکانیاندا. وەك ئۆفە دەڵێت ئەو مەسەلانەی کە چەپی نوێ وروژاندویێتی، خاڵی دەرچوون و دەرئەنجامی سەرو هەر جۆرە وێنایەکی تاك رەهەندانەی سایکۆلۆجی کۆمەڵایەتی دەبێت.

لە لایەکی دیکەوە رونکردنەوە سایکۆلۆجیەکانی هابرماس لە بەڵگاندنی پێنجەمدا، باسی ئەوە دەکات کە چالاکی خوێندکاری ماهیەتێکی نیورۆتیکی و دەرون پەرێشانەی هەیە. بەشێوەیەکی گشتی هابرماس بەڵگە دێنێتەوە کە جۆری کردارە نارازیەکان، شێوەی پەرەسەندوویی نارازیی تایبەتی گروپێکی تەمەن تایبەتە و پابەندبوونی بەردەوام بەم جۆرە چالاکیانەوە دەلالەت لە سیفەتی منداڵانە دەکات. لەگەڵ ئەمەشدا لە هەلومەرجێکدا کە پێدەچێت قەیراناوی بێت، سروشتە نیورۆتیکیەکان، دەردەکەون. بەڵام یەکێك لە رەخنەگرەکان بە ناوی "فۆرێۆ سروتی" بەڵگە دێنێتەوە کە ئەگەر وابوایە، واتە گەر نارەزایی خوێندکاران بە راستی قابیلی کورت کردنەوە بوایە بۆ سروشتی دەروونی تایبەت لە رەفتارێکی نیرۆتیکیدا، ئایا هەر خوێندکاران دەیانتوانی لە بوارەکانی تری کۆمەڵگادا ئەم هەموو سەرکەوتنە بەدەست بهێنن[15]. جگە لەمەش تەنانەن گەر جێگەیەکیش بۆ کاریگەری نەخۆشی دەرونی دابنێین، ئایا نابێت لەبری رەخنەگرتن لەو کەسانەی توشی ئەم پەشێویانە بوون، ئەو کۆمەڵگایە رەخنە بکەین کە بەرپرسیاری دروستبوونی ئەم پەشێویە دەرونیانەیە؟ لایەنی کەم ئەوەی کە هابرماس بە بەکارهێنانی ئەم قەدبرە سایکۆلۆجیانە، لە بری شیکردنەوەی سیاسی توشی کەم و کوری بووە. هابرماس بە قبوڵکردنی پێوەرە گومانلێکراوەکانی کۆمەڵناسی و دەروونناسی بۆ نەخۆشی دەرونی و تەندروستی دەرونی بە شێوەیەکی نارەخنەگرانە، ئەو بەشدارییەی کە هابرماس خۆی لە دروستکردنی تیۆرەی رەخنەگرانەی کۆمەڵگادا هەیبووە، بە فیرۆ دەدات. تەنانەت گەر بایەخێکی رێژەیی بۆ شیکردنەوە سایکۆلۆجیەکانی حاڵەتی دەرونی و دەرئەنجامەکانی ئەم حاڵاتانە، لە روانگەی شێواز و ئامانجەکانەوە کەم و کورە.

رەنگە فراوانترین باسی رەخنەگرانە کە لە کتێبی "چەپ وەڵامی هابرماس دەداتەوە"دا هاتووە، پەیوەندی بە بایەخی روانگە و دیدی مارکسیانەی هابرماسەوە بێت. هابرماس بەڵگەی هێنابۆوە کە بزوتنەوەی خوێندکاری پابەندی میراتێکی سڕاوەیە کە میراتی سەدەی نۆزدەهەمە. گرنگترینی ئەم تێروانینانە یەکێکیان تیۆرەی قەیرانە کە لەسەر بناغەی نرخی کار، دوهەمیان وێنای ململانێی چینایەتیە، وەك بزوێنەری مێژوو، سێهەمیش بە یەکسان تەماشاکردنی بزوتنەوە نارازییەکانی جیهانی یەکەم و جیهانی سێهەمە. یەکێکی دی لە رەخنەگران بە ناوی ئەنسلم نوسیوس دەڵێت کە رێکخراوی بزوتنەوەی خوێندکاری (*SDS*) ئەم جۆرە

تێڕوانینانە وەك پاشماوەی دۆگمە کۆمۆنیستیەکان رەد دەکاتەوە، تەنانەت دێرینترین گروپی مارکسی بزوتنەوەی خوێندکاری، ئەم تێڕوانینە هەمەکیانە قبوڵ ناکات[16] لە راستیدا دەکرێ خاڵە سەرەکیەکانی بەڵگاندنەکانی هابرماس دژی ئەوەی ئەو بە هەڵوێستی سیاسی بزوتنەوەکەی دادەنێ، راستەوخۆ لە خودی بڵاوکراوەکانی ڕێکخراوی خوێندکارییەوە دەربهێنین. ئەو تیورەیەی کە وابەستەیی ئابووریی راستەوخۆ لە تێڕوانینە ئەمڕۆییەکاندا بۆ ئیمپریالیزم، چیدی گرنگیان نییە لە شیکردنەوەکانی ڕێکخستنی خوێندکاریدا بۆ جەنگی ڤێتنام هێنراوەتەوە. هەروەها رەنگە گرنگترین بیری بزوێنەری بزوتنەوەی خوێندکاری ئەوە بوو بێت کە چیدی ململانێی چینایەتی لەناو جەرگەی چالاکی شۆڕشگێڕانەدا نییە. دیارە دەبێ هابرماس ئاگای لەم تێڕوانینانە بە تەواوی هەبێت، چونکە تیۆرەکانی هربرت مارکیوز کە پاڵپشتی تیۆرەکانی هابرماس خۆیەتی، لە دروستکردن و پەروەردەکردنی چەمکی گروپە پەراوێزیەکاندا گەلێك کاریگەر بوو، وە هەر ئەم چەمکە بە سەرچاوەی رەوایەتی تیۆری چەپی نوێ دەژمێرێت. ستراتیژی بنەڕەتی لە کۆی چالاکیەکانی بزوتنەوەی خوێندکاریدا، لە خەبات دژی دەزگای بڵاوکردنەوەی شپرنگەرەوە بیگرە تا ناڕازیبوون دژی یاسا لەناکاوەکان، تەنها کاتێك مانا پەیدا دەکات کە ململانێ لە نێوان بۆرژوازی و پرۆلیتاریادا چیدی بە هۆکاری سەرەکی رزگاریخوازی دانەنێین.

زۆرێك لە نوسەرانی کتێبی ناوبراو لە تەعمیمەکانی هابرماس لەبارەی بزوتنەوەی خوێندکاریەوە ناڕەزایی دەردەبڕن. پیتر برۆکنەر سێ گۆڕانی سەرەکی کە یارمەتی دروستبوونی ڕێکخراوی خوێندکارانی داوە، بەم شێوەیە ڕوون دەکاتەوە: یەکەم گەڕانەوەی سیستەمی سەرمایەداری لە ئەڵمانیای پاش جەنگی جیهانی دوهەمدا، دوهەم گۆڕانی هەڵوێستی حیزبی سۆشیال دیموکرات لە نەیارێتی رژێمی باڵادەستدا و سێهەم شۆڕش و یاخیبونەکانی دژ بە دەسەڵاتخوازی لە ئاستی تاکدا[17]. ئەو بڕوای وایە کە نابێت بە شێوەیەکی یەکسان بڕوای ئەندامانی ڕێکخراوی خوێندکارانی سۆشیالیستی ئەڵمانی و کارەکانیان و ئامانجەکانیان، هەڵسەنگێنین. رەخنەگرانی وەك هابرماس لەبارەی گونجان و هاوبەستەیی ڕێکخراوەییەوە کە کراوەتر و پڕ ناکۆکیترە، زیادەڕەوی دەکەن. رەخنەیەکی هاوشێوە لە سەرەتای وتاری نوسەرێکی تردا بە ناوی "هربرت لدەر" هاتووە کە هابرماس تاوانبار دەکات بە قبوڵکردنی ئینفیعالی و نارەخنەگرانەی بەدحاڵیبونەکانی ڕۆژنامە بۆرژوازیەکان. بەپێی ئەم تێڕوانینانە هابرماس لەبری پێشکەشکردنی وێنەیەکی ورد بۆ پێکهاتەی کۆمەڵایەتی و چالاکیەکانی بزوتنەوەی خوێندکاری، هەمان ئەو چەمکە سواوانە دەسەلمێنێ کە بۆ بێبایەخ کردنی بزوتنەوە رەخنەگرە رەواکان، بەکاردەهێنرێن. ڕێکخراوی دیموکراتی بزوتنەوەی خوێندکاری و نەیارێتی بنەڕەتی لەگەڵ هەلومەرجی وەستاوی هەبووداو وتوێژە تیۆریەکانی، فەرامۆشکراوەو لەبری ئەوە گرنگی بە توڕەیی سۆزدارانەی ڕێپێوانەکان و خۆپیشاندانە گشتییەکان دراوە[18].

بەڵام زۆرێك لە رەخنەگرانی هابرماس لەسەر ئەو باوەڕەن ئەو لە قسە تەعمیمیەکانیدا و رەخنەگرتنی لە دۆگمایەتی ڕێکخراوی خوێندکاری، خۆشی گرفتاری هەندێك گریمانەی دۆگمایی یان لایەنی کەم ساویلکانەیە. بۆ نموونە "ئۆکهارت کریپندرۆف" کە رەخنەگرێکی ترە، تێڕوانینی

هابرماس بۆ سیاسەت بە تیۆروانینێکی کلاسیکی دەزانێت. لەسەر ئەم بناغەیە ئۆکهارت رونی دەکاتەوە کە بۆچی هابرماس ناتوانێ لە توانا سیاسیەکانی شێوازە تازەکانی ناڕازیبوون تێبگات و دەسەلاتی بزوتنەوەی خوێندکاری بۆ ئەرکێکی لیبراڵی و پەروەردەیی و ڕۆشنگەری کورت دەکاتەوە. تیۆروانینی ئەو بۆ فاشیزمیش سنوردارە، چونکە ئەو تەنها شێوەی توندڕەوی ناسیۆنال سۆشیالیزم لە ژێریدا دەهێنێتەوە[19]. رایمۆت ریشە (یەکێکی دی لە نوسەرانی کتێبەکە) هۆی شیکردنەوە سیاسیە کەموکورەکەی هابرماس دەگەڕێنێتەوە بۆ لەبەرچاونەگرتنی گرنگی و بەهای سیاسی کردارە ناعەقلانیەکان. بە بڕوای ئەو هەست و سۆزەکانیش دەتوانن کارێکی تایبەتی پێشکەوتوخوازانەیان هەبێت، خەیالات و تەسەوراتی خوێندکاران کە خۆیان بە هاودەردی ویتکونگەکان و گروپە ستەم لێکراوەکانی جیهانی سێهەم دەزانن، نەك هەر سودمەندە، بەڵکو پێداویستی پاراستن و بەردەوامی ناڕازیبوونی کاریگەر و دروستکەرە[20]. زۆرێك لە رەخنەگرانی ناوبراو، لەوانە نویسوس رەخنە لەو وتەیەی هابرماس دەگرن کە خوێندکاران واقع و سومبولەکانیان تێکەڵکردووە. نویسوس بێ نکوڵیکردن لە جیاوازی ئەم دوانە، بەڵگە دێنێتەوە کە جیاکردنەوەو جیاوازیکردنیان بێ رەچاوکردنی ساتەوەختەکانی تێکەڵبوونیان بە هەمان ئەندازەی بە یەکسان تەماشاکردنیان نادیالیکتیکە[21].

لە پشت هەموو ئەم تیۆروانینانەوە تێزێك هەیە کە "نگت" لە پێشەکیەکەی خۆیدا بە ئاشکرا دەریدەبڕێ، ئەویش ئەوەیە کە هابرماس هەروا پابەندی تیۆروانینێکی کلاسیکیە بۆ گۆڕانی شۆڕشگێڕانە[22]. گەرچی ئەو بایەخ و بەهای شیکردنەوەی مارکس بۆ هەلومەرجی هەنوکەیی رەد دەکاتەوە، بەڵام گریمانەی بنەڕەتی بیری ئەو ئەوەیە کە شۆڕش بە ناچار هەڵگری ململانێی چینایەتی دەبێت بە شێوە کلاسیکیەکەی. خوێندکاران تەنها دەتوانن بە ئەرکی ڕۆشنگەری هەڵسن، چونکە ئەوان بە مانای دروستی وشە چین نین و ناتوانن ببن بە نوێنەری مێژوو، مارکس ئەو دەورەی بۆ پرۆلیتاریا دانابوو. یان دەکرێ بگوترێ چیدی هابرماس بڕوای بە هیچ نوێنەرێك بۆ گۆڕانی واقعی لە مێژوودا نییە، یان ئەو بە شێوەیەکی شاراوە هەروا پابەندی تیۆروانینێکی کلاسیکیە بۆ شۆڕش. ئەگەر گریمانەی یەکەم راست بێت، لەم حاڵەتەدا ئەو یان لیبرالێکی ریفۆرمخوازە یان سۆشیالیستێکی نائومێد. ئەگەر گریمانەی دوهەم راست بێت، ئەوا لەم حاڵەتەدا ئەو هەروا پابەندی تیۆروانینێکی سواو یان وەهمی یۆتۆپیاییە. لە هەردوو حاڵەتدا دەکرێ هابرماس بە کەموکوری لە جێبەجێکردنی تیۆروانینی خۆی بۆ شۆڕش لەگەڵ پێداویستی و هەلومەرجەکاندا، تاوانبار بکەین.

## پیاچوونەوە بە ماتریالیزمی مێژووییدا

هەر چاودێرێکی بێلایەن دەبێت تا ڕادەیەك دان بە ڕاستی ئەو دوا رەخنانەی سەرەوەدا بنێت کە لە تیۆروانینی هابرماس گیراوە. بێگومان دەکرێت بەڵگاندن و تیۆروانینەکانی جێی رەخنەی هابرماس، لە نوسین و وتەکانی هەندێك لە رابەرانی بزوتنەوەی خوێندکاریدا بدۆزینەوە. بۆ نمونە ئەگەر سەیری بەرهەمەکانی دۆتچکە بکەین دەبینین کە ئەو بەردەوام بەدوای دروستکردنی پەیوەندی لە نێوان خەباتە کۆمەڵایەتیەکانی ئەڵمانیا لەگەڵ بزوتنەوەکانی جیهانی سێهەمدا دەگەڕێت و زۆرێك لە گروپەکانی نزیك لە جۆرەکانی حیزبە

کۆمۆنیستەکانەوە کە لایەنگری هێڵی فکری مائویستی، ترۆتسکیستی و یان مارکسیست – لینینی بوون، باسی نزیکی رودانی قەیرانیان لە سەرمایەداری و گرنگی بنەڕەتی پرۆلیتاریا دەکرد. بەڵام بەشێوەیەکی گشتی بزوتنەوەی خوێندکاری لەژێر کاریگەری بیروڕا نوێخوازەکاندا بوو کە نەیاری دۆگمەکانی حیزبە جێگیرەکان و کۆمۆنیستە ئەرسۆزکسەکان بوون. لە راستیدا ناڕەزایی خوێندکاران بە هەمان ئەندازە کە لەژێر کاریگەری مارکس و ئنگلزدا بوو، لە ژێر کاریگەری هەڵوێستە نائەرسۆزێکسەکانی قوتابخانەی فرانکفۆرتیشدا بوو. وەك "نگت" لە پێشەکی "چەپ وەڵامی هابرماس دەداتەوە"دا رایگەیاندووە و هەروەها رۆژنامەکان بەردەوام جەختیان لێدەکردەوە، هابرماس خۆی هەندێك لە سەرچاوە سەرەکییە فکریەکانی رێکخراوی خوێندکاری و ئیلهام بەخشی بووە. کەوابوو دەکرێ موداخەلەکانی لە دوو بڕگەی هەستیاری ژۆینی *1967* و *1968*دا نەك هەر بە روبەڕووبونەوەی دیدە دۆگمایەکانی بزوتنەوەی خوێندکاری دابنرێ، بەڵکو دەکرێ ئەو موداخەلانە بە بەشێك لە وتوێژی فکری ئەو لەگەڵ نەریتی مارکسیدا دابنرێ. بە تایبەتی دەبێ تێڕوانینەکانی ئەو لە بارەی مارکسیزمەوە، هەم وەك دەرئەنجامی هەڵوێستە تیۆریەکانی لە کۆتایی شەستەکاندا و هەم وەك بناغەی "پیاچونەوە بە ماتریالیزمی مێژوویدا" لە بەرهەمەکانی حەفتاکانیدا دابنرێ.

ماتریالیزمی مێژوویی پێویستی بە پیاچونەوە هەبوو، چونکە چوارچێوە تیۆریەکەی بۆ سەلماندنی ئامانجە بەرزەفڕەکانی نەگونجاو دەهاتە بەرچاو. زاراوەی "ماتریالیزمی مێژوویی" گەرچی بە شێوەیەکی سەرەکی دەگێڕێتەوە بۆ مارکس، بەڵام زۆرتر ڕەنگە دروستکراوی ئەنگلز بێت. ئەنگلز لە پێشەکی "سۆشیالیزم: جۆری خەیاڵی یان جۆری زانستی"دا (*1892*) هێناویەتیەوە کە ماتریالیزمی مێژوویی: "جەخت لەسەر ئەو پرۆسەیەی مێژوو دەکات کە بەدوای دوا هۆ و هێزی بزوێنەری مەزنی کۆی روداوە مێژووییە گرنگەکان لە پەرەسەندنی ئابوری کۆمەڵگا، لە گۆڕانەکانی سیمای بەرهەمهێنان و ئاڵوگۆڕ، لە دابەشکردنی کۆمەڵگا بۆ چینی دیاریکراو و لە ململانێی نێوان ئەم چینانەدا، دەگەڕێ"[23].

کەوابوو ماتریالیزمی مێژوویی هەم دژی تیۆرەی "ماتریالیزمی" ڕووت و سادەیە کە جەخت لەسەر یەکەمێتی مادە دەکات و هەم نەیاری تیۆرەی ئایدیالیزمی مێژووییە کە بەشێوەی فەلسەفەی هیگڵ، بواری بیر یان زیهنی مرۆڤ بە ئەنگێزە و بزوێنەری پێشکەوتنی مێژوویی دادەنێ. ئەوەی لە پێناسەکەی ئەنگلزدا بۆ ماتریالیزمی مێژوویی دەردەکەوێت ئەوەیە کە بناغەی ماتریالیزمی مێژوویی، لە بواری ئابوریدایە. کەوابوو ماتریالیزمی مێژوویی تا ئەو شوێنە مادیگەرە کە بەرهەمهێنان و دوبارە بەرهەمهێنانەوەی ژیانی مادی، بە هۆکاری یەکەم لە تەفسیرکردنی ژیانی مرۆڤدا دادەنێ، وە تا ئەو جێگەیە مێژووییە کە بڕوای بە پێشکەوتن و پەرەسەندنی جۆرە جیاوازەکانی رێکخستنی ئابوری کۆمەڵگا، بەدرێژایی مێژوو هەیە و هۆکارێك دەدات بە دەستەوە کە بەهۆیەوە دەکرێ گۆڕان لە سیمای بەرهەمهێنانی ئابوریدا، وەك دەرئەنجامی ململانێی چینە جیاوازەکان روون بکرێتەوە.

بەناوبانگترین روونکردنەوەی مارکس لەبارەی ماتریالیزمی مێژووییەوە لە "پێشەکیەك بۆ رەخنەگرتن لە ئابوری سیاسی"دا (*1859*) هاتووە[24]. لێرەدا مارکس پێشگریمانە هەمەکیە تیۆریەکانی خۆی دەدات بە دەستەوە. مرۆڤەکان لە هەر

کۆمەڵگایەکدا بە شێوەیەکی سەربەخۆ لە ئیرادەی خۆیان، لەناو دەرونی پەیوەندیەکانی بەرهەمهێناندا، هەنگاو دەنێن کە گونجاوە لەگەڵ قۆناغێکی تایبەت لە پەرەسەندنی هێزەکانی بەرهەمهێنانی مادیدا. مەبەستی مارکس لە هێزەکانی بەرهەمهێنان، هۆکارە مادی و نامادیەکان، واتە کەرەستە خامەکان، ئامێرەکانی بەرهەمهێنان و هێزەکانی کارە (کە هەموو داهێنانە روو لە زیادەکانی کارایی لە بەرهەمهێناندا دەگرێتەوە). پەیوەندیەکانی بەرهەمهێنان لە ڕاستیدا پەیوەندیەکانی موڵکایەتی یان کۆنترۆڵی کاریگەری تاکەکان بەسەر هێزەکانی بەرهەمهێنانداو، هەر لەو روەشەوە بەسەر هێزی کاری کەسانی دیدایە. پەیوەندی و هێزەکانی بەرهەمهێنان پێکەوە ژێرخانی ئابوری کۆمەڵگا پێکدەهێنن کە دیاریکەری شێوەکانی هوشیاری تاکەکان و هەروەها سەرخانی یاسایی و سیاسیە. بەم مانایە بناغەی مادی کۆمەڵگا یەکەم و بنەڕەتیە، لە کاتێکدا کە سەرخان و هوشیاری لاوەکیە. پێشکەوتنی مێژوویی بەپێی ململانێ بنەڕەتیەکان لە بناغەی ئابوریدا و چارەسەرکردنیان، پێناس دەکرێت. کاتێك هێزەکانی بەرهەمهێنان لەگەڵ پەیوەندیەکانی بەرهەمهێناندا دەکەونە دژایەتیەوەو پەیوەندیەکانی بەرهەمهێنان وەك ڕێگرێك لەبەردەم پەرەسەندنی زیاتری هێزەکانی بەرهەمهێناندا کاردەکەن، قۆناغێك لە ئاژاوە و شۆڕشی کۆمەڵایەتی دێتە ئاراوە. چارەسەری دژایەتی نێوان هێزەکان و پەیوەندیەکانی بەرهەمهێنان، سیمایەکی تازەی بەرهەمهێنان دروست دەکات کە تا قۆناغی دەستپێکردنی ململانێیەکی تازە بەردەوام دەبێت. تەنها بە دەرکەوتنی سۆشیالیزم "پێش مێژوویی" مرۆڤایەتی دواجار کۆتایی پێدێت.

هابرماس بەردەوام دیدێکی دوولایەنەی بۆ ئەم تێڕوانینە بۆ ماتریالیزمی مێژوویی هەبووە. ئەو وێنەیەی تام راکمۆر بۆ گۆڕانی هێڵی بیری هابرماس کێشاویێتی، بە تەواوی هەڵە نییە. بەپێی ئەم وێنەیە هابرماس بە شێوەیەکی روو لە زیاد لە تیۆرەی ماتریالیزمی مێژوویی نائومێد دەبێت و دواجار بە تەواوی وازی لێ دێنێ و لە بریدا تیۆرەی کرداری پەیوەندی، دەهێنێتە پێشێ[25].

بەڵام وێنەیەکی وا ئەو خاڵە لەبەرچاو ناگرێت کە هابرماس هەمیشە دوراودور خۆی بە هاوبیری مارکس زانیوە. لە هیچ شوێنێکدا تیۆرەی مارکسی بە راشکاوی و راستەوخۆ، رەد ناکرێتەوە. هابرماس سەرەڕای هەندێك تێڕوانینی جیاوازی خۆی، بەڵام هیچ کاتێك خۆی نەخستە دەرەوەی ئەو نەریتە رەخنەگرانەیەی کە بە رەخنەگرتنی مارکس لە هیگڵ و فەلسەفەی ئایدیالیستی دەستپێدەکات و ئاڵۆزترین شێوەی بەردەوامی ئەم نەریتە دەتوانین لە نوسینە سەرەتاییەکانی جۆرج لۆکاش و بەرهەمەکانی قوتابخانەی فرانکفۆرتدا بدۆزینەوە. بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا هیچ کاتێکیش هابرماس خۆی بە پابەندی بنەماکانی ماتریالیزمی مێژوویی بەو شێوەیەی کە لە بەرهەمەکانی مارکسدا هاتووە، نەزانیووە. ئەو بەتایبەتی وەك نەوەی یەکەمی قوتابخانەی فرانکفۆرت، بیری ژێرخانی ئابوری دەستنیشانکەر، رەد دەکاتەوە. لەگەڵ ئەمەشدا هابرماس لە کۆمەڵە وتارێکدا بە ناوی "پیاچونەوە بە ماتریالیزمی مێژوویدا" (*1976*) لە کاتێکدا کە بناغەی تیۆرەی ئابوری مارکس، واتە تیۆرەی نرخی کار، رەد دەکاتەوە، دیسان بڕوای وایە کە "گۆڕانی بونیادە سروشتیەکان، هەروا بەستراوە هەم بە تەحەدا روو لە پەرەسەندنەکانی کە بە هۆی مەسەلە ئابوریە چارەسەرنەکراوەکانی کۆی سیستەمەوە

دێنە پێشێ و، هەم بە پرۆسەی پەروەردەکردنەوە کە کاردانەوەیەکن بەرامبەر بەو مەسەلانە"[26]. ئەم تێڕوانینە ئاڵۆز و دولایەنیە، خەسڵەتی سەرەکی دیدی هابرماسە بۆ تیۆرەی مارکسی، تەنانەت لە بەرهەمەکانی دوایی خۆیدا کە دەوری مارکس تیایدا ئەوەندە بەرجەستە نییە، هیچ کاتێك هەوڵنادات کاری خۆی لە نەریتی پێشکەوتوخوازانە کە بە مارکس دەستپێدەکات جیا بکاتەوە.

هابرماس بە گشتی لە هەمان سەرەتای کاری خۆیدا، تیۆرەی مارکسی بە تیۆرەیەکی تاك ڕەهەندی و نەگونجاو بۆ تاوتوێکردنی دیاردەکانی سەرمایەداری سەدەی بیستەم، دادەناو، بە هەرحاڵ وەك تیۆرەیەکی گشتی لەبارەی کۆمەڵگاوە، بە کەموکوڕی زانیوەوە. ئەم خاڵە بە تایبەتی لە کتێبێکدا بە ناوی "تەکنەلۆژیا و زانست وەك تەکنەلۆژیا" (*1968*) کە لە گەرمەی بزوتنەوەی خوێندکاریدا بڵاوی کردەوە، بە ئاشکرا دەبینرێ[27]. هابرماس لەم کتێبەدا و لە نوسینەکانی تری کۆتایی شەستەکان و سەرەتای حەفتاکاندا، ئەم تێزە سەرەکیە دەهێنێتە پێشێ کە مارکس لە شیکردنەوەکانی خۆیدا بۆ کۆمەڵگای سەرمایەداری، بەپێی پێویست بە شێوەیەکی موجەرەد، کاری نەکردبوو. وتەزای کاری کۆمەڵایەتی کە ناوجەرگەی شیکردنەوەکانی مارکسی پێکدەهێنا، تەنها ڕەهەندێکی پێشکەوتنی مرۆڤ لەبەرچاو دەگرێت. هابرماس بۆ چاکردنەوەی ئەم تێڕوانینە چەمکەکانی "کار" و "مامەڵە" بۆ وەسفی کامڵتری دوو ڕەهەندی پرۆسەی کۆمەڵایەتی، بەکاردەهێنێ. ئەو بەڵگە دێنێتەوە کە مرۆڤ لە دوو ڕێگەوە پەرەدەسێنێ و پێشدەکەوێت: یەکێکیان لە شێوەی ئیدراکێك لە پەیوەندیدا بە سروشتەوە کە ناوی دەنێ کار و ئەویدی لە شێوەیەکی ئەخلاقیدا لە پەیوەندی نێوان زیهنی مرۆڤەکان کە لە ژێر ناوی مامەڵەدا دێت. هابرماس لەو ڕووەوە کە شیکردنەوەکەی مارکس نادروست نییە، بەڵکو کەموکوڕ و بەس نییە، چەمکی پیاچونەوە و چاکسازی بۆ وەسفی بەرخودی خۆی لەگەڵ بەرهەمەکانی مارکسدا دەهێنێتە پێشێ. بە پێچەوانەی مانای ژیانەوە یان ڕیفۆرم کە بە مانای گەڕانەوە بۆ شتێکە کە پەرەی سەندووە و پاشان گەندەڵ بووەو، هەروەها بە پێچەوانەی چەمکی نوێ کردنەوەو لەدایکبوونەوە، چەمکی چاکسازی و پیاچوونەوە بە مانای پرۆژەیەکی تازەی بیرکردنەوەیە بۆ پاراستنی ئامانجی سەرەکی. ئامانجی هابرماس، وەکو مارکس پێکهێنانی تیۆرەیەکی ڕزگاریخواز و گشتگیرە لەبارەی کۆمەڵگاوە، بەڵام هابرماس بە پێچەوانەی مارکسەوە، بڕوای وایە کە ئەگەر کۆمەڵگا و وتەزای کار، تەنها لە رووی پەیوەندیان بە سروشتی دەرەکیەوە لەبەرچاو بگرین، ناتوانین بە ئامانجێکی وا بگەین.

ئامانجی سەرەکی هابرماس لە پیاچونەوە بە ماتریالیزمی مێژوویدا پیشاندانی ئەو خاڵەیە کە نەریتە کلتوریەکان و گۆڕانکاریە سروشتیەکان، خاوەن لۆژیکی پەرەسەندنی تایبەتی خۆیانن کە تەنها لە ژێرخانی ئابوریەوە نەهاتوون. لە کاتێکدا مارکس پێشکەوتن و پەرەسەندنی بە دەرئەنجامی زیادبوونی کەمایەتی لە هێزەکانی بەرهەمهێنان و گۆڕانی چۆنایەتی لە پەیوەندیەکانی بەرهەمهێناندا دەزانی، ئەوا بە بڕوای هابرماس پەرەسەندن و پێشکەوتن لە بواری کردارەکانی پەیوەندیشدا ڕوودەدات. یەکێك لە ڕەهەندە گرنگەکانی هەوڵی هابرماس لە پیاچونەوە بە ماتریالیزمی مێژوویدا، ڕەخنەگرتنە لە وتەزای کاری کۆمەڵایەتی وەك هۆکاری دەستنیشانکەر لە کۆی مەسەلە

مرۆییەکاندا، هەر لەبەرئەمە هابرماس زۆر جەخت لەسەر لێکۆڵینەوە مرۆڤناسیەکان لە بارەی رەوتی تێپەڕین لە نیمچە مرۆڤەوە بۆ مرۆڤی هوشیار دەکات. هابرماس لەم لێکۆڵینانەوە ئەو دەرئەنجامە وەردەگرێ کە کاری کۆمەڵایەتی لە راستیدا دەرخەری خەسڵەتی سەرەکی نێوان شیردەرە سەرەتاییەکان و نیمچە مرۆڤە. بەلام پەیدابوونی پەیوەندیە خێزانیەکان، واتە ئەو بونیادانەی کە هەڵگری خەسڵەتە کۆمەڵایەتیە نێوان زیهنەکانە، نیشانەی گواستنەوەیە بۆ مرۆڤی هوشیار. بە بڕوای هابرماس دوبارە بەرهەمهێنانەوەی ژیانی مرۆیی، بە جۆرێکی تایبەتی کار و کاردانەوە دەستپێدەکات کە خاوەن کۆمەڵێك خەسڵەتە کە لە پێشەوە هەڵگری زمانە: "پایە و پلەی شیردەرە سەرەتاییەکان تاك رەهەندی بوو، هەر تاکێك دەیتوانی تەنها و تەنها پایە و پلەیەك لە هەموو بوارەکانی کارکردندا، داگیربکات. تەنها کاتێك تاکێك دەیتوانی پێگە و پایە و پلەی جیاواز لە خۆیدا کۆبکاتەوە و یان تاکە جیاوازەکان دەیانتوانی یەك پایە و پلە داگیربکەن، کە هاتوچۆی کۆمەڵایەتی لە نێوان ئەندامەکانی کۆمەڵێکدا کە خاوەن کاری تایبەتین، مومکین دەبوو"[28].

بەهەرحاڵ دروستکردنی ڕۆڵە کۆمەڵایەتیەکان لەسەر بناغەی ناسینی نێوان زیهنیەکان، رەوایەتی ئەم دەورانەیە. مرۆڤەکان بەدەر لە وردەکاریەکانی کەسایەتی خۆیان، چاوەڕوانی سروشتی پەیدا دەکەن. ئا لێرەدا کە ئێمە شایەتی پەیدابوونی "پشتبەستن بە ئەخلاقیات وەك ئەنگێزەی کار"ین[29]. هەر ئەم تایبەتمەندیە مرۆڤ لە دنیای کەسایەتی تاکانەیی و زۆرمەندانەی شیردەرە پلە یەکەکان، دەهێنێتە دەرێ و بەرەو دەرونی جیهانی کردار و کاردانەوە کۆمەڵایەتیە دروستکراوەکان لە ڕەمز و سیمبولەکان، ڕێنمایی دەکات.

سەرچاوەی ڕەگەزی مرۆڤ بۆ هابرماس لەو روەوە زۆر گرنگە کە دەریدەخات پێشکەوتن و پەرەسەندنی مرۆڤ دەکرێ نەك بەپێی کار، بەڵکو بەپێی کرداری کۆمەڵایەتی دیاری بکرێت. پێشنیاری هابرماس ئەوەیە کە ماتریالیزمی مێژوویی ببەستینەوە بە پرۆسەی پێشکەوتنی ئەخلاقیات یان خەسڵەتە کۆمەڵایەتیەکان، نەك بە پرۆسەی پێشکەوتنی ئامێری. ئەو پرسیارەی کە راستەوخۆ دێتە پێشێ ئەوەیە کە ئەو نمونانە لە کوێ بدۆزینەوە کە بتوانێت پێشکەوتنێکی وا بە روونی وەسف بکات. هابرماس بڕوای وایە کە بۆ ئەم پرسیارە، وەلامێکی لە بواری سایکۆلۆژیای پێگەیشتوودا دۆزیوەتەوە. ئەو بە پشتبەستن بە بەرهەمەکانی ژان پیاژێ، لارنس کۆلمبرگ و کەسانی دی، دیدێکی نەرمتر و لە هەمانکاتدا پێشکەوتوخوازانە تر بۆ مێژووی مرۆڤ پێشکەش دەکات کە هاوتای پەرەسەندنی تاکی مرۆڤە. لەسەر بناغەی پرۆژەکەی مارکس منال لە ڕێگەی قۆناغی جیاوازەوە گەشە دەکات: ا) قۆناغی پێکەوە ژیان، ب) قۆناغی خودسەنتەری یان خود ناوەندی، پ) قۆناغی کۆمەڵگا سەنتەری و بابەتگەی، ت) قۆناغی گشتگیری. بە درێژایی ئەم پرۆسەی گەشەکردن و پەرەسەندنی مرۆڤە لە قۆناغێکەوە کە تیایدا سنورێکی دیاریکراو بۆ زیهنیەتی تیا نییە، بە قۆناغێك دەگات کە تیایدا "خود" دەتوانێ لە بارەی خۆی و بنیادە سروشتیەکانەوە، ئەندێشە بکات و بیر بکاتەوە. هابرماس بڕوای وایە کە دەکرێت ئەم چوارچێوە تیۆریە بۆ وەسفی پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی بەکاربهێنرێ. بە بڕوای ئەو "لە نێوان گەشەکردن و پەرەسەندنی نەفس و پەرەسەندنی

جیهانبینیـەکاندا، لێکچوونگـەلێك هەیــە[30]. گـەرچی هابرماس بێ ئاگا نییە لەو کێشانەی لە تـەعمیمی چەمکەکان لــە ئاسـتی تاکـەوە بـۆ ئاسـتی کۆمـەڵگا هەیە، بەڵام بڕوای وایە کە دەکرێ جیهانبینیەکان بۆ نمونــە وەك پرۆســەی پەرەســەندن لــە نمایشــە ئەفسـانەیەکانەوە بـۆ شـێوە گشـتیەکانی ئـاڵوگۆڕ و مامەڵە (بۆ نمونە لە نەریتی یەهودی – مەسیحیدا) و دواجـار بـۆ دیـدی خودئەندێشـانە کـە خەسـڵەتی جیهانی نوێیە، وەسف بکرێت.

بـەدواداهاتنی جیهانبینیـە جیاوازەکـان تەنـها دەرکـەوتێکی پەرەسـەندنی پەیوەندییـە. هابرمـاس هـەروەها لەسـەر بناغـەی شـیکردنەوەی کردارەکـانی ئاخـاوتن، پرۆسـەی پەرەسـەندن و گەشـەکردنی شوناسە فەردیـەکان لـە کۆمـەڵگای سـەردەمی نوێـی بەردینەوە تا کۆمەڵگایەکی ئایدیال کە هەر تاکێك بە هـاوڵاتی جیـهان دەژمـێرێت، وێنـە دەکـات. دەکرێـت نمونەی پەرەسەندنێکی هاوشێوە لە بوارە یاسایی و ئەخلاقیـەکاندا کـە پێشـتر تـاوتوێکران، لەبـەرچاو بگیرێت.

هابرماس ئیستدیلال دەکات کە ئەم سێ جۆرە پرۆسـەی پێشـکەوتنی مێژووییـە – واتـە لـە بـواری جیهانبینیـەکان، شوناسـی تـاك و دەرکەوتـەکانی یاسـایی –ئـەخلاقی– لەسـەر بناغـەی "بونیادەکـانی پـەیوەندی نێـوان زیهنیـەکانن کـە بـەهۆی زمانـەوە سەقامگیر بوون"[31]. تیۆرەی کرداری پەیوەندی کە ئـەم جـۆرە بونیادانـە ڕووندەکاتـەوە دەبـێ وەك تەواوکەری تیۆرەی کرداری پەیوەندی ئاراستەکراو بەرەو ئامانج، دابـنرێت کـە ماتریـالیزمی مێژوویـی لەسەر بناغەی دامەزراوە[32].

پرۆسـەی بەعـەقڵانیبوون و پێشـکەوتن لــە هـەردوو بواردا ڕوودەدەن، بەڵام جیاوازیـەکی گرنـگ لـە نێوان پێشکەوتن لـە هـەردوو بـواری باسـکراودا هەیـە. عـەقڵانیبوون لـە بـواری کـرداری پـەیوەندیدا، بێگومـان پەرەسـەندنێکی پۆزەتیڤـە، لــە کـاتێکدا عـەقڵانیبوون لە بواری کاری عـەقڵانی ئاراسـتەکراو بەرەو ئامانج، پێویستی بە بڕیـاردانی ئامـانجدار و ئامێرخوازانـە هەیـە. عەقڵانیـەتی ڕوو لـە زیـاد لــەم بـوارەی دواییـدا بـە شـێوەیەکی ئاسـایی بـەهۆی نــامۆبوون و بــیرۆکراتیبوونی جیــهانی نــوێ دەژمـێرێت. بـەڵام عـەقڵانیبوون لـە بـواری کـرداری پەیوەندیدا بە مانای وەلاوەخستنی ئەو ڕەهەندانەی پەیوەندییــە کــە دەبێتــە هــۆی شــێواندنی پەیوەندیـەکان. ئـەم ڕەهەندانـە یـان دەروونـی و یـان کۆمەڵایەتین. کەوابوو پێشکەوتن لە بواری کرداری پەیوەندیدا بە هەمان شێوەی پێشکەوتن لە بـواری کـاری عـەقڵانی ئاراسـتەکراو بـەرەو ئامـانجدا، ئـەندازەگیری نـاکرێت، بـەڵکو دەبـێ ئـەم کـردارە "لەسـەر بناغـەی ڕادەی گەشـەکردنی بواری کـرداری کۆگـیر هاوکـات لەگـەڵ دروسـتکردنی پـەیوەندی و لێکتێگەیشـتنی دوور لـە فرت و فێڵ"، ئـەندازەگیری بکرێـت. هابرمـاس تەنانـەت لەسـەر ئـەو بڕوایەیـە کـە ئەم جۆرە پێشکەوتنە سەرەکیترە لە پەرەسەندنی لە بواری کرداری عەقڵانی ئاراستەکراو بەرەو ئامـانجدا و هــەر لــێرەوە نــاوی دەنــێ "خــێرایی پێــوەری پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی"[33].

ئـەمجۆرە بیرکردنەوانـە لـە بـواری پەرەسـەندنی کۆمەڵایـەتیدا، چـەندان سـاڵ دوای ڕووبەڕووبونـەوەی هابرماس لەگەڵ بزوتنەوەی خوێندکاریدا، پێشکەش کرا. لەگەڵ ئەمەشدا ناکرێ بگوترێ ئەو لە هـەمان ســەردەمدا کــاتێك ڕەخنــەی لــە دۆگماییــەتی مارکسیانەی هەندێك لە پڕ هەراوهوریاترین ڕابەرانی بزوتنــەوەی خوێندکــاری دەگــرت، ئــەمجۆرە بیرکردنەوانـەی لەسـەردا نـەبووە. ئامـانجی ئـەو لــە کاردانـەوە بەرامبـەر بـە شـێوازەکان و پڕوپاگـەندەی

بزوتنەوەی نارازی خوێندکاران و هەم لە نەفیکردنی تـێڕوانینی سـنوردراوی ئـەو بزوتنەوەیـە بـۆ پەرەسـەندنی مێژوویـی، ئـەوە بـوو کـە لـە سـنوری تێڕوانینـە بـاو و کلاسـیکیەکان سـەروتر بـڕوات و هەڵویستەکانی خۆی کە لەسەر بناغەی ڕێگەچارەی دیموکراتـی بـوو، ڕوون بکاتـەوە. ڕەخنـەی ئـەو لـە بزوتنەوەی خوێندکاری لەسەر ئەو بڕوایە دامەزرابوو کـە تـێڕوانینی خوێندکـاران بـۆ گۆڕانکاریـەکانی کۆمـەڵگا پێشـکەوتوەکانی ڕۆژئـاوا و هـەروەها بـۆ وابەستەیی و کۆنترۆڵکردنی جیهانی سێهەم، قاڵبی و تەسـك بینانەیـە. ئـەو دەورەی کـە هابرمـاس بـۆ خوێندکـاران وەك پێشـەنگی وتوێـژی گشـتی و ئـازاد لـە بـارەی مەسـەلە گشـتی و ئاڵۆزەکانـەوە داینـابوو، بەبڕوای ئەو دەبووە هـۆی ئـەوەی تـا بـواری گشـتی پـاش قۆنـاغێك لـە وەسـتان لـە گفتوگـۆ و باسـی سیاسـی واقعـی و ئـازاد، سـەرلەنوێ ڕەونـەق پـەیدا بکاتەوە و سیاسی بێت. هیـوای هابرماس ئەوە بوو کـە بـەم شـێوەیە بـە پەنجـە خسـتنە سـەر خاڵـە لاوازەکـانی حکومـەت، ڕەوایەتیەکـەی بخاتـە ژێـر پرسـیارەوە. دیـارە دەرئـەنجامی ئـەم چالاکیانـە، ئـەنجامدانی شۆڕشـی سۆشیالیسـتی نییـە بـەو شـێوەیەی کـە هـەندێك لـە رابـەرانی بزوتنـەوەی خوێندکـاری چاوەڕێیـان دەکرد، بەڵام ڕەنگە بەهۆی ئەم چالاکیانـەوە پێشـکەوتنێکی ڕێژەیـی لـە بـواری کرداری پەیوەندی و کۆمەڵایەتیدا، بێتە پێشەوە. بە سەرنجدان لە بیرکردنەوەکانی دوایـی هابرمـاس لـە ماتریالیزمی مێژوویی، دەکرێت بگوترێت کە ئەو بە دروستی لەوە تێگەیشتبوو کە هەلومەرج بۆ ڕوودانی شـۆڕش و گواسـتنەوە بـۆ شـێوازێکی تـازەی بەرهەمهێنان، بە ئەندازەی پێویست سەخت و ناکۆك ئـامێز نـەبووبوو. ڕەنگـە لـەو کۆمەڵگایانـەدا کـە سیسـتەمی ئەخلاقی و یاسـایی و شوناسـی فـەردی خـۆی لەسـەر بناغـەی بنـەما گشـتیەکانی مـرۆڤ دادەمەزرێنن، گونجاوتر ئەوە بێت کە جەخت لەسەر پێوەر و بنەما قبوڵکراوەکانی خۆی بکات.

## پەراوێزەکان

*1-Zur logik der Sozialwissenschaften originally appeared as Beiheft 5 in the philosophischer Rundschau in february 1967; it was republished as a separate volume by suhrkamp in 1970. Habermass Die Universaitatsanspruch der Hermeneutik appeared in Rudiger Bubner, Konrad Cramer, and Reiner Wiehl (eds), Hermeneutik und Dialektik (Mohr, Tubingen, 1970), pp. 73-104.*

*2* –لەبارەی بزوتنەوەی خوێندکاریەوە، بگەڕێوە بۆ:
*see Gerhard baub, die studentenbewegungen der sechziger. Jahre in der bundesrepublik und westberlin (Pahl – Rugenstein, Cologne, 1977); Margareth Kukuck, student und klassenkampf; studentenbewegung in der BRD seit 1967 (Verlag Association, Hamburg, 1977); Karl-Heinz Lehnardt and Ludger Volmer, Politik zwischen Kopf und bauch; zur relevanz der personlichkeitsbildung in den politischen konzepten der studenten bewegung in der BRD (Druckladen Verlag, Bochum, 1979); and Frank Wolff and Eberhard Windaus (eds) studentenbewegung 1967-69: protokolle und materialien (Verlag Roter Stern, Frankfurt, 1977).*

*3-peter Dews (ed.) Habermas; Autonomy and solidarity: intervieews with jurgen Habermas (verso, London, 1986), p.80.*

*4-ibid., p.78.*

5-بگەڕێوە بۆ یەکەم وتارەکانی:

*Protest bewegung und hochschulreform (suhrkamp, Frankfurt, 1969)*

کۆی نوسینەکانی هابرماس لە بارەی زانکۆ و خوێندکارانەوە، لەم کتێبەدا کۆکراوەتەوە.

*6-See baub, studentenbewegungen, pp. 44-68; and uwe bergmann et al. Rebellion der studenten oder Die neue opposition (rowohlt, Hamburg, 1968), pp. 7-32.*

*7-Rudi Dutschke, Geschichte ist machbar; texte uber das herrschende Falsche und die Radikalitat des friedens (wagenbach, berlin, 1980), p. 76.*

ئەم کتێبە لە ناواخنیدا وتار و نوسینە سیاسیەکانی دۆتچکەی تێدایە لە دەیەی 1960 و 1970دا.

8-باسێکی دورودرێژتری لە بارەی تێڕوانینی دۆتچکەوە بۆ بزوتنەوەی خوێندکاری و جەنگ، لەم بەرهەمەی خوارەوەدا بڵاوکرایەوە کە لە ماوەی شەش مانگدا هەشت جار چاپ کرایەوە و زیاد لە 150000 ژمارەی لێ فرۆشرا:

*Rebellion der studenten (pp. 33-93).*

*9-Dews, Autonomy and Solidarity, p. 80.*

10-هابرماس لێرەدا ئاماژە بۆ خوێندکارانی دوای ناوەندی و زانکۆ بەیەکەوە دەکات.

*11-The stuctural Transformation of the public sphere: an inquiry into a Category of Bourgeois society, trans. Thomas Burger with the assistance of Frederick Lawrence (MIT Press, Cambridge, Mass, 1989). Jurgen Habermas, Legitimation Crisis, trans. Thomas Mc Carthy (Beacon, Boston, 1975), p. 134.*

*12-Oskar negt, "Einleitung" , in Die Linke antwortet Jurgen Habermas (Europaische Veriagsanstait, Frankfurt, 1968), p. 32.*

*13-Klaus Dorner, Uber den Gebrauch klinischer Begriffe in der politischen Diskussion, in Die Linke, pp. 59-69.*

*14-Claus Offe, kapitalismus - Analyse als Selbsteinschuchterung, in Die Linke, pp. 108-9.*

*15-Furio Cerutti, "Ein Brief an Jurgen Habermas", in Die linke, p. 44.*

*16-Anselm Neususs, "praxis und Theorie", in Die Linke, pp. 49-50.*

*17-peter Bruckner, "Die Geburt der Kritik aus dem Geist des Geruchts", in Die linke, pp. 72-4.*

*18-Herbert Lederer, "Revolutionare Strategie und liberales Maklertum", in Die Linke, p. 114.*

*19-Ekkehart Krippendorff, "Zum Verhaltnis zwisch Inhalt und Form von Demonstrations techniken", in Die Linke, pp. 164, 169.*

*20-Reimut Reiche, "Verteidigung der "neuen Sensibilitat" ", in Die linke, pp. 102-3.*

*21-Neususs, "Praxis", pp. 54-5.*

*22-Negt, "Einleitung", pp. 17-32.*

*23-Karl Marx and Friedrich Engels, Marx Engels Werke (Dierz Verlag, Berlin, 1972), Vol. 22, p.298.*

*24-ibid., Vol. 13, pp. 7-11.*

*25-Tom Rockmore, Habermas on Historical Materialism (Indiana University Press, Bloomington, 1989).*

*26-Quoted in Jurgen Habermas, Communication and the Evolution of Society, trans. Thomas Mc Carthy, (Beacon Press, Boston, 1979), p. 98.*

فەسڵەکانی دوو تا پێنج هەڵگری چوار وتاری سەرەکی کتێبی "پیاچوونەوە بە ماتریالیزمی مێژوویی" (فرانکفۆرت 1976) دایە.

*27-Jurgen Habermas, Technik und Wissenschaft als "Ideologie" (Suhrkamp, Frankfurt, 1968).*

*28-Communication and the Evolution of Society, p. 136.*

*29-ibid.*

*30-ibid., p. 102.*

*31-ibid., p. 116.*

*32-"Moral development and ego identity" (pp. 69-94 of communication and the Evolution of society).*

هابرماس لەم وتارەدا بە دورودرێژی پەیوەندی گەشەکردنی کەسایەتی و تیۆرەی کرداری پەیوەندی، تاوتویێ دەکات. لێرەشدا پشت بە بەرهەمەکانی لۆرنس کلبرگ دەبەستێت.

*33-Communication and the Evolution of Society, p. 120.*

## تێبینی

ئەم بەشە وەرگێڕانی فەسڵێکی ئەم کتێبەی خوارەوەیە:

رابرت هولاب: یۆرگن هابرماس (نقد در حوزه عمومی).

تهران – نشر نی. چاپ اول *1375*.

## مەرگی "جان دەمۆ"

عەبدە وازن

لە عەرەبییەوە: نەوزاد ئەحمەد

**"ئەو تەورەی بۆ بڕینی قەدی درەختەکان دروست کراوە، هەمیشە وەکو تەور دەمێنێتەوە"**

**-جان دەمۆ-**



جان دەمۆ

ناوی جان دەمۆ هەمیشە پێش شیعرەکانی دەکەوێ، زۆربەی ئەو کەسانەی جان دەمۆیان ناسیوە یان ناوەکەیان بیستووە، شیعرەکانی ناناسن، تا گەیشتە ئەوەی - وەك عەبدولقادر جەنابی دەڵێ - بوو بە "شاعیرێکی بێ تێکست"، شاعیرێك لە شیعردا دەژی و پێویستی بەوە نییە بینووسێتەوە.

دواجار جان دەمۆ مرد، لە تەمەنی پەنجاو چوار ساڵیدا مرد، دوور لە عێراق و دوور لە کەرکووکی زادگای خەونەکانی، لە (سیدنی)دا مرد، لەوێدا وەکو تاراوگەکراوێك "دەژیا" پاش ئەوەی چەندین شار گەڕا و بە نێو چەندین شاردا گوزەری کرد کە دواینیان عەمان بوو و لەوێدا لە نێو هاوڕێ عێراقییەکانیدا کەمتر هەستی بە غوربەت دەکرد. ئەگەر عەبدولقادر جەنابی و سامۆئیل شەمعون هەواڵی مردنەکەیان لە ئینتەرنێت بڵاونەکردبایەتەوەو بایەخیان پێ نەدابایە، کەس بە مەرگی جان دەمۆی نەدەزانی، ئەو هەمیشە لە مردوو - زیندوویەك دەچوو یان لە زیندوویەکی مردوو یان مردوویەك هێشتا هەواڵی مردنەکەی نەگەیشتبێ. پەیوەندی جان بەوەی پێی دەوترێ "ژیان" وەکو تاڵەداوێکی باریك کز و ئاستەم بوو، ژیان لە تێڕوانینی ئەودا "ڕاکردنێك" بوو بە ئاراستەی "سەرابی چرکەساتەکان" وەك خۆی لە شیعرێکدا وا دەڵێ.

جان دەمۆ - وەك سەعدی یوسف دەڵێ - خاوەنی ژیان نەبوو تا جێی بهێڵێ، هەروەها ماڵ و خانوو و تەنانەت "جانتا"یشی نەبوو، هیچ خواستێکی شیعریی نەبوو و خاوەنی هیچ پرۆژەیەکی شیعریش نەبوو. ئەو چرکە لە دوای چرکە لە شیعر و لە ناو شیعردا دەژیا، سەعلوکێکی سەرگەردان و ئاوارە و گەڕۆك و هەمیشە مەست و گاڵتەجاڕ و تووڕە و هێمن بوو.. ئەو بەردەوام لە حاڵەتی "هەڵکەندن"دا دەژیا و لە هیچ شوێنێکدا ڕەگوڕیشەی دانەدەکوتا، ئەمەش وای لێکرد پێی وابێت هەموو جیهان نیشتمانی ئەوە و گشت شۆستەکانیش ماڵی ئەون. جان دەمۆ بە تەنها لە شیعرەکانیدا گوزارشتی لەم حاڵەتی "هەڵکەندن" و بێ ڕیشەییە نەکردووە بەڵکو بە جەستە و بە ڕۆحیش تاقی کردۆتەوە تا گەیشتۆتە ئەوەی بووە بە "بوونەوەری نا شوێن" هەروەکو چۆن شاعیرێکی بێ دیوان و بێ کتێب بوو.

بە تەنها شەراب ژیانی جان دەمۆی وێران نەکرد، لە کاتێکدا ئەو مودمینێکی گەورە بوو، بەڵکو سەرەتاتکێی شیعرییانەی لەگەڵ ژیاندا، وێرانی کرد،ئەو ژیانەی، جان دەیویست بیکات بە قەسیدەیەکی مەحاڵ، دیسان ئەوەی جانی وێران کرد: نموونەی شاعیرێکی یاخی و نەفرەت لێکراو بوو کە هەموو شتێکی رەت دەکردەوە، جان هەموو ژیانی بۆ راکردن بە دوای ئەو "نموونە" شاعیرییەدا بەسەربرد. هەروەها هەڵوێستی تراژیدیانە و نائومێدانەی لە بەرامبەر دنیایەك -وەك خۆی دەڵێ- شایستەی هیچ جەور و ئازارێك نییە. دەشێت ئەو سالانەش وێرانیان کردبێت کە وەکو شێتێك لە عێراقدا و لە ژێر مۆتەکەی بەعسدا دەژیا، سەرەرای هەوڵی بێوچانی تا ئەو "مۆتەکە"یە بکات بە شتێك لە بێهودەیی و گاڵتەجاری. هەواڵی جان دەمۆ لە کاتی شەری عێراق - ئێراندا کەمتر سەیر و سەمەرە نەبوو لەو هەواڵانەی لە کاتی ژیانی سەعلوکی و بەدمەستیدا پێمان دەگەیشت.

ئەگەرچی جان سەر بە نەوەی شەستەکانە لە عێراقدا، بەڵام بە ئەندازەیەکی بەرچاو بەشداریی شاعیرانی نەوەکەی خۆی نەکردووە لە خەمی گەران بەدوای فۆرم و بنەماکانی "تازەگەرییەکی تردا" لە کاتێکدا جان بە گوێرەی ئەو رۆشنبیرییە قووڵەی و زانینی زمانی ئینگلیزی توانای جێبەجێکردنی ئەو ئەرکەی هەبوو، بەڵام جان هەر زوو لەوان جیابووەوە و ئەوانیش وردە وردە لە یەکتر جیابوونەوە.

لەوانەیە ئەو چەند شیعرە کەمەی جان دەمۆ نووسیونی نەگەنە بارستایی ئەو "نەفرەتە" شیعرییەی تیایدا ژیاوە، لەوانەیە گرنگیی ئەو شیعرە کەمانە لەچاو بەرهەمی شاعیرانی وەچەکەی خۆی زۆر نەبێت، ئەو وەچەیەی ئەزموونە درەوشەدارەکانی خۆیان لە ئاستی عێراقی و عەرەبییدا قووڵ کردەوە، بەڵام جیاوازیی جان لەو وێنەیەدایە کە خۆی بۆ خۆی دروست کردووە، وێنەی شاعیرێك گوێ بە هیچ سەروەری و "نەمری" و حیکمەتێك نادات، شاعیرێکی بێزەوەر رقی لە شیعر و شاعیرانەو گاڵتە بە "ئەخلاقی" شیعری دەکات و پیشەی شیعریی بێ نرخ دەکات و هەروەها بەبێ نرخی تەماشای ئەو شاعیرانەش دەکات کە شیعر دەکەن بە پیشە. وەك بڵێی شیعر لە تێروانینی ئەودا ئارەزوویەکی ئەبەدی و پرۆژەیەکی ناتەواو بێت تەنها لە رێگەی رووبەرووبوونەوەیەکی ناچیزەی جەستەوە تەواو دەبێت نەك زمان. دەشێت ناتەواویی پرۆژەکە هاوتای یان هاووێنەی ئەو ئارەزووە تەماوییە بێت کە وەکو ئارەزوویەك دەمێنێتەوە لە ژیانێکدا ئەم شاعیرەمان بۆی دەسووتێ و هاوکات هیچیشی لێنازانێت. بێهودەیی جان دەمۆ دەگاتە سنوورێك لە قەسیدەیەکدا دەڵێ: "سەرکێشی بە وەڵامدانەوە ناکەین/ چونکە لێرەدا وەڵام نییە".. یەکێ لە ماناکانی ونبوونی "وەڵام" بریتییە لە نەبوونی هەر یەقینێك لە ژیانێکدا پێدەچێ هەم ئاڵۆز و هەم ئاسان بێت بەقەدەر ئەوەی تەمومژاوی و قورسیشە. ئەمە ئەو ژیانە مەحاڵەیە کە جان دەمۆ تیایدا ژیاوە وەك ئەوەی لە خەونێکی مەحاڵدا بژی.

لەوانەیە کەوتنی مۆتەکەی بەعس گرنگییەکی ئەوتۆی لەلای جان دەمۆدا نەبووبێ، ئەوێك بە پلەی یەکەم قوربانیی ژیان و مۆتەکەکانی ژیان بووە (لەوانە مۆتەکەی بەعسی عێراقی) هەروەها قوربانیی خۆی و

قوربانی ئەویدیش بووە سا هەرکەسێك بێ و هەرچۆنێك بێ. دەشێت گەڕانەوە بۆ عێراقی پاش سەدام مانایەکی گەورەی لەلای جاندا نەبووبێت، ئەوێك لە تاراوگە زۆر و هەمەجۆرەکانیدا قیبلەنومای کات و شوێنی ون کردووە و سەر بە ناشوێن و ناکات بووە. جان دەمۆ بەر لە کەوتنی پەیکەرەکانی سەدام حوسێن کەوتووەو زیاد لە جارێك نوشستی هێناوە، بەڵام دوا مەرگ و ئاخرین کەوتنی ئەو، کاریگەری و ئازارێکی کەمتری هەبوو بەو پێیەی کەوتنی راستەقینە لە مەرگێکدایە هەژموونی بەسەر هەموو دونیادا هەیە: "مەرگ ونبوونی یادوەرییە/ یان پۆلێك باڵندەی پەنگوینە/ لە ژێر خۆرەتاوی وەنەوشەییدا/ چاوەڕێی ڕزگارکەرێك دەکات؟" جان دەمۆ بەم شێوەیە پرسیار دەکات بێئەوەی خۆی بۆ گەڕان بەدوای وەڵامێك ماندوو بکات. شاعیرێکی بێهودە و نیهلیستی و نەفرەتلێکراوی وەکو ئەو بەلایەوە گرنگ نییە ئەرکی دانایی و روناکبیر و راماوێك لە ئەستۆ بگرێت. ئەوەی بەلای جانەوە گرنگە: ژیانی خۆی بکات بە تاکە قەسیدەیەك بە خوێن نووسرابێت نەك بە مەرەکەب، هەروەها بە فرمێسك و پێکەنین و شێتی نووسرا بێت.

ئەگەر جان دەمۆ بەقەدەر ماوەی ژیانی و سەعلوکیەتی، بینووسیبایە، ئێستا دیوانەکانی چەند سوچێکیان لە کتێبخانەی شیعری عەرەبیدا داگیر دەکرد. بەڵام ئەم شاعیرە "نەفرەتلێکراوە" بە سووکی لە ڕێگەی "اسمال"ەوە چووە نێو دونیای شیعر. ئەو نامیلکە شیعرییەی بەر لە چەند ساڵێك هاوڕێکانی بە ناونیشانی "اسمال"ەوە بۆیان چاپ کرد، حەقیقەتی ئەزموونە سەیر و سەمەرەکەی جان دەمۆ پیشان نادات. ئەو قەسیدانەیشی کە عەبدولقادر جەنابی لە سایتی"ئیلاف"ی ئینتەرنێت کۆی کردوونەتەوە و هەروەها ئەو شیعرە پەرت و بڵاوانەی کە لە شەستەکاندا لە بەیرووت لە پێناوی ژەمێك نانخواردندا نووسیونی، شایستەی ئەوەن لە دیوانێکدا کۆبکرێنەوە و ببێ بە دیوانی هەتیوکەوتووی جان دەمۆ کە پارچە پەرتوبڵاوەکانی عومری بابردووی تیادا کۆدەکرێتەوە. ئاخۆ جان شایستەی ئەوە نییە دیوانێکی شیعریی هەبێت و نازناوی "شاعیری نەفرەتلێکراو"ی پێ ڕەوا ببینرێ؟ جان دەمۆ مرد و ناوەکەی مایەوە، بگرە تەنانەت لە پاش مردنیشی ناوی جان پێش مردنەکەی دەکەوێ. ئاخۆ کەی ناوی جان بەو قەسیدانەوە دەبەسترێ کە بێ خواستی خۆی نووسیونی و وەك گاڵتەکردنێك بە شیعر و ژیان پێکەوە گوزارشتی لێکردوون.

**سەرچاوە**

ڕۆژنامەی (الحیاة) – *2003/5/19*

## "نیچە" و فاشیزم

### لە عەرەبییەوە: شوان ئەحمەد

*Nietzsche, Godfather of Fascism?*

*Jacob Golomb and Roberts wlstrich princeton university press.*

*2002, P. 341*



لە نوسینی ئەم کتێبەدا زیاتر لە پانزە فەیلەسوف و مامۆستای فەلسەفە لە سەرجەم زانکۆکانی جیهاندا بەشداربوون، لەوانە: "دانییل. و کۆنوی" مامۆستای فەلسەفە لە زانکۆی پەنسلڤانیا لە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا کە پسپۆڕە لە بواری فەلسەفەی سیاسی لە سەدەی بیستەمداو گرنگترین کتێبەکانیشی بریتین لە: (نیچە و سیاسەت، هەروەها گەمە ترسناکەکەی نیچە و... هتد). یەکێکی تر لە بەشداربوان "ستانلی کۆرت گۆڵد"ە و ئەمیش مامۆستای زمانی ئەڵەمانی و ئەدەبی بەراوردکاریە لە زانکۆی برنستۆن. سەرپەرشتیارانی ئەم پرۆژەیەش بریتین لە هەریەك لە: "رۆبرت. س. ویستریچ" و پرۆفیسۆر "جاکۆب کۆلۆمب".

لەم کتێبەدا پرۆفیسۆر "ئەلیکسەندەر نیهاماس" مامۆستای فەلسەفە لە زانکۆی برنستۆن، لێکۆڵینەوەیەکی لەژێر سەردێڕی "نیچەو هتلەر"دا نوسیوە. ئەم کتێبە هەر لە سەرەتاوە ئەم پرسیارە دەخاتە روو: ئایا هیچ پەیوەندییەك لە نێوان "نیچە" و فاشیزمدا هەیە؟ ئایا دەشێت فەیلەسوفێکی وەك "نیچە" پەیوەندی بە ئایدۆلۆژیایەکی فاشیزم یاخود ئایدیۆلۆژیایەکی درندەوە هەبێت؟

وەکو ئاشکرایە ئەو چەمکە سەرەکیەی "نیچە" تەئکیدی لەسەر دەکاتەوە ئازادی تاکە کەسە و ئەوەش بە کارێکی پێویست دەزانێت کە مرۆڤ خۆی قەدەرو چارەنوسی خۆی دیاری بکات. لە پای ئەمەدا نەیارەکانی تۆمەتی ئەوەیان دایە پاڵ کە فیکر و بۆچۆنەکانی فیکر و بۆچونێکی ئۆرستۆکراتی - ڕادیکالییە، لەبەرئەوەی "نیچە" ڕقی لە کلتوری جەماوەر و زۆرینەی خەڵك بوو ئەو کلتورەشی بە کلتوری مێگەل ناوزەد کردبوو. لەم سەروبەندەدا "نیچە" پێشبینی ئەوەی دەکرد لە ئایندەدا سەردەم و ڕۆژگاری (سۆپەرمان) بێتە ئارا: مەبەستی ئەو لە (سۆپەرمان) ئەو مرۆڤە بالاو ناوازەیە بوو کە مرۆڤی ئەمرۆ تێپەڕێنێت.

ئەگەر ئەمە بۆچونی فەیلەسوفێکی وەکی "نیچە" بێت، کەواتە چ پەیوەندیەکی بە بزوتنەوەی نازیزمەوە هەیە کە گەمەی بە ئەقڵی جەماوەری دەکرد و لە پێناو ئامانجە شۆڤێنیەکانی خۆیدا مۆبێلیزەی دەکردن؟ دەبێت پەیوەندی ئەو بە ئایدیۆلۆژیایەکەوە چی بێت کە کاری سڕینەوەی تاکە کەس و شۆردنەوەی مێشکی مرۆڤ بوو بێت؟

بەڵام سەرەڕای ئەمانە چەند ڕاستیەك هەیە کە ناکرێت چاوپۆشی لێ بکەین، لەوانە: ساڵی *1934* "هتلەر" سەردانی ئەو مەڵبەندی بەڵگەنامانەی کرد کە تایبەت بوون بە فیکری "نیچە" و بارەگاکەشی لە (ڤایمار) بوو. لەوێدا "هتلەر" چاوی بە "ئەلیزابیسی" خوشکی "نیچە" کەوت. وێنەیەکی بەناوبانگی ئەو سەردانە هەیە کە تیایدا "هتلەر" تەوقە لەگەڵ "ئەلیزابیس"دا دەکات و لەبەردەمیدا نوشتاوەتەوە، وەکی ڕێزێك بۆ "نیچە"ی برای کە لە سەرەتای ساڵی *1900* کۆچی دوای کرد.

بەڵام داخۆ ئەمە بەسە بۆ ئەوەی بڵێین کە "نیچە" و "هتلەر" یەك شتن؟ لە ڕاستیدا ئامانجی ئەو سەردانەی "هتلەر" بۆ ئەو جێگایە تەنها بۆ پروپاگەندە بوو، چونکە نازیزم پێویستی بە گرانتی مەزنە روناکبیرانی ئەڵەمانیا هەبوو (چ زیندووەکانیان و چ

مردووەکانیشـــــیان). کەواتــــە مەبەست لەو سەردانە ئەوە بوو کامێراکان وێنەیەکی "ئەدۆلف هتلەر" بگرن لەو کاتەدا کە لە پەیکەرەکەی "نیچە" رادەمێنێ و پاشان ئەم وێنەیە لە رۆژنامەکانی ئەڵەمانیادا بڵاوبکەنەوەو وا لە خەڵك بگەیەنن کە "نیچە" لە "هتلـەر" رازییـە! ئـەوە بـوو رۆژنامەکانی ئەڵەمانیا لەو کاتەدا وێنەکەیان بڵاوکردەوەو لە ژێر وێنەکەشـدا ئـەم دێرەیـان نوسـیبوو: (فۆهـرەر لـە بـەردەم پەیکـەری ئـەو فەیلەسـوفە ئەڵمانیەدا کە بیرو بۆچونەکانی بووە زادی دوو بزاوتی میللی مەزن: نازیزم لە ئەڵەمانیا و فاشیزم لە ئیتاڵیا!).

شایەنی باسە "مۆسۆلۆنی" یەکێك بوو لەوانەی زۆر بە فەلسەفەی "نیچە" سەرسام بوو، زۆربـەی کتێبەکانیشـی خوێندبووەوە، بەڵام پێ ناچێت "هتلـەر" "نیچـە"ی بـە باشـی ناسی بێت، چونکە لە سەروەختی جـەنگی جیـهانی یەکـەمدا کتێبـەکانی "شـوپنهاوەر"ی پـێ بـووە نـەك کتێبـەکانی "نیچـە"، ئەمـەش راسـتیەکی حاشـا هەڵنـەگرە و مێژوونوسـانیش دوپاتیـان کردۆتەوە.

لە کتێبەکەیدا (خەباتی من) دوور و نزیك باس لە "نیچە" ناکـات، لـە کـاتێکدا نـاوی "شـۆپنهاوەر" دێنێـت. لـە دانیشتنە تایبەتیەکانیدا "هتلەر" بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ ئاماژە بۆ "نیچە" دەکات، وەکی ئەوەی دەڵێت: (گەر یەهود بیانتوانیایە دەست بەسەر وڵاتەکەماندا بگرن، ئـەوا دەسـتبەجێ بەرهـەم و نوسراوەکانی شۆپنهاوەر و نیچە و کانتیان لەناودەبرد، هـەروەها گەر بۆ بەلشەفیەکانیش بلوێت و دوو سەدەیەك دەستمان بەسەردا بگـرن ئـەوا هیـچ شـتێك لـە کەلەپوری نەتەوەیمان نەدەمایەوە بۆ نەوەکانی داهاتوومان و هەموو مرۆڤە مـەزن و بلیمەتەکانیشـمان ناویـان دەسـڕرایەوە، یـاخود لـە چاکـترین حاڵـەتدا وەکـی جـەردەو تاوانکـار نیشـانیان دەدان!).

لە ساڵی *1944*دا نازییەکان بە بۆنەی تێپەڕبوونی سەد ساڵ بەسەر لەدایکبوونی "نیچە"دا ئاهەنگیان گێڕاو، لەو بۆنەیەدا تیۆرسـینی حـیزب "ئـەلفرید رۆزنبرگ" وتـارێکی خوێنـدەوەو تیایدا وتی: (نازیزم تەواوی دنیا دەسـڕێتەوە، وەك چـۆن نیچـە دەسەڵاتەکانی رۆژگـاری خـۆی سڕیەوە).

ئەڵبەتـە "نیچـە" تاکـە سەرکردەی رۆحی نازیزم نەبوو، بەڵام گومان لەوەدا نییە کە نازیەکان گرنگی زۆریان پێداوەو هـەوڵیانداوە بیرو بۆچونـەکانی بخەنـە خزمـەت ئایدیۆلۆژیـای خۆیانەوە: بەڵام داخۆ نازییەکان بە چ شتێکی "نیچە" سەرسام بوون و بۆچی خۆشیان دەویست؟ ئەمە ئەو پرسیارەیە کە ئەم کتێبە دەیکات و لەسەری دەوەستێت. بێگومـان نائەقڵانیـەتی بـێ ئەندازەی فەلسـەفەی "نیچـە" و شێوازی ئاگرینی نوسینەکانی و تورەییـە درەوشـاوەکانی، شـتگەلێکن کەسـایەتی "هتلـەر"مان بیردەخەنەوە کاتێك دەچوە بەر مایکرۆفۆن و وتارێکی ئـاگرینی حەماسـەت خوڵقێنـی دەدا و گەلی ئەڵەمانیای دەهێنایە جۆش.

لـێرەوە دەتوانـین بڵێـین کـە جۆرە لێکچونێك لە نێوان شێوازی "نیچە" و کارەکتەری "ئەدۆلف هتلـەر" دا هەیـە. بـەڵام ئـەوەی پەیوەندی بە جەوهەر و ناوەڕۆکی هەردوولایانەوە هەیە، ئەوا زۆر ئاڵۆز و دژوارترە! چونکە ناکرێت فەلسەفەی گران و ئاڵۆزی "نیچە" کورتکەینـەوە بـۆ تەنـها ئایدیۆلۆژیایـەکی نـازیزم یـان فاشـیزم. بێگومـان لێرەشـەوە

هەڵــەو تێکــەڵکردن دروســـت دەبێـــت.. ئەڵبەتـــە هـــەندێك بـــیروبۆچونی هاوبـــەش لـــە نێوانیــاندا هەیــە، بــەلاَم خــاڵی نـــاکۆك و جیـــاوازی زۆریـــش لەگۆڕێدایە.

لـــە شـــتە هاوبەشـــەکانی نێوانیـــــــان: ئاقـــــــاری دەســـتەبژێرگەرایی "نیچـــە" و پێداگرتنیـــەتی لەســـەر مرۆڤـــە هـێزدار و تەندروسـتەکان و ڕقـی زۆریشیەتی لە مرۆڤە نـەخۆش و لاواز و ترســـنۆکەکان. وەکـــی ئاشکراشـــە نازییـــەکان لای خۆیانــەوە بڕوایــان بــە ڕەگــەزی ئاری هـەبوو، پێیـان وابـوو ئـاری نــەژادەکان لــە ســـەر و هـــەموو نــەژادەکانی تـــرەوەن. "نیچــە" دوودڵ نـەبوو لـەوەی قوربـانی بـە ملیۆنەها مرۆڤ بدات، گـەرهاتوو تەندروســـت و بـــەهێز نـــەبن.. ئەمەش ئەو کارە بوو کە "هتلـەر" کردی!

لـە ڕاستیدا دەکرێت فیکری "نیچـە" لــە چــەند ڕوویەکــەوە تەفســیر بکرێـــت، بـــەم پێیـــە لێکدانـــەوەی نـــازیزم بـــۆ فەلســەفەکەی ڕەوایــە، هــەروەك چۆن ئەو تەفسیرانەی تریش کـە جیاوازن ڕەوایەتی خۆیان هەیـە. گومـانی تێـدا نییــە کــە "نیچـە" بڕوای بە ئایدیای پیاوانی مەزن و ڕۆڵـــی ئـــەوان لـــە مێـــژوودا هـەبوو، بـەلاَم لـە بەرامبـەردا بـە چــاوێکی ســـوك ســـەیری خـــــەڵکانی ئاســــــایی و جـەماوەری دەکـرد و بـە مێگـەل دەیچواندن.

هـــەندێك پێیـــان وایـــە فەلســـەفەی "نیچـــە" عەشـــقی قارەمانێتی فەردی و ئیرادەی هێز بوو، بەم پێیەش ڕەنگە هاندەرێك بووبێـــت بـــۆ ســـەرهەڵدانی ئایدیۆلۆژیای فاشیزم لە ئەوروپا، وەك دەزانرێـــت ئـــەمیش لای خۆیەوە بەر لە هەرشتێ تەئکیدی لـە هـێز و هـێزداری دەکـردەوە. "نیچە" دەنوسێت: (پێویستە لـە مەترسـیدا بژیـن و بـە لێـواری مەترسیدا ڕێ بکەین).

"مۆســـــۆلۆنی" ئـــــەم دەســتەواژەیەی کـردە دروشمـی بزوتنـەوەی فاشـیزم لـە ئیتاڵیـا.. وەك دەشــزانرێت خوێندنـــەوەی "نیچە" وای لێکرد دەستبەرداری مارکســیزم بێــت و دەرگـــیری فەلســـــەفەی قوربـــانیدان و خۆشویســتنی جــەنگ و مــەرگ بێت، لە پێناو داکۆکی کردن لـە نیشتمان. بەم پێیە دەکرێت بڵێین فەلسەفەی "نیچە" مەشروعیەتی دا بەو ئەقڵیەتـە جـەنگ خـوازەی تینـوی هـێز و خوێـن ڕشـتنە.. هـەرچی خەڵکانی لاوازیشـە ئـەوا لەسەر زەوی جێگایان نابێتەوە و دەبێـت لــەناو بچــن. ئـالێرەدا نزیکایەتیەك لە نێوان فەلسەفەی "نیچە" و ئایدیۆلۆژیای نازیزمدا دەدۆزینەوە. هەربۆیە فەیلەسوفی مارکســی "جــۆرج لۆکـــاش"، فەلســـەفەی "نیچـــە"ی بـــە پڕوپاگەندەیەك بۆ سەرمایەداری ئیمپریـــالی دایـــە قەڵـــەم و بەشـــێوەیەکی زۆر ترســـناکی شێوازەکانی فەلسەفەی نائەقلاَنی دەبینی.

لەبەرامبـەر ئـەم بۆچونانـەدا هـەندێکی تـر دەڵێـن: (فاشـیزم و جــەنگ خــواز و نازیســتەکان بەشێوەیەکی ناشیرین فەلسەفەی نیچەیان لە پێناو خزمەتکردن بە پڕوپاگـــەندەی ئایدیۆلۆژیـــای خۆیاندا بەکارهێناوە، لـەکاتێکدا فەلسەفەی ئەو زۆر لـەوە قوڵـتر و مرۆڤانەترە).. فیکری "نیچە" بەو پێیـەی فیکرێکـی ئـایندە بینـەو شێوازێکی شاعیرانەی زۆر بەرزی هەیـە، وایکـردووە کـە لەلایـەن فاشـیەکانەوە بـۆ مەبەسـتی تایبـەتی خۆیـان بـەکاری بـهێنن. بـەلاَم خـۆ نازییـەکان فەلسـەفەی "کـانت"یشـیان بـۆ ڕەوایـەتی بەخشــین بــە ئایدۆلۆژیاکــەیان بـــەکارهێناوە، وەك ئاشکراشـــە "کـــانت" لـــە ســـەردەمانی حوکمڕانـی نازییەکاندا ستایشـی

زۆر دەکرا و لە ڕیزی پێشەوەدا بوو. سەرەڕای ئەوەی فیکری "کانت" زۆر ئەقڵانی بوو، شێوازی نوسینیشی وەکی "نیچە" ئاگرین و وروژێنەر و بروسکە ئاسا و کاریگەر نەبوو.

لە ڕاستیدا پارتە سیاسیەکان هەمیشە پێویستیان بەوەیە لە ڕوی ئایدیۆلۆژییەوە ڕۆشنبیران ڕەوایەتیان بدەنێ، ڕۆشنبیریش چەندێك مەزن بێت حیزب هەوڵی زۆرتر دەدات بۆ ئەوەی بیرو بۆچونەکانی بخاتە خزمەت بەرژەوەندیەکانی خۆی. کەواتە هیچ بیریارێك ناتوانێت ڕێ لە خەڵکانی دی بگرێت تا بیر و بۆچونەکانی بۆ مەبەستی تایبەتی خۆیان بەکار نەهێنن.

ئەم قسەیەش "نیچە" و کەسانی دیکەش دەگرێتەوە. بە تایبەت ئەگەر ئەو بیریارە لە ژیاندا نەمابێت و مردبێت. شاڵاوی توندی "نیچە" بۆ سەر ئاکاری مەسیحی و بانگەشەکردنی بۆ تێپەڕاندنی و گەڕانەوە بۆ وەسەنیەت، بوونە مایەی نزیك کردنەوەی لە نازیزم و وایکرد بیر و بۆچونەکانی بە ئاسانی لەلایەن نازیستەکانەوە بەکاربهێنرێت و کاری پێ بکەن.

ئەوەی دەستی لە قوڵکردنەوەی زیاتری پەیوەندی نێوان "نیچە" و نازیزمدا هەبوو، ئەو ڕۆڵە بوو کە "ئەلیزابیسی" خوشکی لەم بوارەدا گێڕای. وەکی ئاشکرایە "ئەلیزابیس" خۆی و مێردەکەشی فاشیزمێکی حەقیقی بوون. هەر بۆیە لە ساڵانی بیستی سەدەی ڕابردووەوە دەستی کرد بە بڵاوکردنەوەی ئەوەی پروپاگەندەیەی دەڵێت: (فردریك نیچە فەیلەسوفی فاشیزمە!).

تەنانەت سڵاوی بۆ "مۆسۆلۆنی" نارد و پێی ڕاگەیاند کە: (تۆ زیندووکەرەوەی بەهای ئۆرستۆکراتیت بە مانا نیچەویەکەی، گەر براکەشم زیندوبوایە ڕازی دەبوولێت و بۆچونەکانتی پەسەند دەکرد).

وەکی پێشتریش ئاماژەمان پێدا هەر "ئەلیزابیس" بوو لە ماڵەکەی خۆیدا پێشوازی لە "هتلەر" کردو گۆچانەکەی "نیچە"ی بە دیاری دایە، ئەو گۆچانەی خۆی پێ ڕاگیر دەکرد و لە پیاسەی ڕۆژانەی ناو شاخ و داخەکانی سویسرا و ئیتاڵیا و فەرەنسادا بەکاردەهێنا.

"ئەلیزابیس" نازییەکی تەواو بوو. بەڵام ئاخۆ "نیچە"ی برای کە بە مەزنترین بلیمەتی فەلسەفە دەژمێردرێت لە مێژووی ئەڵەمانیادا، نازی بوو؟ ئەمە مەسەلەیەکە جێی گومانە، سەرەڕای بوونی خاڵی لێکچوو لە نێوانیاندا..

فیکری "نیچە" فیکرێکی ناکۆك و ئیشکالییە، زۆر جار دەکرێت ئەو شتەی دەیڵێت و دژەکەشی لە نوسینەکانیدا بدۆزینەوە، هەر ئەمەش فەیلەسوفی ئەڵەمانی "کارل یاسبەرز"ی ناچار کرد بە توندی دژ بە قۆستنەوەی فیکری "نیچە" لەلایەن نازییەکانەوە بوەستێتەوەو بڵێت: (ئەمە کارێکی مەحاڵە و دژ بە حەقیقەتی فیکری نیچەیە).

**سەرچاوە**

بیان الکتب – *2003/1/30*.

## خوێندنەوەی کتێبی دیموکراسی لە رووی مێژوویی و تیۆرییەوە

### خوێندنەوەی مەم بورهان قانع

کتێبی "دیموکراسی لەرووی مێژوویی و تیۆرییەوە" کە زنجیرە "6"ی چاپکراوەکانی بەڕێوەبەرێتیی خانەی وەرگێڕانی

سەر بە وەزارەتی رۆشنبیرییە، بەتیراژی (*700*) دانەو لەساڵی *2002*دا چاپکراوە..

ئەم کتێبە فکرییە کە باس لەچەمکی دیموکراسی دەکا لەرووی مێژوویی و تیۆرییەوە، لەنووسینی رۆشنبیر "ئانتۆنی ئاربلاستەر"ەو رێباز مستەفا لەفارسییەوە کردوویەتی بەکوردی..

کتێبی "دیموکراسی لەرووی مێژوویی و تیۆرییەوە" کە لەدووتوێی "*215*" لاپەڕەی قەبارە مامناوەندیدایە، سەرباری پێشەکییەکی عیماد عەلی بۆ کتێبەکە، بەسەر دوو بەشدا دابەشکراوە، کە لەبەشی یەکەمیداو لەچەندین تەوەرەی جیاجیادا، رۆشنایی خراوەتە سەر چەمکی دیموکراسی لەرووی مێژووییەوەو لەبەشی دووەمیشیداو لەرێی چەندین تەوەرەی جیاجیاوە، نووسەر باس لەدیموکراسی دەکا لەرووی تیۆرییەوە، ئەمە سەرباری ئەوەی لەسەرەتاکانی کتێبەکەدا "ئانتۆنی ئاربلاستەر" رۆشنایی دەخاتە سەر چەندین پێناسەی جیا بۆ چەمکی دیموکراسی..

ئەم کتێبەی "ئاربلاستەر" کە لەنەوەدەکانی سەدەی رابردوودا نووسراوە، لە لاپەڕەکانی بەراییداو کاتێ نووسەر پێناسەکانی دیموکراسی دەخاتە روو، ئاماژە بەوەدەکا: بەگوێرەی بۆچوونی "فرانسیس فۆکۆیاما"، وەك لەکتێبی "کۆتایی مێژووو دوایین مرۆڤ"دا باسیکردووە، نووسەر باس لەوەدەکا بەبۆچوونی "فۆکۆیاما" کە بەرەچەڵەك ژاپۆنییەو بەرەگەزنامە ئەمەریکی، دیموکراسی سەرمایەداری دەرخەری دواییترین و باڵاترین پێگەیشتنی دامەزراوە گەلی و سیاسی و ئابوورییەکانی مرۆڤە، هەربۆیە لەمبارەیەوەو سەبارەت بە ئەم تێزەی "فۆکۆیاما" کە لەکتێبی "کۆتایی مێژوو.." کە دوای هەرەسی بلۆکی سۆشیالیستی نووسراوە، ئاربلاستەر باس لەوە دەکا ئەگەر رووداوە ناکاوەکان بەوجۆرە بەرچاوو خێرایە ناپایەداری و نەمانی کۆمۆنیزمی دامەزرێنراو و لەهەمان کاتدا سەقامگیربوون و مەقبولییەتی دیموکراسییان لەناو سەرمایەدارییدا وەك سیستمێکی سیاسی-ئابوری نیشاننەدایە، ئەوا ئەو تێزەی "فۆکۆیاما" حوکمدانێکی سەرەرۆیانەو بەفیزدەبوو کە دەکرێ وەك گاڵتەیەکی فیکری نیازخراپانە لێکبدرابایەتەوە.

هەر لەم سەرەتایەداو دەربارەی دیموکراسی، نووسەر باس لەوەدەکا دەبوایە لەسەدەی بیستەمدا داکۆکی لەدیموکراسی بکرایە لەبەرانبەر فاشیزم بەر لەساڵی *1945*و هەروەها لەبەرانبەر کۆمۆنیزم لە سەردەمی جەنگی ساردەوە، کە ئەم بانگەشەیەی نووسەر دەرخەری ئەوەیە نووسەر بەراددەیەك لەگەڵ بۆچوونی زۆربەی ئەو فەیلەسووف و بیرمەندانەدا یەکدەگرێتەوە کە بانگەشەی دیموکراسیی لیبراڵ دەکەن. هەربۆیە، دواتر نووسەر بانگەشەی ئەوە دەکات: ئەرکێك ئێستا لەسەر شانی دیموکراتەکانە، هەوڵ و یارمەتیدانە بۆ جێگیرکردنی سیستەم و دامەزراوە گەلی دیموکراتیك لەو کۆمەڵگایانەدا کە تائێستا بەدیموکراسی ئاشنانین.

هەر لەسەرەتاکانی ئەم کتێبەدا، ئانتۆنی ئاربلاستەر باس لەوەدەکا دیموکراسی بەرلەوەی واقیعیەتێك بێ، چەمکێکە کە هیچ جۆرە مانایەکی دیاریکراوی نییەو ماناگەلێکی زۆر جیا و لێکدانەوەی جیای

لەمێژوودا بۆ کراوەو تەنانەت ئەمڕۆیش لێکدانەوەی جیای بۆ دەکرێ..

یەکێك لەو پێناسانەی بۆ دیموکراسی کراوە، بەوەی "دیموکراسی مانای حکومەتی زۆرینەیە"، ئەوە یەکێکە لەو پێناسانەی لەم کتێبەیدا ئاربلاستەر لەسەری رادەوەستێ و رەخنەی ئەوە لەو بۆچوونە بۆ دیموکراسی دەگرێ کە بەو پێناسە سادانە ناتوانین تێگەیشتنێکی وردو تەواو سەبارەت بە دیموکراسی بخەینە روو، کە دواجار ئەگەر دیموکراسی حکومەتی زۆرینەبێ، ئەی چی لەمافی کەمینەبکرێ و ئایا رەوایە مافی کەمینە پێشێلبکرێ، هەرچەندە بەدرێژایی ئەم کتێبەو کاتێ نووسەر باس لەئەزموونی دیموکراسی و هەڵبژاردن لەبریتانیادا دەکا، دەگاتە ئەو ئەنجامەی کە بەهۆی بوونی دوو پارتی زالهێزەوە لەبریتانیادا، کە لەهەڵبژاردنەکاندا هەر جارەی یەکێکیان کورسی دەسەڵات و زۆرترین کورسی پارلەمان مسۆگەردەکەن و کورسییەکانی پارلەمان لەنێوان خۆیاندا دابەشدەکەن، ئەمە لەکاتێکدایە دەشێ ژمارەیەکی زۆر هاووڵاتیان بەشدارییان لەدەنگدانیشدا نەکردبێ، بۆیە هێشتا ئەگەر لەسەر ئەو پێناسەیە بۆ دیموکراسی بووەستین کە حکومەتی زۆرینەیە، ئەو بۆچوونە بەتەواوی خۆی ساغدەکاتەوە کە دیموکراسیی بریتانیا دیموکراسییەك نییە حکومەتەکەی حکومەتی زۆرینەبێ.

نووسەر هەر لەسەرەتاکانی ئەم کتێبەیدا باس لەوە دەکا: رۆشنبیران لەسەرانسەری جیهان و بەدرێژایی مێژوو لەیۆنانی کۆنەوە تاوەکو سەردەمی هاوچەرخ، دیموکراسییان بەخراپترین جۆری حکومڕانیکردن داناوە، بەڵام لەناوەڕاستی سەدەی بیستەمەوە، ئیتر دیموکراسی لێکدانەوەی باشی بەخۆوە بینیووە..

هەر لەم سەرەتایەدا، نووسەر رۆشنایی دەخاتە سەر ئامانجی ئەم لێکۆڵینەوەیەی و ئەو پرسیارانەیش کە دەیەوێ لەرێی ئەم لێکۆڵینەوەیەوە وەڵامیانبداتەوە.

* * *

بەشی یەکەمی ئەم لێکۆڵینەوەیەی ئاربلاستەر کە تایبەتە بە قسەکردن لەسەر دیموکراسی لەرووی مێژووییەوە، لەسەرەتاکەیدا رۆشنایی خراوەتە سەر داهێنانی دیموکراسی و لەمبارەیەوە نووسەر پێناسەی دیموکراسی کردووەو دواتر رۆشنایی دەخاتە سەر بۆچوونی چەندین فەیلەسووف کە سەبارەت بە دیموکراسی دوواون، لەوانە فەیلەسووفی یۆنانی "ئەرەستۆ" کە پێیوابووە "ناکرێ حکومەتی زۆرینەی دەوڵەمەندان بەشێوەیەکی تایبەت بە دیموکراسی ناودێربکەین"، بەو مانایەی ژمارە بەتەنیا بەهای دیموکراسی دیاریناکاو هەرچ کاتێ دارایی مرۆڤ بووە پایەی حکومەت، ئەوا لەگەڵ ئۆلیگارشیدا یەکدەگرینەوەو کاتێکیش کە هەژاران حوکمڕانیدەکەن ئەوا لەگەڵ دیموکراسیدا رووبەرووین..

هەربۆیە، لەم تەوەرەیەی ئەم بەشە مێژووییەی لێکۆڵینەوەکەیدا، نووسەر نایەوێ و مەبەستی ئەوەیش نییە چەمکی دیموکراسی بەو دەربڕینانەوە ببەستێتەوە کە ناکۆکی چینایەتی و ململانێی کۆمەڵایەتی لەخۆدەگرن، ئەمە سەرباری ئەوەی نووسەر پێیوایە: دیموکراسی چ لەیۆنانی کۆن و چ لەزانستی سیاسەتی

سەدەکانی هەژدەو نۆزدەدا هەرگیز بەبێ ململانێ و ناکۆکی نەهاتووەتەدی، ململانێیەك کە بەزۆری ململانێیەکی چینایەتی بووە، کە لەسەدەی بیستەمیشدا کەم تازۆر لەهێنانەدی دیموکراسیداو لەبەشێکی زۆری وڵاتانی جیهان حاڵەتی لەوجۆرە ململانێیە بوونیان هەبووە.

هەر لەم تەوەرەیەی ئەم بەشەدا، نووسەر باس لەهەریەکە لە ئەفلاتوون و سوقرات-ی فەیلەسووف دەکا کە هەمیشە رەخنەیان لەدیموکراسی گرتووەو لەمبارەیەوە نووسەر باس لەوەدەکا: هەندێ پێیانوایە مەسەلەی بڕیاری ژەهرخواردکردنی "ئەفلاتوون" لەساڵی *399*ی پێش زایینـدا، لەهەموو شتێ زیاتر ناوبانگی دیموکراسی ئەسینایی لەکەدارو ناشیرین کرد.. هەرچەندە دواتر نووسەر دەگاتە ئەو ئەنجامەی کە ناشێ بڕیاری دادگاییکردنی ئەفلاتوون و ژەهرخواردکردنی بخەینە ملی دیموکراسی ئەسینایی و ئەنجامگیریی تایبەتی لێبخەینەوە، کە ئەو دەرئەنجامە زیاتر دەسەڵاتی کلاسیکیی دژە دیموکراتیك لەئەوروپادا دەخاتەروو، نەك سەرنجێك لەسەر دیموکراسی ئەسینایی. هەر لەم تەوەرەیەداو لەقسەکردنیدا سەبارەت بە دیموکراسی ئەسینایی، نووسەر بەردەوام دەبێ لەداکۆکیکردن لەو دیموکراسییەی کە لەئەسینادا هەبووەو جەخت لەوە دەکاتەوە سەرباری ئەوەی لەدنیای هاوچەرخدا لیبراڵەکان دیموکراسی بەهەڕەشەیەکی کاریگەر دەزانن بۆ سەر ئازادیی تاك، بەڵام ئازادیی رادەربڕین لەئەسینادا بەشێکی تەواوبووە لە دیموکراسی و هەروەها نووسەر پێی وایە: لەدیموکراسی ئەسینادا، پەیوەندییەکی ئەندامشێوەیی هەبووە کە تەنانەت دژبەرانی دیموکراتی وەکو ئەرەستۆیش دانی پیادەنێن.

لەکۆتاییەکانی ئەم تەوەرەیەدا سەبارەت بە دیموکراسی لەرووی مێژووییەوە، نووسەر باس لەوەدەکا: زۆر لەو نووسەرانەی لەسەر دیموکراسییان نووسیووە، لەوباوەڕدان ئەزموونی دیموکراسی لەیۆنانی کۆندا کەمێك لێکچوویی لەگەڵ دیموکراسی لەدنیای هاوچەرخدا هەیە. بەڵام دواتر نووسەر رەخنە لەو بۆچوونانە دەگرێ و پێی وایە مەسەلەکە بەتەواوی پێچەوانەی ئەو بۆچوونانەیە.

* * *

سەبارەت بەتەوەرەی دووەمی ئەم بەشەی کتێبی دیموکراسی، کە ئەم بەشەی بۆ قسەکردن لەسەر دیموکراسی لەرووی مێژووییەوە بۆ تەرخانکراوە، تیایدا نووسەر باس لەچەندین سیستمی جۆراوجۆر دەکا؛ کە بەدرێژایی مێژوو لەبەجێهێنانی دیموکراسیدا پیادەدەکران و نەتوانراوە لەهیچ کامیاندا بەشێوەیەکی رەها کاتی سەرهەڵدان و تێڕوانین و پیادەکردنی کاری دیموکراتییانەی هاوچەرخ پیادەبکرێ و لەمبارەیەیشەوە نووسەر باس لەرۆڵی کڵێساو خەڵکی هەژارو ئەنجومەنەکانی ئەسینا دەکا لەپیادەکردنی دیموکراسییدا، ئەمە سەرباری ئەوەی رۆشنایی دەخاتە سەر چەمکی دیموکراسی لەرووی مێژووییەوە لەوڵاتانی بریتانیاداو جەخت لەوەیش دەکاتەوە هەمیشە دیموکراسی راستەقینە لەبەرژەوەندیی خەڵکی هەژاردایە..

هەر لەمبارەیەوەو بۆ زیاتر خستنەرووی دیموکراسی

لەرووی مێژووییەوە، نووسەر ئاماژە بەبۆچوونی چەندین فەیلەسووف و بیرمەندەکا کە بەدرێژایی مێژوو سەبارەت بە ناساندنی دیموکراسی خستوویاننەتەروو، لەوانە: جۆن لوک، ریچارد ئۆڤەرتۆن، جۆن وایڵدمان، ئایرتۆن، جۆرج بۆکنان، ئێدمۆند بێرگ و چەندین رۆشنبیریتر..

* * *

تەوەرەی سێیەمی ئەم بەشەی کتێبی "دیموکراسی لەرووی مێژوویی و تیۆرییەوە"، تەرخانکراوە بۆ قسەکردن لەسەر سیاسەتی جەماوەری و تیایدا نووسەر باس لەشۆڕشی فەرەنسا دەکا کە بووە ئیلهامبەخشی سەرهەڵدانی کۆیلەکانی هایتی و بزووتنەوەکانی ئەفەریقیای باشوورو چۆنیەتی خستنەرووی مەسەلەی دیموکراسیی دەسەڵاتی خەڵك بەبێ چارەسەر، بەتایبەتی لەکاتی راگەیاندنی سەربەخۆیی ئەمەریکادا لەساڵی *1776*ی زایینیداو کاتی دارشتنی یاسای بنەرەتی و راگەیاندنی سەربەخۆیی ئەمەریکا کە لەلایەن "تۆماس جیفەرسۆن"ی سێیەمین سەرۆك کۆماری ئەمەریکاوە، راگەیاندنی سەربەخۆیی ئەمەریکا دارێژرا کە دواتر نووسەر باس لەوەیش دەکا: یاسای بنەڕەتی ئەمەریکا لەلایەن فەیلەسووفانی ئەو سەردەمەوە بەشێوەی جیاجیا لێکدراوەتەوە؛ کە گوایە تیایدا پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی دیموکراسییان لەپێشکەوتنی سیاسی جیاکردووەتەوەو هەروەها بەخشینی مافی دەنگدان بەکرێکاران لەوکاتەدا، هەستی بەرپرسیارێتیی لەهاوولاتیاندا دروستکردووە..

هەر لەم تەوەرەیەدا سەبارەت بەدیموکراسی، ئانتۆنی ئاربلاستەری نووسەر باس لەوەدەکا تەنانەت لەسەدەی بیستەمداو بەئاشکرا نارەزایی دەربڕین لەدیموکراسی هەرمایەوەو کەسانی فاشیستی وەك مۆسۆلۆنی سەرۆکی ئیتاڵیا لەنیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا، رەفتارەکانی روون و ئاشکران بۆ دژایەتیکردنی دیموکراسی و ئازادیی مرۆڤ.. دواتر نووسەر هەر لەم تەوەرەیەدا، باس لەرۆڵی بەدیموکراسیبوونی کۆمەڵگاو کاریگەرییان بەسەر زۆر لەدەوڵەتە دیکتاتۆرەکان دەکاو هەروەها سەپاندنی رژێمی دیموکراسی و پارلەمانی بەحوکمێکی حەتمی دەزانێ.

* * *

بەشی دووەمی کتێبی "دیموکراسی لەرووی مێژوویی و تیۆرییەوە"، تەرخانکراوە بۆ قسەکردن و تاوتوێکردنی چەمکی دیموکراسی لەرووی تیۆرییەوەو نووسەر ئەم بەشەی بەسەر چەندین تەوەرەدا دابەشکردووە..

تەوەرەی یەکەمی ئەم بەشەی ئەم کتێبەی ئانتۆنی ئاربلاستەر تەرخانکراوە بۆ خستنەرووی دیموکراسی وەکو حکومەتی خەڵك کە ئەمەیش یەکێکە لەپێناسەکانی کە بۆ دیموکراسی کراوەو زۆر لەبیرمەندو فەیلەسووف لەسەر ئەم ناساندنەی دیموکراسی هاوبۆچوونن کە دیموکراسی حکومەتی خەڵکەو لەمبارەیەوە لەم تەوەرەیەدا، نووسەر ئاماژە بەوە دەکا: ئەوەی بەدیموکراسی راستەوخۆ ناودەبرێ، بەو چەشنەی کە لەئەسینای کۆندا هەبووە، بەشێوەیەکی سەرسوڕهێنەرانە کۆتایی بەو جیاوازییە هێنا، واتا جیاوازیی نێوان حکومەت و خەڵك. نووسەر لێرەدا پێیوایە لەدیموکراسیی راستەوخۆدا چوارچێوەیەك فەراهەمدەکرێ کە تیایدا حکومەت و ئازادیی تێکەڵاودەبن و لەمبارەیەیشەوە دەگەڕێتەوە بۆ

ئـــەوەی هـــەر لەبـــەر ئـــەو تێکەڵابوونـــەبوو فەیلەســـووفی ناسـراوی فەڕەنسـی "جـان جـاك ڕۆسـۆ" لــەکتێبی "پــەیمانی کۆمەڵایـــــەتی"دا، پـــــلاری لەدیموکراسـی بریتانیـا گـرت و بڕوای‌وابـوو خـەڵکی بریتانیـا "تەنـها لـەو کاتـەدا ئـازادن کـە بەشداری لەهەڵبژاردنی ئەندامانی پارلـەماندا دەکـەن و هـەر دوای ئـــــەوە و دوای هـــــەڵبژاردنی ئـــــەندامانی پارلـــــەمان، دووبارەدەبنەوە بەکۆیلەی جاران. هەربۆیـە ڕۆسـۆ پێی‌وابـووە ئـەو هەڵبژاردنە بایەخی نییە".

هەر لەمبارەیەوە و سەبارەت بەخـــەڵك و حکومـــەت، یـــان حکومەتی خەڵك کە ئەم تـەوەرەی ئـــەم بەشـــە تیۆرییـــەی بـــۆ تـــــەرخانکراوە، نووســـــەر بڕوای‌وایـە: کـاتێ مـرۆڤ مـافی خۆی سەبارەت بە حوکمڕانیکردن بەسـەر خۆیـدا دەگوازێتـەوە بـۆ کەسێکی‌تر، تەنانـەت ئەگـەر ئـەو کەسە نوێنەریش‌بێ، ئیدی مرۆڤ کـە ئـەو کـارە دەکـا ئـازاد نـابێ، هەربۆیـــە ڕۆســـۆ پێی‌وابـــووە حاکمییەت بەشێوەیەکی لەدابڕان نـەهاتوو هـی خەڵکـە و ئـەوەی لەوبارەیـــەوە گرنگـــە تەنـــها دەربڕینـی چۆنیـەتی پاراسـتن و پیادەکردنیەتی.

هـەر لـەم تەوەرەیـەی ئـەم بەشـەدا، نووسـەر باس لـەئیرادەی هەمووان و ئیرادەی گشتی دەکا و پێی‌وایـە ئاسـان نییـە ئـەوەمان قـەبوڵ‌بێ کـە دانـی مـافی ڤیتـۆ بەتاکـــەکان یـــان گروپـــە کەمایەتییـــــەکان، جگـــــە لەهەلومـــەرجی زۆر نائاســـایی و تایبـــــەت، ئـــــامرازێکی دیموکراتیك‌بـێ. بـەو مانایـەی ئەگـەر هـەر کـەس و بـەگوێرەی بـەرژەوەندی یـان ئارەزووەکـانی خـۆی دەنگبـدا یـان بڕیـارێك وەربگـرێ، مـەرج نییـە ئـەوە بـــەرژەوەندیی هـــەمووان یـــان بـــــەرژەوەندیی زۆرینـــــەی لێبکەوێتەوە. کە ئەم بۆچوونـەی نووسـەر سـەد دەرسـەد ڕاسـتە، نـــەوەك مەرجنییـــە بـــەڵکو بەدڵنیاییـــەوە لەبەرئـــەوەی، هـــەروەك چـــۆن زۆربـــەی دەروونناســـان هـــاوڕان، مـــرۆڤ بوونـــەوەرێکی خۆپەرســـتە و بـــەدوای بەرژەوەندییـــەکانی دەکـــەوێ، ئەمـــە وادەکـــا بـــەرژەوەندیی کەســـێك بـــۆ کەسێکی‌تر جیـاوازبێ، تەنانـەت هـەندێ جار دژ بەیـەکیش‌بن، کـە مومکـــین نییـــە ڕژێمـــی دیموکراسـیش بتوانـێ تـەواوی بەرژەوەندییە جیاو دژ بەیەکەکان بهێنێتـە دی. هەربۆیـە، دواجـار

نووســـەر پێی‌وایـــە: تەنانـــەت یـــەکێتیی تـــێڕوانینیش زامـــن و دەســـتەبەری هێنانـــەدی چاکـــەی گشـتی یـــان هاوبـــەش نییـــە و لەمبارەیەیشـــــەوە نووســـــەر دەگەڕێتەوە بۆ "جان جاك ڕۆسۆ" کـــە پێی‌وابـــووە: بڕیارەکـــانی زۆرینــە، یــان ئــەو بڕیارانــەی بەزۆرینـــە دەدرێـــن، مەرجنییـــە پەسەندبن.

* * *

تەوەرەی دووەمی ئەم بەشە تیۆرییـــــــــەی کتێبـــــــــی "دیموکراسی.." بۆ تاوتوێکردنی حکومەتی زۆرینە تەرخانکراوە..

لـەم تەوەرەیـەدا، نووســەر جارێکی‌تر جەخت لەوە دەکاتەوە بەیەکسـان دانـانی ئیرادەی خـەڵك یـان ئـیرادەی زۆرینـە، دەشـێ پاساوێك‌بێ بـۆ سـنووردارکردنی مـــافی سیاســـی، هەربۆیـــە جـــارێکی‌ترو لـــەم تەوەرەیـــەدا سەبارەت بـە حکومـەتی زۆرینـە، نووسـەر دەگەڕێتـەوە بـۆ ئـەو بۆچوونە ڕۆسـۆییەی کـە کەمینـە حوکمڕانـی بەسـەر خۆیـدا ناکـا، بەڵکو زۆرینە حوکمڕانی بەسەردا دەکا و لـەم سۆنگەیەیشـەوە ئـەوە ئاشـکرادەبێ کەمینـە لەسـایەی حوکمڕانیکردنـــی زۆرینـــەدا ئازادنـــابێ، واتـــا کـــاتێك ڕێکـەوتنێکی گشـتی بـەگوێرەی

بنەمای دیموکراتیک نەبێ، ئەوا دەبێ مەسەلەکان بەگوێرەی ئیرادەو ئارەزووەکانی زۆرینە تاووتوێ و ڕێکبخرێن. هەربۆیە، لەمبارەیەوەو بۆ خستنەرووی ئەو سیستمە کە تیایدا مافی کەمینەیش پارێزراودەبێ، نووسەر بەپاڵپشتیی بۆچوونێکی "رۆبێرت پاوڵ وۆلف" دەگەڕێتەوە بۆ ئەو دەرئەنجامەی کە لەتەنها کۆمەڵگای ئانارشیستیدا ئازادی یان سەربەخۆیی تەواوی هاووڵاتیان پارێزراودەبێ. هەربۆیە، لەکۆتاییەکانی ئەو تەوەرەیەدا نووسەر دەگاتە ئەو ئەنجامەی: چەمکی "خەڵك" نابێ تەنها وەك زۆرینەیەکی خەڵکەکە لێکبدرێتەوەو بژمێردرێ و بەهەمان شێوەیش ناکرێ "حکومەتی خەڵك" بەحکومەتی زۆرینەو دواجار نوێنەرانی ئەو زۆرینەیە بزانرێ، چونکە گروپە کەمینەکانیش بەشێکن لەخەڵك و دەبێ بەرژەوەندیی و تێڕوانین و بیروباوەڕیان لەبەرچاوبگیرێ. ئەمە سەرباری ئەوەی لەمبارەیەوە نووسەر پێیوایە: مەرجنییە ئەم حاڵەتە هەموو جارێ مەیسەربێ، چونکە هەمیشە گەیشتن بەرێکەوتنێکی گشتی لەنێوان ڕێبازو میتۆدە تەواو لێکجیاوازەکاندا مەیسەرنابێ و دەبێ بژاردەیەکی لێبگیرێ.. هەربۆیە، دواجار ئانتۆنی ئاربلاستەر لەم تەوەرەیەدا دەگاتە ئەو بڕوایەی: هەر حکومەتێکی دیموکراتیک کە گروپە نەتەوەیی، مەزهەبی و سیاسییەکانی تیادا هەمیشە کەمینەبن و لەئۆپۆزیسیۆندابن، دەشێ حکومەت ڕەوایی خۆی لەڕووی دیموکراسییەوە لەدەستبدا.

* * *

تەوەرەی سێیەمی ئەم بەشەی کتێبی دیموکراسی، تەرخانکراوە بۆ تاوتوێکردنی بەرابەری و بەرژەوەندییە گشتییەکان لەسیستمی دیموکراسیدا و نووسەر پێیوایە: دیموکراسی بریتینییە لەهەمەرەنگیی فراوان و بڕیارە لەکۆمەڵگادا، بەڵکو دیموکراسی پێویستی بە بونیادێکە، نەك هەر بەها هاوبەشەکانی، بەڵکو ئەزموونی هاوبەشیش لەخۆبگرێ، بەجۆرێ خەڵك هەست بەو پابەندی و وابەستەییە بەرانبەر بە سیستمی سیاسیی پەیوەست بەخۆیان و متمانە بەشێوەو کارکردەکانی بکەن.

هەر لەم تەوەرەیەداو سەبارەت بە بەرابەری و بەرژەوەندییە گشتییەکان، ئاربلاستەر باس لەوە دەکا: نابێ هیچ جیاکارییەکی دیاریکراو لەنێوان بەرابەری کۆمەڵایەتی و ئابوریدا بکێشرێ، ئەمە لەکاتێکدایە پێیوایە نابەرابەری لەسامان و دەسەڵاتی ئابوریدا، جۆرێکە لەنابەرابەریی سیاسی و ناکۆکە لەگەڵ بنەمای بەرابەری سیاسی کە خۆی لەدروشمی "یەك کەس" یاخود "یەك دەنگ"یدا دەنوێنێ، بەو مانایەی هەموو شێوەکانی تری نابەرابەری کۆمەڵایەتی و نەژادیی لەگەڵ بنەمای بەرابەری سیاسییدا ناکۆکن. هەربۆیە لێرەدا جەخت لەوە دەکاتەوە: نابێ بنەمای دیموکراتییانەی بەرابەری سیاسی، تەنها بە مانای بەرابەری لەپرۆسەی دەنگدان لەبەردەم سندوقەکانی دەنگداندا بێ..

هەر لەم تەوەرەیەداو سەبارەت بەئەرکی دەوڵەت لەنابەرابەرییدا، نووسەر باس لەوە دەکا: هەمیشە لەکۆمەڵگا جیاجیاکاندا دەوڵەمەندو هەژار هەن کە بەرژەوەندییەکانیان لەگەڵ یەکتریدا ناکۆکن و لەمبارەیەوە ئەرکی دەوڵەت ئەوەیە هەردوولا بەوە رازیبکا پێکەوە بژین و

داخوازییە ڕەواکانیشیان دەستەبەربکا..

* * *

چوارەمین تەوەرەی ئەم بەشە تیۆرییەی کتێبی "دیموکراسی.." تەرخانکراوە بۆ خستنەرووی نوێنەرایەتیو هەروەها دیموکراسی ڕاستەوخۆو لەم تەوەرەیەداو لەناساندنی نوێنەرایەتی یاخود نوێنەردا، نووسەر دەگەڕێتەوە بۆ پێناسەیەکی سیاسەتمەداری بریتانی "ئەنۆرین بیڤان" کە یەکێکبووە لەپێشەوایانی باڵی چەپڕەوی ناو پارتی کرێکارانی بریتانیاو ڕۆژنامەی "تریبۆن"ی دەرکردووەو لەهەڵبژاردنەکەی سالی *1945*ی بریتانیادا کە پارتەکەی سەرکەوتنی بەدەستهێناوە بووە بەوەزیری تەندروستیو ئەو پێناسەیەیشی کە بۆ نوێنەری کردووەو لێرەدا نووسەر ئاماژەیپێکردووە، بەمجۆرەیە:

"نوێنەر؛ ئەو کەسەیە کە لەمەوقیعێکی دیاریکراو بەجۆرێ هەڵسوکەوت دەکا کە ئەو ڕەفتارەی زۆر لەڕەفتارو هەڵسوکەوتی ئەو کەسانەوە نزیکە کە ئەویان هەڵبژاردووە". بۆیە، لەم پێناسەیەی ئەنۆرین بیڤانەوە بۆ نوێنەرو نوێنەرایەتی، نووسەر لەم تەوەرەیدا دەگاتە ئەم بڕوایە: هەڵبژاردن تەنها بەشێکی نوێنەرایەتییەو ئەوکاتە دەگۆڕێ بۆ نوێنەرایەتییەکی تەواو کە کەسی هەڵبژێرراو بەهەمان ئاوازی ئەو کەسانە لێیدا کە ئەویان هەڵبژاردووە.

هەر لەم تەوەرەیەی ئەم بەشەدا، هەروەك چۆن نووسەر خۆیشی جەختی لێدەکاتەوە، بایەخی بە دوو خاڵ داوە، کە یەکەمیان ئەوەیە: ئەگەر بەو ئەنجامەیش بگەین: دیموکراسی نوێنەرایەتی لەبارودۆخو ڕەوشی هەنووکەی کۆمەڵگا هاوچەرخەکان باشترین جۆری دیموکراسییە کە دەستی پێڕابگا، ئەنجامدانی تەواو یان بنەمای نوێنەرایەتی لەگەڵ ئەوەی کە ئێستا (مەبەست کۆتاییەکانی سەدەی بیستەمە) لەدامەزراوە سیاسییەکاندا ڕەنگیانداتەوە مەودایەکی زۆری هەیە.

خاڵی دووەم کە نووسەر لەم تەوەرەیەی ئەم بەشەی کتێبەکەیدا بەلایەوە گرنگە قسەی لەسەربکا، ئەوەیە: دەرفەتی بەدیهێنانی فراوانی دیموکراسیی ڕاستەوخۆ زۆر زیاترە لەوەی کە لەحاڵی حازردا باوەو هەندێ لەو گۆڕانکارییە تازانەی تەکنەلۆژیا، جێبەجێکردنیانی بەبەراورد بەسەدەیەك لەمەوبەر ئاسانترکردووە، بەڵام بەپێچەوانەی ئەو ڕەوشەوە دیموکراسیی ڕاستەوخۆ لەزۆربەی کۆمەڵگا هاوچەرخەکاندا ئامادەییەکی کەمی هەیە؛ کە ئەوەیش هۆکارەکەی زیاتر سیاسییە وەك لەوەی تەکنیکی بێ.

* * *

"ڕەزامەندی، ئازادی، دیالۆگ"، پێنجەمین تەوەرەی ئەم بەشەی کتێبی "دیموکراسی.."یە؛ کە تیایدا نووسەر لەڕوانگەی خستنەرووی ئەو سێ چەمکەوە زیاتر لەڕووی تیۆرییەوە چەمکی دیموکراسیمان پێدەناسێنێ. بۆ نمونە لەقسەکردنیدا لەسەر ڕەزامەندیو دواجار ئازادیو پەیوەندییان بە دیموکراسییەوە، نووسەر باس لەوە دەکا: دەنگدانی خەڵك بۆ ئەوەی دەسەڵاتو مافەکانی خۆی لەناوببات، ناشێ بەهەنگاوێکی دیموکراتییانە لێکبدرێتەوە، وەك ئەوەی کە ئەگەر مرۆڤ ئازادانە چاو لەئازادی خۆی بپۆشێ واتا ڕەزامەندبێ، ئەوا وەك کەسێکی ئازاد دەمێنێتەوە. لەمبارەیەوە نووسەر ڕەخنە لەو جۆرە

هەڵوێستانە دەگرێ‌و پێی‌وایە:

ئەو چاوپۆشینە لەئازادی، هەنگاوێکی ئازادانە نییەو بۆ ئەوەیش نییە کە دیموکراسی درێژە بەژیانی خۆی‌بدا، هەروەها لەپێناو ئەوەیشدا نییە کە دەبێ دەسەڵات لەلای خەڵك بمێنێتەوە، بۆیە ئەگەر خەڵك ئازادانەو بەمەیلی خۆیشیان ئەو دەسەڵاتە لەخۆیان بسێننەوە ، یا ئەو هەنگاوە لەلایەن خەڵکیشەوە پێشوازی‌لێبکرێ، ناکرێ بەهەنگاوێکی دیموکراسییانەی دابنێین.

سەبارەت بە چەمکی ئازادی‌و کاریگەریی لەرژێمی دیموکراسیدا، لەم تەوەرەیەدا ئاربلاستەر دەگاتە ئەو ئەنجامەی: ئەگەر تەنانەت پێناسە سنووردارەکانی دیموکراسیشمان قەبوڵبێ، پێشمەرجی ئازادی بۆ دیموکراسی، پێشمەرجێکی تەواو دروستەو ناکرێ فەرامۆشبکرێ. سەبارەت بەچەمکی "دیالۆگ"یش، نووسەر پێی‌وایە: دیالۆگ نیشانەی قەبوڵکردنی رادەیەکە لەئازادی.

هەر سەبارەت بە ئەم سێ چەمکە کە پەیوەندیی راستەوخۆیان بەخەڵکەوە، یاخود هاووڵاتیانەوە هەیەو دواجار رۆڵی گرنگیان هەیە لەهێنانەدیی رژێمێکی دیموکراسیدا، لەم تەوەرەیەدا نووسەر ئاماژە بەوەدەکا: لەدیموکراسیدا خەڵك، نەك دەوڵەت‌و پارلەمان، حوکمڕانیدەکەن، بۆیە ئەرکی دەوڵەت قەبوڵکردن‌و بەجێگەیاندنی خواستی خەڵکییە.

* * *

دوایین تەوەرەی ئەم بەشە تیۆرییەی ئەم کتێبە تایبەتە بەئەنجامگیرییەکانی نووسەر کە لەمیانەی لێکۆڵینەوەکەیدا سەبارەت بەدیموکراسی لەرووی مێژوویی‌و تیۆرییەوە پێیگەیشتووە..

لەمیانەی ئەم ئەنجامگیرییەدا، لێکۆڵیار جەخت لەوە دەکاتەوە: ئەگەر ئەو هەڵێنجانەی لەو لێکۆڵینەوەیەدا کە سەبارەت بەدیموکراسی خراونەتە روو دروستبن، ئەوا هێشتا دیموکراسی لەناو بەرنامە سیاسییە نوێیەکاندا کارێکی نیوە ناچڵە؛ تا ئەوکاتەی کە مافی دەنگدانی گشتی دەستەبەردەکرێ، یان ئەوکاتەی هەڵبژاردنی جەماوەری دەبێتە بەشێکی گرنگی سیستمی سیاسی، هێشتا لەگەڵ هاتنەدی تەواوی دیموکراسی مەودایەکمان هەیەو لەرووی مەنتقیشەوە دەبێ ئەو دەستکەوتە گرنگ‌و پڕ بایەخە وەك یەکەمین هەنگاو لەپرۆسەی هێنانەدیی کۆمەڵگایەکی تەواو دیموکراتیکدا بنرخێنرێن.

هەر لەم ئەنجامەی لێکۆڵینەوەکەیدا، لێکۆڵیار دەگاتە ئەو بڕوایەی: لەبنەمای دیموکراسیدا، لۆژیکێك هەیە کە ئەویش سۆشیالیزمەو هەروەها لێرەدا لێکۆڵیار دەگاتە ئەو ئەنجامەیش: ئەگەر بمانەوێ کۆمەڵگایەکی دیموکراتیك بهێنینەدی، کارو هەنگاوێکی زۆر ماون کە دەبێ ئەنجامیانبدەین..

هەروەها لێکۆڵیار پێی‌وایە: کاڵفامییە ئەگەر پێمانوابێ دیموکراسییە خۆرئاواییەکان تاکە خاوەنی دیموکراسین‌و ئەزموونێکی لەباریان لەو بوارەدا هەیە. بەو مانایەی ئەمڕۆکە هەندێ وڵات لەهەندێکی تریان دیموکراتی‌ترن، بەڵام ئەگەر پێوەرە راستەقینەکانی دیموکراسی بەکاربێنین، رەنگە هیچ کامیان ئەوەندە دیموکراتیك نەبن.

دواجار دەشێ ئاماژە بۆ ئەوەیش بکەین: ئەم

لێکۆڵینەوەیەی "ئانتۆنی ئاربلاستەر" بەپاڵپشتیی زیاتر لە (*100*) سەرچاوەی ئینگلیزی نووسراوەو بەزمانێکی پاراو و لەفارسییەوە کراوە بەکوردیو بەچاپێکی جوانو لەلایەن بەرێوەبەرێتیی خانەی وەرگێرانی سەر بەوەزارەتی رۆشنبیری چاپکراوە؛ کە شایانی دەستخۆشییەو کتێبەکەیش ژمارە سپاردنی (*354*)ی وەزارەتی رۆشنبیریی حکومەتی هەرێمی کوردستانی پێدراوە.

## دوو خەون
## خەونی فرناند و بیسوای شاعیر
## خەونی ئەنتون چیخۆفی چیرۆکنووس

### ئەنتونیو تابوجی
### لە عەرەبییەوە: فەرهاد


فرناندوبیسوا

### خەونی فرناندو بیسوا

لە شەوی *7*ی ئازاری ساڵی *1914*دا شاعیر و هونەرمەند فرناندو بیسوا خەونی بینی کە بەئاگادێت.

لەو ژووره چکۆڵەیەدا کە بە کرێی گرتبوو، قاوەیەکی هەڵدا، ریشی تاشی و جلێکی شیکی لەبەرکرد، لەبەرئەوەی دەباری پاڵتۆبارانیەکەی لەبەرکرد. کە چوە دەرێ سەعات حەوت و چل دەقیقە بوو، لە هەشتی تەواودا گەیشتە وێستگە سەرەکیەکەی شەمەندەفەر، چوە سەر ئەو هێڵەی کە شەمەندەفەرەکەی بەرەو سانتاریم دەچوو، لە سەعات هەشت و پێنج دەقیقەی رێکدا شەمەندەفەر کەوتە رێ، فرناندو بیسوا لە فارگۆنێکدا جێگای بۆ خۆی پەیدا کرد. ژنێکی تەمەن نزیک بە پەنجا ساڵیش هەر لەوێدا دانیشتبوو دەیخوێندەوە. ژنەکە دایکی فرناندو بوو دایکیشی نەبوو، بەڵام نوقمی خوێندنەوە بوو. فرناندو بیسوایش دەستی بە خوێندنەوە کرد، دەبوو لەو رۆژەدا دوو نامە بخوێنێتەوە، نامەکان لە باشووری ئەفریقاوە گەیشتبوون، باسیان لە سەردەمی منداڵیەك دەکرد کە زۆری بەسەردا تێپەڕیبوو.

–من وەك گیا وابووم، کەسێك نەیڕنیوم.

ژنە تەمەن نزیك بە پەنجا ساڵیەکە ئەمەی لە ناکاوێکدا وت. فرناندو بیسوا خۆشی لەو رستەیە هات و لە دەفتەری یادەوەریەکەیدا تۆماری کرد.

سروشتە واڵاکەی ریباتیجو، بە کێڵگەی برنج و مێرگەکانیەوە تیژ بە بەرچاویاندا تێدەپەڕین.

کە گەیشتنە سانتاریم، فرناندو بیسوا گالیسکەیەکی بە کرێ گرت. لە گالیسکەوانەکەی پرسی: ئایا ماڵێکی دووری سپیکارکراو دەزانێت؟

گالیسکەوانەکە پیاوێکی قەڵەوی کورتە بالا بوو، مەی لووتی سوورکردبووەوە.

وەڵامی فرناندوی دایەوە: بەڵێ دەیزانم، ئەوە ماڵی جەنابی کاییرۆیە، زۆر باشی دەناسم. پاشان قامچیەکەی هەڵسوڕاند و ئەسپەکان بە درێژایی شەقامە سەرەکیەکە کە دارخورما ئەمبەر و ئەوبەری گرتبوو لە غاریاندا، لە کێڵگەکاندا سابات دەبینرا، لە بەردەرگاکانیشدا رەش پێستەکان وەستابوون.

بیسوا لە گالیسکەوانەکەی پرسی:

—ئێستا ئێمە لە کوێین؟ بۆ کوێم دەبەیت؟

—ئێمە لە باشووری ئەفریقادایین، دەتبەم بۆ ماڵی جەنابی کاییرو.

بیسوا لەسەرخۆ پاڵی دایەوە، ئاە، کەواتە ئێستا ئەو لە باشووری ئەفریقادایە، ئەمە ئەوەیە کە خۆزگەی بۆ دەخواست. ئارام قاچی نایە سەرقاچی و پاژنەی خۆی لە ژێر پانتۆڵەکەیەوە بینی. دەرکی کرد منداڵە، ئەمە زۆری دڵخۆش کرد، پێی خۆشبوو منداڵ بێت و بە باشووری ئەفریقادا بگەڕێت. پاکەتە جگەرەکەی دەرهێنا و جگەرەیەکی بە چێژەوە پێ کرد، بە چێژی زیاترەوە مژی لێدا.

لە خانوە سپییەکە نزیک کەوتنەوە کە بەسەر گردێکەوە بوو، گردەکە داری ئورزی پێوە بوو، ئێوارەیش داکەوتبوو، ماڵەکە لەسەر شێوەی ماڵە ناسراوەکانی ڕیباتیجو، درێژو نزم و سەقفەکەی خشتی سوور بوو.

گالیسکەکە لە شەقامە سەرەکیەکە لایدا، لە ژێر پێچکەکانیدا گوێیان لە دەنگی شریخەی بەردەکان بوو. لە دوورەوە سەگێك دەوەڕی.

پیرێژنێکی چاویلکە لە چاو بە سەرپۆشێکی سپییەوە لە بەردەرگاکەدا وەستابوو. بیسوا یەکسەر زانی ئەوە پووری گەورەی ئەلبرتو کاییرویە، لەسەر پەنجەی پێی وەستا و سەر گۆنای ماچ کرد؛ ژنە پیرەکە وتی:

—ئەلبرتوی ئازیزم زۆر ماندوو مەکەن، باری تەندروستی زۆر خراپە.

ژنە لەلایەکەوە وەستا، بیسوا چوە ژورێ، بەرەو ژورێك بە کەلوپەلی سادە ڕێك و پێك کرابوو، زۆپایەکی بچووك، دۆڵابێکی کتێب و یەکێکی پڕ لە قاپ و قاچاخ، قەنەفەیەك و دوو کورسی، ئەلبرتو کاییرو لەسەر کورسیەکیان دانیشتبوو، سەری بۆ پێشەوە دانەواندبوو، ئەوە جەنابی نیکولاسی مامۆستای قوتابخانەی باڵای بوو. فرناندو بیسوا کەمێك بۆی چەمایەوەو وتی: نەمزانی تۆ کاییرویت. ئەلبرتو کاییرو ئاماژەیەکی ساردی بۆ کرد کە نزیك بێتەوە.

—بیسوای ئازیز وەرە پێشێ، خۆم داوەتی ئێرەم کردوون، بۆ ئەوەی ئاگاداری ڕاستیەکان بن.

لەوکاتەدا پووریێ سینیەك کاتۆو چای هێنا، کاییرۆ و بیسوا دەستیان کرد بە خواردن و خواردنەوەی کاتۆ و چایەکە.

بیسوا دەرکی بەوەکرد کە نابێت پەنجە تووتەی درێژ بکات، ئەوە کارێکی بە ئەدەب نەبوو. بەروانکەی مەلەوانیەکەی ڕێك خست و جگەرەیەکی داگیرساند.

—تۆ مامۆستای منیت.

بیسوا ئەوەی پێوت.

کاییرو هەناسەیەکی هەڵکێشا و پاشان بزەیەك گرتی.

—ئەمە چیرۆکێکی درێژە، ئەگەر بە وردی بۆتان بگێڕمەوە بێ مانا دەردەچێت. بەڵام دەبێت ئەوە بزانن، من ئێوەم.

—دەبێت ئەمەم بە درێژی بۆ باس بکەیت.

—من گەوهەرە زۆر قووڵەکەتانم، گەوهەرە تاریکەکە، بۆیە من مامۆستاتانم.

لە بورجی گوندێکی نزیکەوە زەنگی سەری سەعاتەکان لێیدەدا.

بیسوا وتی: ئەی دەبێت من چی بکەم؟

کاییرو وتی: دەبێت گوێتان لە دەنگم بێت، لە خەو و بێداریدا دەمبیستن، هەندێك جار بێزارتان دەکەم، زۆر جار حەز لە گوێ گرتنم ناکەن، وەلێ لەسەرتان پێویستە گوێم بۆ ڕادێرن، دەبێت هێند بوێربن کە گوێ لەو دەنگە بگرن، ئەگەر

دەتانەویت ببنە شاعیریکی گەورە.

بیسوا وتی: ئەوە دەکەم، بەڵێنتان ئەدەمێ، بیسوا هەستا و ماڵئاوایی کرد، گالیسکەوانەکە لەبەردەرگا چاوەڕێی بوو. ئێستا وا گەڕاوەتەوە بۆ لاوی و سمێڵی هەیە.

گالیسکەوانەکە وتی: بۆ کوێت بەرم؟

—بمبە بۆ کۆتایی خەونەکە، ئەمڕۆ جەژنی ژیانمە.

ئەمڕۆ هەشتی ئازارە، لە پەنجەرەکەی بیسواوە هەتاوێکی نەرم دەهاتە ژورێ.

فرناندو بیسوا: لیسابون *1888–1935* بە منداڵی باوکی مرد، لە باشوری ئەفریقادا چوە قوتابخانە، چونکە باوە پیارەکەی باڵیۆزی پورتوگال بوە لەوێ، بڕوای بە بلیمەتی خۆی هەبوو. هەمیشە لەوە دەترسا ڕۆژێك لە ڕۆژان وەك نەنکی - لە باوکیەوە - شێت بێت. هەستی بەوە دەکرد چەند کەسێکە و ئەم حەقیقەتەی لە ئەدەب و ژیاندا قبووڵ بوو. ئەلبرتو کایرو مامۆستای ئەو و کۆمەڵێك شاعیری تری دەنگی لەو جیاوازبوون. تەندروستی ئەلبرتو کایرو زۆر خراپ بوو. لەگەڵ پورێکی پیریدا لە خانوویەکی گوندیانەدا دەژیا لە ریباتیجو. بیسوا وەك وەرگێڕ لە کۆمپانیا بازرگانیەکاندا کاری دەکرد، زۆربەی ژیانی لە خانوویەکی خاکیانەی کرێدا دەژیا، تەنیا بۆ جارێك و بۆ ماوەیەکی کەم لەگەڵ ئوفیلیا کویرۆزدا کەوتە دنیای خۆشەویستیەوە. کویرۆز و لە شوێنێکی بازرگانیدا تایپی دەکرد.

"ئاهەنگی جەژنی ژیانی" ڕۆژی هەشتی ئازاری *1914*ە، کاتێك شاعیرەکانی ناوەوەی بۆ یەکەم جار دەستیان بە نووسین کرد.


چیخۆف

### خەونی ئەنتوان چیخۆفی چیرۆکنووس.

شەوێك لە شەوانی ساڵی *1890* کە ئەنتوان چیخۆفی نووسەر و پزیشك سەردانی زیندانیەکانی دوورگەی سخالین دەکات، خەونێك دەبینێت. خەونەکەی ئەوەیە کە لە پێشی خەستەخانەیەکدایە و بە زۆر چاکەتێکیان لەبەرکردووە. لە پاڵیا دوو پیری لاواز پاڵکەوتوون و سیمای شێتیان پێوە دیارە. چیخۆف تەواو بە ئاگا و مێشك و بیری ساف و لە خۆی دڵنیا بوو. ئارەزووی نووسینی چیرۆکێکی دەکرد لەسەر ئەسپێك. پزیشکێك بە بەرگی سپیەوە هات، چیخۆف داوای کاغەز و قەڵەمی لێ کرد. پزیشکەکە پێی وت:

—تۆ ناتوانیت بنووسیت، چونکە سەرت پڕە لە وێنای تیوری، تۆ ئاکاریەکی هەژاریت. شێت ناتوانێت ئەمە بکات.

چیخۆف لێی پرسی: ناوت چییە؟

—ناتوانم ناوی خۆمت پێ بڵێم، وەلێ دەبێت ئەوە بزانیت کە من نووسەرم خۆش ناوێت و ڕقم لێیانە، بە تایبەت ئەوانەیان کە زۆر وێنای تیوریان هەیە، تیور دنیا وێران دەکات.

چیخۆف حەزی کرد تێی بسرەوێنێت، وەلێ لەو کاتەدا پزیشکەکە قەڵەمی لێوی دەرهێناو لێوی سوورکرد.

باروکەیەکیشی کردە سەری و وتی:

—من سستەرەکەتانم، بەڵام ئێوە ناتوانن بنوسن، چونکە لە سەرتاندا زۆر وێنای تیوری دەکەن، ئێوە تەنیا کابرایەکی ئاکارین، بۆ سخالین بە جلیماڵەوە هاتوون.

بەدەم قسەکانیەوە چاکەتە زۆر پۆشەکەی چیخۆفی داکەند.

چیخۆف وتی:

—ئێوە شەیتانێکی هەژارن، هیچ لە ئەسپ نازانن.

—بۆ دەبێت لە ئەسپ بزانم؟ من تەنیا بەڕێوەبەری خەستەخانەکەم دەناسم.

—بەڕێوەبەرکەتان کەرە، کەر نییە هێسترە، دەبوو لە ژیانیا بەرگەی هەندێك شتی بگرتایە.

پاشان چیخۆف لەسەر قسەکانی رۆیشت: لێم گەڕێ بابنووسم.

پزیشکەکە وتی: تۆ ناتوانیت بنووسیت، چونکە تۆ شێتیت.

دوو پیرەکەی پاڵی ئەملاو ئەولایەکیان کرد، یەکێکیان بۆ میز کردن هەستا.

چیخۆف وتی: گرنگ نییە، من خەنجەرێکتان دەدەمێ. بۆ ئەوەی بیخەنە ناو ددانتانەوە. بەو خەنجەرەی ناو دەمتان بەڕێوەبەری خەستەخانەکەتان ماچ دەکەن. ماچی ئاسنینی یەکدی دەکەن.

چیخۆف بەلایەکی تریدا وەرچەرخا و بیری لە ئەسپێك کردەوە، هەر ئەسپێك و گالیسکەوانێك، گالیسکەوانێکی کلۆڵ، کە دەیویست چیرۆکی مەرگی کوڕەکەی بۆ یەکێك بگێڕێتەوە، وەلێ کەس گوێی لێ نەدەگرت.

چونکە کەس کاتی نەبوو، بە بێزارکەریان دەزانی. بۆیە بێجگە لە ئەسپەکەی کەس نەبوو گوێ بۆ چیرۆکەکەی بگرێت. ئەو ئاژەڵە بە ئارامە، چاوی ئەسپە پیرەکە لە چاوی مرۆڤ دەچوو.

لەو چرکەساتەدا دوو ئەسپ بە فرکان هاتن، دوو ژن بەسەریانەوە بوون کە چیخۆف دەیناسین. هەردووکیان ئەکتەر بوون. چڵێکی گوڵ گرتووی دارگێلاسیان بە دەستەوە بوو. گالیسکەوانەکە ئەسپەکانی بە پێشی گالیسکەکەیدا بەست، چیخۆفیش لە پاڵیاندا دانیشت، گالیسکەکە لە بەردەمی خەستەخانەکەدا بەرزبووەوە، لە پەنجەرەیەکەوە جێگای بۆ خۆی کردەوە و بەرەو ئاسمان تێی تەقاند. کە بە ناو هەورەکاندا دەفرین، پزیشکە باروکە لەسەرەکەیان بینی چۆن ئاماژەیان بۆ دەکات و بە تووڕەییەوە جوێنیان دەداتێ. ژنە ئەکتەرەکان گوڵە گێلاسەکانیان بەردایەوە خوارێ، گالیسکەوانەکە بە زەردەخەنەیەکەوە وتی: دەمەوێت چیرۆکێکتان بۆ بگێڕمەوە، چیرۆکی داماویەکە، بەڵام دەزانم ئێوە دەتوانن تێم بگەن، ئەی چیخۆفی خۆشەویست.

چیخۆف پاڵیدایەوە، ملپێچەکەی لە ملیەوە پێچاو وتی: من کاتم زۆرە زۆریش بە ئارامم. چیرۆکی خەڵکیشم پێ خۆشە.

**سەرچاوە**

سایتی ئیلاف – *22*/ ئیبریل/ *2003*.

## چۆن مۆدێرنێتە لە ڕێڕەوی خۆی لایداو گۆردرا بۆ پێچەوانەکەی؟

**نوسینی: هاشم سالح**

**لە عەرەبییەوە: ئەحمەد فاتیح محەمەد**

**خیانەتی رۆشنگەری**

**ژان کلود گیبو**

**پاریس** – *2003*



هاشم سالح

ماوەی چەند ساڵێکە ڕۆشنبیران لە ئەوروپا و ئەمریکا لە هەوڵی دیاریکردنی قەیرانی مۆدێرنێتەدان و چارەسەر و پێشنیارەکانیش لەبیریارێکەوە بۆ بیریارێکی دی جیاوازە، بەڵام کۆدەنگیەك هەیە کەوا شارستانیەتی ڕۆژئاوا لە قەیراندایە و توشی نەخۆشیەکی قورس بووە. ئەم نەخۆشیەش لە کۆمەڵێك لادانا بەدەردەکەوێت ، وەك نوقم بوون لە خواردنەوەی زۆری کهول و ماددە بێهۆشکەر و سەرکەرەکاندا و، دابەزین بۆ جۆرەها کاری نائاسایی(شذوذ). هەروەها کەوتنەخوارەوە بۆ ئامێزی نەبونیەت و ڕێژەیی کە جیاوازی لەنێوان ڕاست و هەڵە ، باش و خراپدا ناکات. بەم جۆرە هەموو ئەو روخسار و دەنگدانەوانەی کە رەفتاری مرۆییان کۆنترۆڵ و ئارام دەکرد و لە هەموو ئەو لادانانە پارێزگاریان دەکرد کە جەستە و ڕۆحی تێکدەشکاند لەناوچوون و پێودانگی گشتی گەردوون کە بەسەر کۆمەڵگای گشتی مرۆڤایەتیدا جێبەجێ دەبێت بوو بە بڵقی سەر ئاو.بەم شێوەیە هەموو مرۆڤێك داوای مافی پێکهێنانی مۆراڵێکی تایبەت بەخۆی دەکات کە پەیوەندی بەکۆمەڵ و هیچ کەسێکی دییەوە نەبێت، هیچ ئاکارێك لە ئاکارێکی دی باشتر نییە. بەپێی تیوری ڕێژەیی نەك ڕێژە هەمووشتێك هاوتایە.ئەم دۆخە و کۆمەڵێك بابەتی تر بیریاری فەرەنسی ( ژان کلود گیبۆ)ی نیگەران کرد، بۆیە کتێبێکی لەژێر ناونیشانی (خیانەتی ڕۆشنگەری ، بەدواداچوونی داچڵەکینی سەردەم لە ئەوروپا) نوسی. لە ڕۆژئاوا قەیرانی مانا هەیە، تەنانەت تینویەتیەکی زۆریش بۆ مانا: مانای ژیان و بوون. مرۆڤی ڕۆژئاوایی دوای دەستەبەرکردنی هەموو شتێك و تێربوون لە ماددیات و چێژو پێویستیەکانی، هەست بە جۆرێك نەبوونی و برسێتی دەکات لە ژیانیدا، جگە لە پێویستی بۆ خواردن و خواردنەوە و چێژە هەستپێکراوەکان و خۆشگوزەرانی ئابوری. بۆیە قەیرانی مرۆڤی ڕۆژئاوا لەرووی چۆنایەتیەوە لە قەیرانی مرۆڤی عەرەبی–ئیسلامی جیاوازە ، باشتر وایە بڵێین زیاد لە پێویست نەرم و ناسکە. بیریاری ناوبراو بەشێوەیەکی دڵسۆزانە و پربایەخەوە ئەو کێشەیە دەخاتە ڕوو، بەیەك ڕۆحی تێگەیشتن و لە دیدێکی فراوان و لێپرسراوانەوە گفتوگۆی کێشەکانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا دەکات. بێگومان بابەتەکانیش تێکەڵاو ناکات و ناکەوێتە نێوان مەیلی گونجاندن و جیاوازییەوە، کێشەکان بتوێنێتەوە یا بیسڕێتەوە لەبری چارەسەرکردنێکی ئازایانە و روون و ئاشکرا.

کاتێك رەخنە لە مۆدێرنەی ڕۆژئاواو ئەو دۆخەی ئیمڕۆ تێدایە دەگیرێت، مانای بانگێشەکردن و گەڕاندنەوە نییە بۆ ئەو بۆچوونانەی کە پارێزگاران و توندڕەوەکان خوازیارین، بەڵکو مەبەستی گەڕاندنەوەیە بۆ ڕێگای ڕاست، بۆ فەلسەفەی گەورە (فەلسەفەی ڕۆشنگەری) کە پێش دووسەد ساڵ دامەزراوەو هاتۆتە بوون. ئەگەر ئێستا مۆدێرنە کۆمەڵێك کەموکوڕی و بۆشایی دیار و ئاشکرای هەبێت، بەهیچ جۆرێك

ئاماژە نییە بۆ پاشگەزبوونەوە لە پرانسیپە گەردونی و شارستانیەکان. بەپێچەوانەوە دەبێت زیاتر و زیاتر خۆمان بەو بارودۆخە جیهانیەوە ببەستینەوە کە تیایدا پێودانگەکان هەرەسیان هێناوەو تواونەتەوە و لەلایەک تەنها پێودانگە بازرگانی و بەکاربەرەکان بوونیان هەیە، لەلایەکی تر پێودانگی ئوسولیە توندڕەوەکان. لەم ململانێیەی ئێستادا کە لەسەر فراوانترین بواردا بەردەوامە، لەنێوان جیهانگیری سەرمایەداری دڕندە و هێزە ئوسولیە دەمارگیرە تیرۆریستەکاندا، دەبێت بگەڕێینەوە بۆ فەلسەفەی رۆشنگەری کە شارستانیەت و مۆدێرنەی دامەزراندووە و پەنا بۆ دەنگی ئەقل و لۆژیك ببەین.

ژان کلۆد گیبو دەڵێت : پرۆژەی رۆشنگەری گەورەترین دەسکەوتی مرۆڤایەتیە تا ئێستا. مۆدێرنەی رۆژئاوا بۆ یەکەمجار لە مێژوودا مرۆڤی گەیاندە قۆناغی تاکی ئازاد و سەربەخۆ و هیچ هێزێکی تاریك (لاهوتی و سەرکوتکەر) نییە فشاری بخاتە سەر و کۆنترۆڵی بکات. سەرەتا مۆدێرنە مرۆڤی لە کۆتی هەژاری و برسێتی رزگار کرد، تەنانەت هەژارو مرۆڤی ئاسایی ئێستا لە رۆژئاوا، زۆر باشتر لە پاشاو وەزیرەکانی سەدەی شانزەو حەڤدەهەم ژیان دەگوزەرێنن. هەروەها لە ماوەی سەدەیەکدا پێنج بەرامبەر توانای کڕین زیادی کردووە و کاتژمێری ئیشوکار کەمتربۆتەوە، کاتەکانی ئیسراحەت و خۆشی و کات بەسەربردن زۆربووە. وەلێ کەل و پەلی بەکاربەر بەجۆرێك زۆر بووە ئەگەر سەردانی بازاڕەکانی ئەورووپا بکەیت و بە شەقامەکانیدا گوزەر بکەیت توشی سەرسامی دەبیت، بەتایبەتی ئەگەر لە ولاتانی جیهانی سێهەمەوە بچیت. هاولاتیانی ئەورووپای رۆژهەلات لەدوای هەرەسهێنانی کۆمۆنیزم ،سەردانی ئەورووپای رۆژئاوایان کردبوو و توشی شۆك و هەڵچوون ببوون، باوەڕیان نەدەکرد ئەو هەموو خۆشییە بەربلاوەی کۆمەڵگای سەرمایەداریان بینی، لە کاتێکدا لە بازارو دوکانەکانی خۆیاندا شتێکیان دەست ناکەوێت بۆ خواردن.

هیچ مرۆڤێکی رۆژئاوایی لە خودی خۆی ناترسێت ئەگەر بۆچوونی خۆی سەبارەت بە (ئاین، سیاسەت، ژیان) بەشێوەیەکی گشتی دەربڕێت و کەس فشاری بۆ ناهێنێت بۆ بڕوابوون یان نا، بۆئەوەی ممارەسەی سروش و بۆنە ئاینیەکان بکات یان رۆژانی یەك شەممە بچێتە کەنیسە یاخود نەچێت. لە ژیاندا تۆ ئازادی، بەمەرجێك زیان بە کۆمەڵ و دەوروبەر نەگەیەنیت، گرنگ ئەوەیە هەڵسوکەوتت رێك و راست بێت و گرنگی بە بەرژەوەندی گشتی بدەیت و مەسەلەکانی دی پەیوەندی نێوان تاك و خودایە.

بۆیە کاتێك باس لە قەیرانی شارستانیەتی رۆژئاوا دەکەین ، مانای ئەوە نییە ئەم شارستانیەتە لەسەر لێواری هەرەسە یا هەموو شتێك هەڵەیە و لادانە لە رۆژئاوادا، وەك لە سەرەتای ئەم نوسینەدا دێتە بەرچاو، نەخێر تەنها مەبەستمانە بڵێین دەکرێت ئەم شارستانیەتە باشتر بێت، بەشێوەیەکی تایبەتی دەمانەوێت بڵێین هەرشتێك سەرکەوتن بەدەستبهێنێت راستەوخۆ دەگۆردرێت بۆ شتێکی کەم وێنە و ئەزمونێکی بالا و پێوانەیی و هەندێك جار زۆرەملێ. بەمانای مۆدێرنە رەق هەڵگەڕاوەو کلسی کردووە و هەندێك جار گۆردراوە بۆ پێچەوانەکەی. دوای سەرکەوتنی رۆژئاوا بەسەر رۆژهەلاتدا یا

سەرمایەداری بەسەر کۆمۆنیستدا، زۆربەی ڕۆژئاواییەکان شانازییان بەو شارستانیەتەوە دەکردو کەم و کورییەکانیان لەیادچوو، تەنانەت سەرەکیترین بابەت کە بیری مۆدێرنە لە بیری پێش خۆی جیادەکاتەوە لەبیرچوو، واتە ڕۆحی ڕەخنەگرتن و ئازادی ڕەخنە. ژان کلۆد گیبو ڕاشکاوانە دەڵێت: بۆیە ڕۆژئاوا لە قەیراندایە، چونکە ڕۆحی ڕەخنەگرتن لەسەر خۆی جێبەجێ ناکات. بێگومان ڕەخنەش ناوەرۆکی مۆدێرنەیە، ئەمەش بۆتە فاکتەری سەرکەوتن بەسەر شارستانیەتەکانی تردا، وەك شارستانیەتی (بووزی، کۆنفۆشیۆس، عەرەبی - ئیسلامی...هتد).

ئەمەش بەو مانایەی ئەگەر ئازادی ڕەخنەگرتن نەبوایە (نە ڕۆژئاوا، نە مۆدێرنە، نە شارستانیەت) نەدەبوو. ئەم ئازادییەش وەك ئیمانوێل کانت دامەزرێنەری ئەقلانیەتی ڕوشنگەری دەڵێت سنوری نییە. کانت دەڵێت: (سەدەی ئێمە - سەدەی هەژدە ، سەدەی ڕۆشنگەری - سەدەی ڕەخنەیە و دەبێت هەموو شتێك ئامادەی ڕەخنەبێت، تەنانەت بیروباوەڕەکانی ئاینی مەسیحی کە زۆر لەلایەن گەلانی ئەوروپاوە پیرۆزن). بەڵام سەرنج دەدەین دوای دووسەد ساڵ بەسەر تێپەربوونی مۆدێرنەدا، مۆدێرنە خیانەتی لە کانت کردووەو ناچێتە ژێر سەنگی پرسیارو ڕەخنەوە و گۆردراوە بۆ ڕاستیەکی ڕەها لە ئەزموون و ئازادیدا، لە کاتێکدا هەمیشە پرسیارێکی کراوەبووە.

لێرەوە زۆر لە ڕۆشنبیرانی ئەوروپا و ئەمریکا بە ئیمتیازێکی تایبەت بە کۆمەڵگای خۆیانی دادەنێن. گومانی تێدا نییە کە ئیمتیازە، بەڵام پێویست بەو مەیلە خۆپەرست و داخرانە ناکات کە مەبەستیەتی مۆدێرنە قۆرخ بکات و لە بازنەی خودی خۆی و ئیمتیازو ساماندا قەتیس بمێنێتەوە. پاشان مۆدێرنە کورتکرایەوە بۆ ڕەهەندەکانی (تەکنەلۆژیا، کاروباری خەرجی، سەربازی) و لە ڕۆحی شارستانیەت و مرۆڤایەتی بەتاڵکرا. لێرەدا خیانەتی ڕۆژئاوا بۆ ئەو پرانسیپانەی دەردەکەوێت کە شارستانیەت و مۆدێرنەی پێش سێ چوار سەدە پێکهێناوە. ئێستا ڕۆژئاوای خۆپەرست لە کەسێکی زۆر زەنگین دەچێت، چواردەوری بە دراوسێ و خزم و کەسی هەژار گیراوە، هەوڵدەدات دەرگاکانی ماڵەوە سیاج و تەلبەند بکات و دایببڕێت تا نەچنە ژورەوەو پارچەیان بەرنەکەوێت.

ژان کلۆد گیبو دەڵێت: (ئێستا لە ڕۆژئاوادا ئارەزوی مۆنۆپۆڵکردن هەیە و لە چەند فۆرمێکدا دەردەکەوێت. بۆ ڕێگەگرتن لە کۆچی دانیشتوانی وڵاتانی مەغریب و ڕەش پێست و موسوڵمانەکان و ئەو کەسانەی حەزیان پێناکرێت کە لە ڕێگای کۆچەوە بچنە بەهەشتی ئەوروپا، چەند یاسایەکی توندوتیژیان گرتۆتەبەر. هەروەها مۆنۆپۆڵکردنی کاڵا و شمەکە هەرزان بەهاکانی تایلند و مالیزیاو پڵنگەکانی ئاسیا بۆ ئەوروپا، چونکە ئەم کاڵایانە زۆر بە ئاسانی توانای کێبرکێی کارگەو کاڵاکانی ئەوروپایان هەیە و سەرکەوێتیش بەسەریاندا). وەلێ لەدوای (*11*)ی سێبتەمبەر ڕۆژئاوا ترسێکی دی هەیە ئەویش: ترسی تیرۆری ئسوڵییە و نیگەرانە کە بۆ هەمیشە توانای پارێزگاریکردنی شارستانیەتەکەی نەبێت، چونکە وا هەست دەکات قەڵایەکە چواردەوری دوژمن و بەربەرەکانن و بۆ بەرپەچدانەوەی داگیرکەران

و رزگارکردنی ئەم مۆدێرنەیەی ڕۆژئاوا دروستی کردووە کە لە هەندێك لایەنەوە سەرسورهێنەرە، گومانی تێدا نییە پشت بە هێزە بازرگانی و تەکنەلۆژی و سەربازی و هەروەها سوپاو هەواڵگری و کلاوە ئەتۆمیەکان ببەستێت. بەڵام تاکەی دەتوانێت لەسەر ئەم هەڵوێستە هەلپەرست و چاوچنۆکیەی بمێنێتەوە؟ مۆدێرنە چ مانایەکی دەبێ ئەگەر خێر و خۆشی هاوبەشی بۆ سەرجەم کۆمەڵگای مرۆڤایەتی نەبێت؟ ئایا رابەرانی یەکەمی دروستبوونی پرۆژەی رۆشنگەری و مۆدێرنە بەو شێوازە فکرییە هەژارەو دۆگمایانە بیریان دەکردەوە؟ وەڵێ دەزانین (کوندورسیە، سان سیمۆن، ئۆگۆست کۆنت، جان جاك رۆسۆ، ئارنست رینان) لەو رابەرانە بوون کە بە توندی داکۆکیان لە پێودانگی گەردوونی دەکرد و هیچ جیاوازیەکیان لەنێوان مرۆڤەکاندا نەدەکرد و بۆ (رەگەز، ئاین، تایەفە) پۆلێنیان نەدەکردن، تەنانەت رێزیان لە کەرامەتی مرۆڤەکان دەگرت لە هەموو رووەکانەوە، (سپی پێست، رەش پێست، موسولمان، مەسیحی، بوزی...هتد). ئەوانە خەونیان بە ئایندەیەکی پرشنگدارەوە دەدیت بۆ مرۆڤایەتی کە ئەقڵ کاروبارەکان بەڕێوەبەرێت و هەموو جۆرە جیاوازییەکی رەگەزی و تایەفی وەلابنێت. بە دوای ئەماندا گۆتە هات کە پێمان دەڵێ: هەموومان سەر بە رەگەزی مرۆڤایەتین و پێویست بە جیاوازی و دژایەتی ناکات، چونکە سەر بە یەك (ئاین، یەك رەگەز، یەك زمان نین). ئەوەندە بەسە یەك رەگەزی مرۆڤایەتی کۆمان دەکاتەوە. فەیلەسوفەکانی سەرەتا باوەڕیان وابوو سەرجەم کۆمەڵگای مرۆڤایەتی نەك بەتەنها دانیشتوانی ئەوروپا و ئەمریکای باکور،سود لە مۆدێرنەو شارستانی و پێشکەوتن ببینن. کۆندورسیە جارێکیان لە ساڵی *1780* دا دەنوسێت: چۆن راستی بۆ هەمووان یەکە، مافی هەموو مرۆڤێکیشە لەسایەی یەك سیستمدا بژین کە ئەقل، دادپەروەری، مافی مرۆڤ، مافی موڵکیەتی تاك و ئازادی و تەندروستی ...هتد)، دەسەڵاتدار بێت.

بەڵام رۆسۆ ساڵی *1872* دەڵێ: کاتێك بابەتەکە پەیوەندی بە بیرکردنەوەی سروشتی مرۆییەوە هەیە، ئەوا فەیلەسوفی راستی (نە هندییە، نە تەتەرە، نە سویسرییە، نە فەرەنسیە) بەڵکە مرۆڤە، بۆیە هیچ نەژادێك لە نەژادێکی تر، رەگەزێك لە رەگەزێکی تر باشتر نییە و سەرجەم نەژادەکان لەروی سروشتی مرۆڤایەتیەوە هاوتان. تەنانەت مۆنتیسکۆ دەنوسێت و دەڵێ: من مرۆڤم و فەرەنسی نیم تەنها بەرێکەوت نەبێت، ئەگەر لە ئێران لەدایك ببومایە فارسی دەبووم، لە دورگەی عەرەبستان لەدایك ببومایە عەرەب دەبووم، دەرەنجام پێویستە بەئاگابین لە ناکۆکیە شۆڤێنی و رەگەزپەرستیەکان و کەس لەکەس باشتر نییە، تەنها بە دڵسۆزی خزمەتکردنی مرۆڤایەتی نەبێت.

بەڵام ئایا ئێستا رۆژئاوا دڵسۆزە بۆ ئەو دیدگا فراوانەی فەیلەسوفانی رۆشنگەری؟یاخود خیانەتیان کردووەو لایانداوە لەپێناوی خزمەتکردنی بەرژەوەندی نەتەوەیی و تەنانەت توێژێکی بچوك؟ ئەزموونی مێژوو سەلماندویەتی کە لە ساتێکدا خیانەتکراوە. لەبەرئەوە بڵاوبونەوەی ئایدۆلۆژییە فاشی، رەگەزپەرست و چەپی توندڕەومان لە ئەڵمانیا و فەرەنسا و ئیتالیا بینی و لە ئیسپانیاش تا کۆتایی سەردەمی فرانکۆ بەردەوام بوو. لە پورتوگال تا

سەردەمی سالازار، ئەمەش پێش چوونە ناو چەرخی دیموکراتی و گەیشتن بە کەشتی ئەوروپای شارستانی. لە راستیدا مۆدێرنەی رۆژئاوا خاوەنی دوو رووە: رویەکیان (رزگارکەر، مرۆیی، عەقلانیەت)، بەلام لەهەمان کاتدا مەیلی (فراوانخوازی، هەژمونگەری و چەوساندنەوەی بەرامبەرە) ئەگەر پێویست بکات. بەدرێژایی مێژوو هەردوو رووەکە بەدیارکەوتوون.

کاتێك فرۆکەکانی ئەمریکا ڤێتنامیان بۆردومان دەکرد، رۆشنبیران دەرژانە شەقامەکانی پاریس و فرانکفۆرت و زانکۆی کالیفۆرنیا خۆپیشاندانیان دەکرد لەدژی ((جەنگی قێزەوەن)) و ئیدانەکردنی ئیمپریالیزمی ئەمریکی. هەروەها کە سوپای فەرەنسی لە جەزائیردا هەڵدەستا بە چەند کارێکی قێزەوەن ، ژان پۆل سارتەرو دەیان رۆشنبیری فەرەنسی هاوپشتی خۆیان بۆ گەلی جەزائیر و خەباتیان لەپێناوی رزگاریدا دەردەبڕی. ئەمە لەکاتێکدا سارتەر و لیڤی شتراوس و فۆکۆ و چەندانی دی شاکارە گەورەکانیان دەنووسی، سندوقی دراوی نێودەوڵەتی و بانکی نێودەوڵەتی هەژموونیان بەسەر جیهاندا کردبوو. رۆژئاوا باسی ئازاری ویژدانی خۆی دەکات بەرامبەر ئەو جەنگە کۆلۆنیالیانەی دژی گەلانی تر کردویەتی، بەلام هەڵسوکەوتی سیاسی و رەفتاریان پێچەوانەیە وەك ئەوەی هەست بە هیچ ئازارێکی ویژدانی نەکات! بەم شێوەیە وا دەردەکەوێت توێژی سیاسی لەلایەك و توێژی رۆشنبیران لەلایەکی دییە، ئەمەش دوالیزم و دوو روویییە. هەرچۆنێك بێت مۆدێرنەی رۆژئاوا پێویستی بە بەخۆداچوونەوەو رەخنە لەخۆگرتن هەیە، بۆئەوەی کەمتر زۆردارو لووت بەرزبن و زیاتر دادپەروەرو مرۆیی بن. سەبارەت بە رۆشنبیرانی عەرەب و موسولمان پێویستە رەخنە لە ئوسولی و توندرەوی ئاینی بگرین، لەپێناوی گەیشتن بە شیکردنەوەیەکی رزگاربەخش یا رۆشنگەر بۆ کەلتوری عەرەبی - ئیسلامی. ئینجا هەردوولا دەتوانن لە مەیدانی فەلسەفەی رۆشنگەریدا بەیەك بگەن کە گەورەترین سەرمایەی هاوبەشی مرۆڤایەتیە.

**سەرچاوە**

الشرق الأوسط - *2003/2/2*.